ڕۆترین دیوانی حاجییە
کە تا ئێستا لە چاپ دراوە

حاجی قادری کوڕی مەلا ئەحمەد

# دیوانی
# حاجی قادری کۆیی

لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی:
سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا

لە سەر نووسینێکی نوێ بە پێی بۆچوونەکانی
موحەممەدی مەلا کەریم بە پێنووسی:
سەعید کەرەمی



| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | کویی، قادر، ۱۸۱۵ - ۱۸۹۲م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دیوانی حاجی قادری کویی/هونراوەی حاجی قادری؛ لیکولینەوە و لیکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا ؛ |
| مشخصات نشر | : | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۹۰. |
| مشخصات ظاهری | : | ۲۹۶ ص. |
| شابک | : | 978-964-980-089-9 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| موضوع | : | شعرکردی -- عراق -- قرن ۱۹م. |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶/س۷۴۳ک۹ ۱۳۸۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۲۴۰۹۳۰۱ |

## حاجی قادری کوڕی مەلا ئەحمەد

# دیوانی
# حاجی قادری کۆیی


لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی:
**سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا**

لەسەر نووسینێکی نوێ بە پێی بۆچوونەکانی موحەممەدی مەلا کەریم بە پێنووسی:
**سەعید کەرەمی**





انتشارات کردستان

سنە



انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنە - پاساژی عیززەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

## دیوانی حاجی قادری کۆیی



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی حاجی قادری کۆیی |
| ✓ هۆنراوەی (سرودەی): | حاجی قادری کۆیی |
| ✓ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی (شرح و تحقیق): | سەردار حەمید میران و کریم موستەفا شارەزا |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۹۰ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۴۰۰۰ دانە (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحە و قطع): | ۲۹۶ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

شابک: ۹-۰۸۹-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸

ISBN: 978 - 964 - 980 - 089 - 9



نرخی بە بەرگی نەرم (شومیز) ۴۸۰۰ تمەنە

نرخی بە بەرگی سەخت (مجلد) ۵۸۰۰ تمەنە

# ناوەرۆك

## به نێوی خودا

### وتەی چاپی نوێ

حاجی قادر وەك شاعیرێكی سەدەی نۆزدە توانیویە:

-بە زمانێك بپەیڤێ كە جیاواز بێت لە زمانی شاعیرانی‌تر.

-بیرێك بهێنێتە ئاراوە كە كەس پێش خۆی بەو شێوە نەیورووژاندووە.

-لە خەوی شەمع و پەروانە و مەستیی مەی و مەیخانە ڕاپەڕێ.

-زامەكانی نەتەوەكەی بە زەقی بخاتە بەرچاو و نوشتەیان بۆ بنوێنێ.

-بەرەو دیمەنێ دەلاقەی شیعری ئاوەڵا بكات كە كەس تا ئەوكاتە پێیدا نەیڕوانیوە.

بەم بۆنەوە حاجی قادر بە شاعیرێكی ڕۆشنبیر و ڕچە شكێن و خاوەنی قوتابخانەیەكی نوێ دەناسرێ؛ ئیتر هەرچی خۆمان بە ساغكردنەوە و لێكۆڵینەوەی دیوانەكەیەوە زیاتر ماندوو بكەین هەر كەمە.

كاك سەردار حەمید میران و كاك مستەفا شارەزا، بە پیاچوونەوەی مامۆستا مەسعوود موحەممەد، لێكۆلێنەوەیەكیان لەسەر دیوانی حاجی قادر كردبوو و بە سەرپەرشتی مامۆستا موحەممەدی مەلاكەریم لە ساڵی (١٩٨٦ ز) بە چاپیان گەیاندبوو. مامۆستا موحەممەد ئەڵێ: گەیشتمە ئەوەی كە پێویستە هەندێ وشەی تێكستەكەی ئەوان بە گوێرەی یەكێ یان زیاتر لە تێكستەكانی لای خۆم بگۆڕم و گەلێ بەیت و پارچە شیعری تازە بخەمە سەر دیوانەكە. پاشان ئەڵێ: لە دەرفەتێ‌تردا بۆچوون و بەڵگەی دەستێوەردانەكانم ڕوون دەكەمەوە[1].

---

١. بڕوانە دیوانی حاجی قادری كۆیی، بە لێكۆڵینەوەی كاك سەردار و كاك كەریم شارەزا، لاپەڕەی ٢٩٢.

مامۆستا موحەممەد پاش ئەو چاپەی کە ناومان برد لە کتێبێکی جیاوازدا بە نێوی «هەنگاوێکی تر بە رێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی» تەواوی بۆچوون و پێشنیارەکانی خۆی بە بەڵگەوە لە چاپ داوە.

منیش بەش بە حاڵی خۆم هاتووم بۆ ئەوەی پرۆژەکەی مامۆستا موحەممەدم تەواوکردبێ ئەو دەسکاری وبۆچوونە تازانەیە کە لەم کتێبەی دواییدا نووسیبوونی لەسەر دیوانەکە زیاد کردووە و بە کورتی ئەم گۆڕانکارییانەی خوارەوەم لەسەر دیوانەکە ئەنجام داوە:

١. لێ زیادکردنی بۆچوون و دەسکارییە تازەکانی مامۆستا موحەممەدی مەلاکەریم ـکە لەم دیوانەدا بە نێوی خۆیەوە تۆمار کراوە و ئاماژەی دراوە ـ لە نێوان کەوانی گۆشەدار ( [] )دا.

٢. لێکدانەوەی مانای هەندێ وشە و دەستەواژە لە نێوان کەوانی گۆشەدار ( [] )دا و دەربرینی بۆچوونی خۆم لە چەند شوێندا.

٣. گۆڕینی ڕینووسی کۆن و هێنانە سەر ڕێنووسی نوێ، ئەویش بە گۆڕینی ئەو پیتانەی کە لە زمان و ڕێنووسی عەرەبیدان و لە زمان و ڕێنووسی کوردیدا نین (ذ، ض، ظ = ز. ث، ص = س. ط = ت).

لە کۆتاییدا، هیوادارم توانیبێتم گۆشەیەك لە مانا و مەبەستی شیعرەکانی ئەم شاعیرە مەزنەمانم خستبێتە ڕوو و تارام لەسەر بووکی ڕازاوەی بەیتەکانی هەڵدابێتەوە.

**سەعیدی کەرەمی ـ سنە**

**٢٧ی خەزەڵوەری ١٣٨٩ی کۆچی هەتاوی.**

## سەرچاوەکان:

١. هەنگاوێکی‌تر بە ڕێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی، موحەممەدی مەلاکەریم، «دار الحرية»، عێراق ١٩٨٩ز، چاپی یەکەم.

٢. هەنبانە بۆرینە، هەژار، سرووش ـ تاران ١٣٨١ ك، ه، چاپی سێهەم.

٣. فەرهەنگی موعین، موحەممەد موعین، ئادنا ـ تاران ١٣٨١ چاپی یەکەم.

٤. الأعلام، خيرالدين الزركلي (١٣٩٦ ه)، دار العلم للملايين ٢٠٠٢، الطبعة الخامس عشرة.

٥. دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ١٣٨٠ ك، ه، بڵاوکردنەوەی کوردستان، سنە، چاپی سێهەم.

## ئەم دیوانەی حاجی قادر

لای هەموو شیعرناسێکی حاجی قادری کۆیی، ڕوون و ئاشکرایە کە وا ئەم شاعیرە مەزنەمان، بەشێکی زۆری لە ژیانی منداڵی و فەقێیەتی و مەلایەتی، لە شاری کۆیە و کوردستانی عێراق و ئێران بردۆتە سەر و ماوەیەکی زۆریش لە شاری ئەستەنبووڵی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانلیدا ژیاوە.

شیعرەکانی حاجی لەکۆیە لە لای شیعردۆستەکانی و لە ناو فەقێ و مەلایانیش لە مەدرەسە ئایینییەکانی کوردستاندا تۆمار کراون و بەناو خەڵکدا بڵاو بوونەتەوە و لە ئەستەنبووڵیش بێ ژن و ماڵ و بێ کوڕ و کەس و کار ماوەتەوە، سەردەمێك لەگەڵ ڕۆڵەکانی بنەماڵەی بەدرخان پاشاو، سەردەمێکیش لەکونجێکی حوجرەیەکی تەنگ و تاریکدا ژیاوە.

هەر شیعرێکی لەوێ دانابێ، بە هۆی یەکێ لە دۆست و یارانی بۆکوردستانی ناردۆتەوە و خەڵکەکە لە ڕووی وەفادارییەوە لە ڕێگەی چێژ وەرگرتن لە ناوەرۆکی شیعرەکانییەوە، نووسیویانەتەوە و گەلێ جاریش ئەزبەریان کردووە.

لە ساڵی ١٨٩٨ دا، لە ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەی کوردستاندا کە لە لایەن «میقداد مەدحەت بەدرخان»ەوە، چەند ژمارەیەکی لە شاری قاهیرە دەرچووە و لە لاپەڕەی (٣)ی ئەو ژمارەیەدا، هەواڵی کۆچی دوایی حاجی نووسیوە و دەڵێ: «لە ساڵی ڕابوردوودا، واتا لە ١٨٩٧دا، حاجی مردووە» لە لاپەڕەی (٤)ی هەمان ژمارەشدا هەڵبەستێکی بە ناونیشانی (زەمانە) بڵاو کردۆتەوە، ئەمە یەکەمین و ڕاسترین دەقی چاپ کراوی شیعری حاجییە و ئێمە ڕاستەوخۆ ئەو بڕە شیعرەیمان ـ دوای گۆڕینی بۆ سەر ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی ـ لەو سەرچاوەوە وەرگرت.

لە ساڵی ١٩١٣دا، لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری «ڕۆژی کورد»دا کە لەم دواییەدا کاك جەمال خەزنەدار ئەرکی بڵاوکردنەوە و پێشەکی و لەسەر نووسینی کێشاوە، پێنج هەڵبەستی حاجی بڵاوکراوەتەوە و ئێمەش بۆ ساغ کردنەوەی دەقی شیعرەکانی ئەو هەڵبەستانەی سوودمان لێ وەرگرتن.

لە کتێبی «تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا»ی دوکتۆر کەمال مەزهەردا، لە لاپەڕە (١٨٦)ەوە تاکوو لاپەڕەی (١٩٨) شەش هەڵبەست و پارچە هەڵبەستی حاجی بڵاوکراونەتەوە. ئەمانەش بوون بە سەرچاوەیەکی باش بۆ پرۆژەی تۆژینەوەی ئەم دیوانە.

لە ساڵی ١٩٢٥دا، خوالێخۆشبوو «عەبدوڕڕەحمان سەعید»، «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی» بڵاوکردەوە، هەرچەندە بە ڕێنووسی کۆن چاپ کراوە و هەڵەی چاپ و هونەری شیعری زۆرە، بەڵام وەك سەرچاوەیەکی شیعرەکانی حاجی سوودێکی زۆرمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٤١دا، مامۆستای خوالێخۆشبوو «ڕەفیق حیلمی» سەرگوزەشتە و هەندێ لە شیعرەکانی حاجی بە شیکردنەوەوە لە بەرگی یەکەمی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی»دا بڵاو کردەوە و (٢٠) لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە و ئێمەش تا ڕادەیەك سوودمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٥٣دا، مامۆستا عەلائەددین سەجادی چاپی یەکەمی «مێژووی ئەدەبی کوردی» بڵاو کردووە و لە ساڵی ١٩٧١یشدا چاپی دووەمی ئەو کتێبەی پەخش کردەوە. [هەروەها] هەندێ زانیاری لە بارەی شاعیرەوە خستۆتە پاڵ زانیارییەکانی چاپی یەکەم و بۆ باسی ژیان و شاعیریەتی حاجی تا ڕادەیەك سوودمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٥٣دا مامۆستای خوالێخۆشبوو «گیوی موکریانی» چاپی دووەمی «دیوانی حاجی قادری کۆیی» چاپ و بڵاو کردەوە، دیاریشە «کۆمەڵە شیعری حاجی قادر»ی «عەبدوڕڕەحمان سەعید»ی بە چاپی یەکەم داناوە، لە ساڵی ١٩٦٩شدا چاپی سێهەمی ئەو دیوانەی هەر لە هەولێر چاپ کردەوە، ئەم سەرچاوە بە نرخە، هەرچەندە هەندێ هەڵەی چاپ و هەڵەی هونەری شیعری تێ کەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ساغ کردنەوەی شیعرەکانی حاجی سوودێکی یەگجار زۆرمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٦٠دا مامۆستا موحەممەدی مەلاکەریم لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بە ناونیشانی «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد» چاپ و بڵاوکردەوە، بۆ نووسینی پێشەکی ئەم دیوانە سوودمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٦١دا کەریم شارەزا لە کتێبی «کۆیە و شاعیرانی»دا حەوت لاپەڕەی بۆ ژیان و شیعر و شاعیریەتی حاجی تەرخان کردووە و لە بارەی ژیانی شاعیرەوە سوودمان لێ وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٦٦دا دوکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ نامەی دوکتۆرای خۆی بە زمانی عەرەبی و بە ناونیشانی «الواقعية في الأدب الكردي» لە بەیرووت چاپ کرد. لەو لێکۆڵینەوە زانستییەیدا شەش لاپەڕەی بۆ شیعرەکانی حاجی تەرخان کردووە و ئێمەش سوودمان لە بیر و ڕاکانی لە بارەی شیعر و شاعیریەتی حاجی قادرەوە وەرگرت.

هەر لە هەمان ساڵدا دوکتۆر ئیحسان فوئاد پوختەی نامەکەی دوکتۆرای بە زمانی ڕووسی لە مۆسکۆ چاپ کرد و ئێمەش سوودمان لە هەندێ لایەنی شاعیریەتی حاجی وەرگرت، دوای ئەوەی کە خۆی پوختەی ڕایەکانی بۆ کردین بە کوردی.

دوکتۆر کەمال فوئادیش لە پێشەکی کتێبەکەی «دەسنووسی کوردی»دا، کە لە ساڵی ١٩٧٠ بە زمانی ئەڵمانی لە شاری «فیزبادن»ی چاپ کردووە، چەند لاپەڕەیەکی بۆ حاجی قادر و شیعر و شاعیریەتی تەرخان کردووە، ئێمەش بە هۆی کاك سەردار حەمید میرانەوە بۆمان کرا بە کوردی و تا ڕادەیەك سوودمان لە بیر و ڕایەکانی وەرگرت.

لە ساڵی ١٩٤١ و ١٩٧٤ و ١٩٧٦ مامۆستا مەسعوود موحەممەد سێ بەشی کتێبەکەی «حاجی قادری کۆیی» چاپ کرد و بە ١١٧٥ لاپەڕەی گەورە، لە ژیان و شیعر و شاعیریەتی حاجی کۆڵیوەتەوە و جگە لە ساغ کردنەوەی گەلێ لایەنی شاردراوەی ژیانی، پتر لە دووسەد شیعریشی ساغ کردۆتەوە.

بۆ لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی ئەم دیوانە و ساغ کردنەوەی دەقی شیعرەکانی سوودێکی یەکجار زۆرمان لێ وەرگرتن.

جگە لەم سەرچاوانە سوودمان لە هەندێ گۆڤاری ئەدەبی و ڕۆشنبیری کوردی وەکوو: هاوار، گەلاوێژ، هەتاو و هیوا، بڵێسە، نووسەری کورد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەیان،

ڕۆشنبیری نوێ، ڕۆژی كوردستان، گۆڤاری كۆلیجی ئەدەبیات، پەروەدە و زانست، نووسەری نوێ و كاروان، وەرگرتووە.

## دەستنووسێكی گرانبەها

جگە لەو سەرچاوە چاپ كراوانەی باسمان كردن، توانیمان دەستنووسێكی بە نرخ و گرانبەهای «دیوانی حاجی قادری كۆیی» كە لەلایەن خوالێخۆشبوو «مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغای حەوێزی»یەوە نووسراوەتەوە، بە هۆی كاك سەیفەددینی كوڕی و مامۆستا ئەمیر عەبدولكەریمی حەوێزی خوارزایەوە، چنگ بكەوێ.

ئەم دەستنووسە وەك خوالێخۆشبوو مەلا ڕەئووف لە پێشەكییەكەیدا نووسیویەتی، دەبێ لە ساڵی (١٩١٨)وە، دەستی بە نووسینەوەی كردبێ و لە ماوەی چەند ساڵێكدا هەموو ئەو شیعرانەی كە لە ناو خەڵكدا پەرت و بڵاو بوون كۆی كردوونەتەوە و لە دوای ئەمەش دەڵێ: «جگە لە وانە، لە ناو دەلاقەی خانووی باپیرم واتە: ئەمین ئاغای ئەختەر، بەیازێكم دۆزییەوە كە هەمووی شیعری حاجی قادر بوون، ئەمانەشم خستە پاڵ شیعرە كۆكراوەكانی دیكەی و بوون بەم دیوانە دەستنووسە. لەسەر داوای سەعید فەهیمی برام لە ساڵی ١٩٢٣دا بەشێكم دا بە عەبدوڕڕەحمان سەعید و ئەویش لەسەر ئەركی خۆی لە ساڵی ١٩٢٥دا چاپی كرد و لە دواییشدا موحەممەد تۆفیق وردی و ساڵح شەمس كۆمەڵە شیعرێكی بڵاونەكراوەیان لەسەر نووسییەوە و دایان بە خوالێخۆشبوو گیوی موكریانی و ئەویش خستیە پاڵ شیعرەكانی دیكەی حاجی و لە ساڵی ١٩٥٣دا لە چاپی دووەمی دیوانەكەیدا بڵاوی كردنەوە».

ئێمە سوودێكی یەكجار زۆرمان لەم دەستنووسە بە نرخە وەرگرت ـكە سەرجەمی لاپەڕەكانی دەگاتە ٢٣٧ لاپەڕەی دەفتەری ئاسایی ـ چونكە زۆربەی ئەو شیعرانەی بە هەڵە لە سەرچاوە چاپكراوەكاندا دێنە بەرچاو دەبینین لەم سەرچاوەیەدا بە ڕاستی نووسراون، نەك هەر هەندە، بەڵكوو چەند هەڵبەست و تاكە شیعری تێدایە كە لە هیچ سەرچاوەیەكی دیكەدا نەهاتوون و ئێمە ئەم شیعرە بڵاونەكراوانەمان خستنە پاڵ ئەم دیوانەی حاجی قادر.

جگە لەم دەستنووسەی مەلا ڕەئووف، لە كۆیەوە دەستنووسێكی بچووكمان لە مامۆستای خانەنشین «عەبدولمەجید نوورەددین جەلیزادە» پێ گەیشت ـلەم دەستنووسەدا چاومان

بەڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی شیعرەکانی حاجی کەوت ـ، کە لە کاتی خۆیدا قوتابی قوتابخانە سەرەتاییەکەی کۆیە بووە و شێخ نوورەددینی باوکی، مامۆستایان بووە و دوا بە دوای دەرچوونی «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی» لەلایەن عەبدورڕەحمان سەعیدەوە، لەساڵی ١٩٢٥دا، شیعرەکانی حاجی قادری بە قوتابییەکانی لەبەر کردووە و هەڵەی چاپ و هونەری شیعری بۆ ڕاستکردوونەتەوە. مامۆستا عەبدولمەجیدیش بە شێوە ڕاستەکەی شیعرەکانی لەبەر کردوون و ئێستا لە دەستنووسێکی خنجیلانەدا تۆماری کردوون و ئێمەش سوودمان لەم دەستنووسەش وەرگرت.

خوێندەواری بەڕێز! هەر چۆنێك بێ وا ئەم دیوانەی حاجی قادری کۆییمان لە سەر ڕوولێنانی «ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لێژنەی یاریدەدانی چاپ و بڵاوکردنەوە» ئامادە کرد بۆ لە چاپدان و هەوڵێکی زۆرمان دا، کەم هەڵە و ڕێکوپێك دەربچێ، چونکە ئێمە لەو باوەڕەداین، هیچ کارێکی ئەدەبی و هونەری و ڕۆشنبیری هەرچەندە خۆی پێوە ماندوو بکرێ، هەر لە هەڵەو ناتەواوی بە دوور نابێ.

لە کۆتاییدا ڕووی داواکاری و تکامان لە خوێندەواران و شیعردۆستان دەکەین، کە هەر هەڵە و ناتەواوییەک لەم دیوانەدا هەست پێ دەکەن، با لە ڕووی دڵسۆزی و خزمەتگوزارییانەوە بۆ زمان و ئەدەبی کوردی، ئاگادارمان بکەنەوە و هەڵەکانمان بۆ دەستنیشان بکەن تاکوو لە دوارۆژێکی نزیکدا لە چاپی نوێی ئەم دیوانەدا ڕاستیان بکەینەوە.

لەوانەشە هەندێ ئەدەبدۆست بپرسن و بڵێن بۆ هەندێ هەڵبەستی دیکە کە لە ناو دیوانەکانی پێشوودا، چاپ کرابوون و دەکەوتنە بەرچاو لەم دیوانە نوێیەدا بەرچاو ناکەون؟!

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتی ئێمە و دڵنیاییمان لەوەی کە ئەو هەڵبەستانەی لابراون هی حاجی قادر نین و بە هەڵە لە کاتی خۆیدا خراونەتە پاڵی، بۆیە لەم دیوانەدا فڕێمان دانە دەرەوە.

## پێشەکی

ئێمە نامانەوێ لێرەدا بە وردی و دوور و درێژی بکەوینە بنج و بناوانی باسی ژیانی حاجی و لێکۆڵینەوەیەکی گوشاد لەسەر شیعر و شاعیریەتی بنووسین و هەموو لایەنێکی ژیانی تایبەتی شاعیرمان شی بکەینەوە، چونکە دەستەیەك لە ڕەخنەگر و لێکۆڵەری ئەدەبی کوردی بە دوور و درێژی لەو لایەنانەوە دواون و ئێمەش پتر مەبەستمان ساغ کردنەوەی دیوانی شیعرەکانییەتی، نەك بەدواداچوونی ژیانی تایبەتی و ئاشکراکردنی هەموو لایەنە شاردراوەکانی. بۆیە لێرەدا بە کورتی باسی ژیانی تایبەتی حاجی و شاعیرییەت و شیعرەکانی دەکەین.

## حاجی قادر کێیە؟

بەپێی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی و ساغ کردنەوەی هەندێ لایەنی بوون و ژیانی حاجی قادری کۆیی گەیشتووینەتە ئەم ڕاستیانەی خوارەوە:

ناوی تەواوی شاعیری نەتەوەییمان: «حاجی قادری کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە»[1] یە و دایکی ناوی فاتێ (فاتم) بووە هەر وەکوو خۆی لە دێڕە شیعرێکیدا ئەم ڕاستییە بە دیار دەخات و دەڵێ:

**باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ،**
**خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ**[2]

---

١. بڕوانە نامیلکەی مەلا عەبدوڕڕەحمان لاپەڕەکانی (٣٢٩ - ٣٣٥)ی بەشی دووەمی «حاجی قادری کۆیی» نووسینی مەسعوود موحەممەد ـ بەغدا١٩٧٤.

٢. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی» بەغدا ١٩٢٥، ل: ٤.

## حاجی قادر، کەی و لە کوێ هاتۆتە دنیاوە؟

ساڵ و جێگەی لە دایك بوونی حاجی قادر مایەی هێنان و بردنێکی زۆرە، لە هەندێ سەرچاوەی وەکوو نامیلکەی «مەلا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە»دا هاتووە کە وا حاجی لە گوندی «گۆرقەرەج»ی[1] سەر بە شاری کۆیە لە ساڵی ١٢٣١ی[2] کۆچی [م]دا هاتۆتە دنیاوە، ئەم ساڵە کۆچییەش بەرانبەر بە ساڵانی (١٨١٥ ـ ١٨١٦ز) دەوەستێ.[3]

کە لە سەرچاوەی دیکەشدا بە دوای ساڵ و شوێنی لە دایك بوونیدا دەگەڕێین دەبینین لای ئەوان ساڵی ١٢٣٢ی کۆچی [م] بە ساڵی لە دایك بوونی دادەنێن[4] و ئەم ساڵەش ـ بە پێی هەمان خشتەی گۆڕینی ساڵەکانی کۆچی بۆ زایینی ـ دەبینین بەرانبەر بە ساڵانی (١٨١٦ ـ ١٨١٧)ی زایینی دەوەستێ.[5]

لە هەندێ سەرچاوەی ڕەخنەی ئەدەبی کوردیشدا ئەمە هاتووە کە حاجی قادر لە ساڵی ١٨١٥دا لە گوندی «گۆرقەرەج»[6] و هەندێکیش دەڵێن لە ١٢٣٢ لە هەمان گوند هاتۆتە دنیاوە.[7] هەندێ نووسەری دیکەش دەڵێن: حاجی لە ساڵی ١٨١٥لە کۆیە لە دایك بووە[8] و لە جێی خۆیدا لە گۆرقەرەجەوە هاتوونەتە ئەو شارە. بەڵام لەم دواییەدا زۆربەی لێکۆڵەرانی کوردی

---

١. گۆرقەرەج: گوندێکی وێرانەیە کەوتۆتە خوارووی شاری کۆیەوە.
٢. نامیلکەی مەلا عەبدوڕڕەحمان «حاجی قادری کۆیی» نووسینی مەسعوود موحەممەد، ب: ٢، بەغدا. ١٩٧٤، ل: ٣٢٩.
٣. یوسف ابگاروفیچ اوربلی «جداول لتحویل السنوات الهجریة الی السنوات المیلادیة» ترجمە، د. حسین قاسم العزیز «مجلة المورد» المجلد ٣، العدد ٤، بغداد ١٩٧٤، ص ١٣١.
٤. «گۆڤاری هاوار» ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٣٢ شام، ل: ٧.
٥. اوربلی، جداول... مجلة المورد، المجلد ٣ العدد ٤ بغداد ١٩٧٤، ص ١٣١.
٦. عەلائەددین سەجادی «مێژووی ئەدەبی کوردی» چ ١ بەغدا ١٩٥٢، ل: ٣١٠.
٧. ڕەفیق حیلمی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی» ب ١ بەغدا ١٩٤١، ل: ٩٩.
٨. کەریم شارەزا «کۆیە و شاعیرانی»، بەغدا ١٩٦١، ل: ٢٠.

دەڵێن لەساڵی ١٢٣٢ك [م] = ١٨١٧ی زایینیدا لە دایك بووە و هەندێکیش لە پاڵ ئەو ساڵەدا دەنووسن لە نزیك کوێسنجاق ـ بە بێ ناو هێنانی شوێنەکە ـ لە دایك بووە.[1]

هەندێ لێکۆڵەری دیکەشمان بە مەزەندە و بە پێی تەمەنی هاونشینەکانی دەڵێن: ئیحتیماله لە ساڵی ١٢٤٠ی کۆچی [م]دا لە دایك بووبێ[2] و ئەم ساڵەش بەرانبەر ساڵانی ١٨٢٤ ـ ١٨٢٥ی زایینی دەوەستێ.[3]

بەو مەزەندەیەی کە حاجی قادر لەگەڵ حاجی مەلا «عەبدوڵڵا»ی جەلیزادەدا پێکەوە بۆ گەشتی خوێندن چوون بۆ «باڵەکەتی» و حاجی مەلا «عەبدوڵڵا»ش مەعلوومە کە لە ساڵی ١٢٥٠ی کۆچی [م]دا لە دایك بووە[4] و ئەم ساڵەش بە پێی خشتەی گۆڕینی ساڵەکان بەرانبەر بە (١٨٣٤ ـ ١٨٣٥ز) دەوەستێ و لە بەرئەوەی هەردووکیان هاوڕێی خوێندن بوون، نابێ جیاوازییەکی وا زۆر لە نێوان تەمەنیاندا بێ؛ یەکێکیان لە نێوانی ساڵەکانی (١٨١٥ تاکوو ١٨١٧ز) لە دایك بووبێ و ئەوی دیکەیان لە نێوانی (١٨٣٤ ـ ١٨٣٥)دا لە دایك بووبێ، کە نزیکەی هەژدە ـ نوزدە ساڵیان بەینە و ئەم تەمەن لێك دوورییەش نایان کات بە هاوڕێی کاروانی خوێندنی فەقێیەتیان بۆ ناوچەی «باڵەکەتی»، کە بە یەکەوە ئەو گەشتەیان کردووە، هەروەك حاجی لە دوادوای ژیانیدا لە ئەستەنبووڵەوە نامەیەکی شیعری بۆ حاجی مەلا «عەبدوڵڵا»ی هاوڕێی خوێندنی نووسیوە و گوتوویەتی:

**بە فیکرت دێ زەمانێ چوینە باڵەك        بە پێ‌خاوسی، نە کەوشم بوو نە کاڵەك!**[5]

ناوەرۆکی ئەم دێڕە شیعرەی حاجی و هاوڕێیەتی گەشتی خوێندنی لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵڵادا، ڕای ئەو لێکۆڵەرانە بەهێز دەکات کە دەڵێن: لەوانەیە حاجی قادر لە ١٢٤٠ی

---

١. د. کەمال فوئاد «دەستنووسی کوردی»، فیزبادن ئەڵمانیا، ١٩٧٠ پێشەکی.
٢. مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب١ بەغدا ١٩٧٣، ل: ١٦٤.
٣. اوربلی «جداول لتحویل السنوات الهجریة الی السنوات المیلادیة»، «مجلة المورد»، المجلد ٣، العدد ٤، بغداد ١٩٧٤، ص ١٣١.
٤. مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب١ بەغدا ١٩٧٣، ل: ١٠١.
٥. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ل: ١٨٥.

کۆچی [م]دا لە دایك بووبێ، چونکە بەمە تەمەنی لەگەڵ حاجی مەلا «عبداللە»ی هاوڕێیدا نۆ ساڵ دە ساڵیان بەین دەبێ. ئەم نزیك بوونەوەیەش لە تەمەندا پتر هاوڕێیەتی گەشتی خوێندنیان بەهێز دەکات، لە چاو جیاوازییەکی هەژدە نۆزدە ساڵیدا.

## حاجی قادر و خوێندنی مەلایەتی:

حاجی قادر هەر منداڵ دەبێ کە باوکی دەمرێ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستییەش بڵێین کە حاجی تەمەنێکی منداڵیی وای بووە کە باوکی نەماوە، ناوی لە بیر بمێنێ، هەروەك لە دێڕە شیعرەکەی پێشوویدا گوتوویەتی:

باوکم ئەحمەدبوو ناوی فیکرم دێ          خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ

کە تەمەنی بووە بە حەوت ساڵ دایکی لە مزگەوتی موفتی لە کۆیە لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگونبەتی لەبەر خوێندنی داناوە[1]، ئەو مەلا ئەحمەدە خاڵۆزای حاجی بووە. پاشی دوو ساڵ دایکیشی دەمرێ و ئیتر مەلا ئەحمەد هەموو مەسرەفێکی خوێندنی دەکێشێ.[2]

حاجی کە سەرەتای خوێندنی فەقێیەتی لە کۆیە فێر بووە، لە هاوینی ساڵی ١٢٧٠ی کۆچی [م] بەرانبەر بە ساڵانی (١٨٥٣ ـ ١٨٥٤ز)دا لەگەڵ حاجی مەلا «عبداللە»ی جەلیزادەدا گەشتێکی خوێندن بۆ ناوچەی «باڵەکەتی» دەکات و لە گوندی «شێخ وەتمان» لە لای «مەلا موحەممەد کاك عبداللە» دەخوێنن و پاش ماوەیەك حاجی قادر لە حاجی مەلا «عبداللە»ی هاوڕێی دادەبڕێ و بە تەنهایی دەچێت بۆ کوردستانی ئێران بۆ شارەکانی سەردەشت و سابڵاغ و شنۆ.[3]

حاجی تاکوو ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی [م] بەرانبەر بە (١٨٦٢ ـ ١٨٦٣) هەر لە کوردستانی ئێران ماوەتەوە و لەو ساڵەدا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و بە دەشتی لاجان و بە ڕێی

---

١. عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ١ بەغدا ١٩٧١، ل: ٣٤٢.
٢. نامیلکەی مەلا عەبدوڕڕەحمان، بنوارە: مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب٢ بەغدا، ١٩٧٤، ل: ٣٢٩.
٣. کەریم شارەزا «کۆیە و شاعیرانی»، بەغدا ١٩٦١، ل: ٢٠.

باڵەکەتیدا ـنەك بە ڕێگای سولەیمانیدا وەك لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە ـگەڕاوەتەوە دیوی کوردستانی عێراق و هاتۆتەوە کۆیە[1] و ماوەیەکی خۆش لەگەڵ حاجی مەلا «عبدالله»ی دۆستی و «ئەمین ئاغای ئەختەر»ی شاعیر و «حەماغا»دا لە کۆیە بە سەردەبات.[2]

پاش ماوەیەك کە حاجی سەرنج دەدات ـدوای ئەو هەموو خەمخۆرییەی بۆ خەڵکەکەی کۆیە ـدەبینێ هەمووی هەر ڕوویان لە هەندێ شێخی وەکوو «شێخ نەبی ماویلی»یەو بەرانبەر بە شاعیر و خەمخۆری وەکوو خۆی کەمتەرخەمن و ئەم کەمتەرخەمییەش لە ڕووی سۆزی شاعیرانەیەوە بە بێ حورمەتی دادەنێ و بۆیە بڕیار دەدات کۆیە جێبێڵێ و ڕوو بکاتە شاری «ئەستەنبوڵ»ی پایتەختی سەڵتەنەت و خەلیفایەتی عوسمانلی. حاجی کە دەکەوێتە ئەو وڵاتی غوربەتەش لە چەند دێڕە شیعرێکی پڕ سۆزیدا ئەو هەستەی خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

**لە غوربەت بە شاهی لەبیر ناکرێ     زەمانی جوانی و یادی وڵات**
**لە «قوشخانە»وە تا دەمی «ئیچ‌قەڵا»     لە «بایزاغە»وە تا مەحەللەی «قەڵات»[3]**
**هەموو خزمی خۆمن دەزانم دەڵێن     لە بێ‌حورمەتیمان بوو «حاجی» هەڵات[4]**

## ژیانی حاجی لە ئەستەنبووڵ:

حاجی شاری کۆیەی بچووکی جێهێشت و ڕووی کردە شارێکی گەورەی بەهات‌وباتی وەکوو «ئەستەنبوڵ».

«شاری ئەستەنبووڵی ئەو ڕۆژەش کە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانلی بووە، نوختەی لەیەکدان و بە یەکگەیشتنی ڕۆژئاوای پێشکەوتووی سەرمایەدار و ڕۆژهەڵاتی دواکەوتووی دیلی کۆت و زنجیری دەرەبەگی و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و فرۆفێڵی ئایین‌فرۆشان بوو، ئەو ئایین‌فرۆشانەی کە ئایینیان کردبوو بە دەسمایەی دەستیان و بۆ ئامانجی ستەمکاری

---

١. بیروڕای مامۆستا مەسعوود موحەممەد لە پێداچوونەوەی ئەم دیوانەدا.
٢. نامیلکەی مەلا عەبدوڕڕەحمان «حاجی قادری کۆیی»، ب ٢ بەغدا ١٩٧٤، ل: ٣٣٠.
٣. قوشخانە، ئیچ‌قەڵا، بایزاغە، قەڵات: چوار شوێن و گەڕەکی شاری کۆیەن.
٤. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ل: ٣٥.

خۆیان ئاڵ و وێڵیان پێ دەکرد».[١]

حاجی لەو شارە گەورە پێشکەوتووەدا ماوەیەکی دوور و درێژ ژیا، [لە وێدا] بە بنەماڵەی «بەدرخانییەکان» گەیشت و بوو بە مامۆستای تایبەتی کوڕەکانی ئەو خانەوادەیە، لەلای ئەوان دیباچەی «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی خوێندەوە، لەو دیباچەیە و لە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبی ڕۆشنبیری تازەبابەت کە پەیتا پەیتا لە ئەورووپای پێشکەوتووەوە دەهاتن بۆ ئەستەنبووڵ و دەکران بە تورکی و بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبوونەوە بیر و هەستی نەتەوەیی لە[ناخیدا] سەری هەڵدا.

پوختەی مەبەستمان ئەوەیە بڵێین: حاجی قادر لە بەر تەوژمی ڕۆشنبیری ئەورووپادا کوردایەتی لە مێشکیدا گەڕا و لە هەمان کاتیشدا دۆستایەتی لەگەڵ بەدرخانییەکاندا بێ گومان هاندەرێك بووە بۆ سەرهەڵدان و مەیینی ئەو کوردایەتییەی.

هەرچەندە حاجی لە ژیانی ئەستەنبووڵی ڕازی نەبووە و هەوەسی بە چارەی عوسمانلییەکان نەهاتووە، بەڵام وەك گوتمان ئەو ژینە نوێیەی لەو شارەدا گۆڕانێکی سەرەکی بە سەر بیر و باوەڕی حاجی هێناوە؛ چونکە جگە لەوەی کەوتبووە بەر تەوژمی ڕووناکبیرانی ئەورووپای پێشکەوتوو لە هەمان کاتیشدا «شاری ئەستەنبووڵی ئەو ڕۆژە جێگای کۆبوونەوەی هەموو ئازادی خوازەکانی وڵاتانی عوسمانی بوو لە کورد و عەرەب و ئەرمەن و نەتەوەکانی ئەورووپای خوارووی ڕۆژهەڵات کە لەو سەردەمەدا لە تێکۆشان بوون بۆ ئازادی یا خۆیان لە دەستی عوسمانییەکان ڕزگار کردبوو».[٢]

حاجی لەو کاتەی ئاگاداری تێکۆشانی ئەو نەتەوانەی ژێر چنگی دەوڵەتی عوسمانلی بوو [کە] ئاوڕێکی لە میللەتەکەی خۆی دەدایەوە، دەیبینی نەك بەرەو ڕزگاری [نە]دەچوو بەڵکوو ئەو میر نشینییانەی کە هەشی بوون، لە ناوچووبوون وەك:

حکوومەتی میرەکانی «بابان» و «سۆران» و «بادینان» و ئەمارەتەکانی کوردستانی سەروو

---

١. موحەممەدی مەلا کەریم «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد»، بەغدا، ١٩٦٠، ل: ١٠.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ١٠.

بەتەواوی ناوچەکانیان خرابوونە سەر دەوڵەتی عوسمانی. بنەماڵەی بەدرخانییەکانیش تێکۆشانێکی گەرمیان دەکرد بۆ دەستخستنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد».[١]

جا لێرەدا بە پێی ئەو زانیارییانەی باسمان کردن و بە گوێرەی بیروڕا و بۆچوونەکانی خۆمان گەیشتووینەتە ئەو ڕاستییانەی خوارەوە و لێرەودوا دەیانخەینە ڕوو:

**یەکەم:** حاجی تا نەچووەتە ئەستەنبووڵ، بیر و باوەڕی کوردایەتی تێنەگەڕاوە و شیعری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی دانەناوە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراومان بە دەستەوە نییە کە حاجی پێش چوونی بۆ ئەستەنبووڵ شیعری لە سەر ئەم جۆرە بابەتانە دانابێ و بیری لە دوا ڕۆژی نەتەوەکەی خۆی کردبێتەوە.

**دووەم:** بە زۆری شیعری دڵدارییەکانی حاجی، زادەی بیر و هەستی ژیانی کوردستانی عێراق و ئێران بوون، مەگەر بەدەگمەن دەنا لە ئەستەنبووڵدا لە شیعری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و لاواندنەوە بەولاوە، هێندە گوێی بە شیعری دڵداری نەداوە.

**سێهەم:** ئەگەر مامۆستای کوڕەکانی بەدرخانییەکانیش بووە، ئەوە واناگەیەنێ کە هەموو دەم لە ماڵی ئەواندا ژیابێ، بەڵکوو بە دەلیلی شیعرەکانی خۆی ماڵ و ژووری تایبەتی خۆی بووە، جا سەربەخۆ یان لە ماڵە کوردێکی ناسیاری ژوورێکی تایبەتی بووە، ژیانێکی هەژارانەی تێدا بردۆتە سەر. هەر وەك خۆی لە دێڕە شیعرێکیدا کە لە نامە شیعرییەکەی بۆ حاجی مەلا «عبدالله»ی جەلیزادەی کۆنە دۆستی و هاوڕێی خوێندنی نووسیوە، دەڵێ:

**شەوێ دانیشتبووم بێ‌شەمع و میسباح  ئەتۆی هێناوە یادم کاکە فەتتاح**[٢]

چونکە ئەگەر لە ماڵی بەدرخانییەکاندا ژیابا، ماڵە پاشا «شەمع و میسباح» واتا: «مۆم و چرا»یان بووە و حاجی دەیتوانی نامەکەی لە بەر ڕووناکی چرای بە شەوق بنووسێ و تاریکی شەو نەبێتە گرفتێك لە پێشی.[٣]

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ٢٠.
٢. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی»، بەغدا ١٩٢٥، ل: ٣٢.
٣. بۆ زانینی زانیاری پتر لەم بابەتەوە بڕوانە: مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، بەغدا ١٩٢٥، ل: ٣٢.

**چوارەم:** حاجی قادر «کەیفی جوانڕوویی» شاعیری لە کۆیە نەبینیوە چونکە سەردەمیان جودا بووە. حاجی زووتر لە کۆیە ڕۆیشتووە و «کەیفی»یش درەنگتر هاتۆتە ئەم شارە و ماوەیەکی باش لە کۆیە ژیاوە و لە مەدرەسەی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی حاجی مەلا «عبدالله» خوێندوویەتی و لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا گەلێ بیرەوەری خۆش و ناخۆشیان بەیەکەوە بووە، حاجی لە ئەستەنبووڵ واتا: لە غوربەتێ بووەتە دۆستی گیانی بەگیانی «کەیفی» و ئەو ڕایە ڕاست نییە کە دەڵێ: «حاجی و کەیفی بەیەکەوە لە شاری کۆیەوە چوون بۆ ئەستەنبووڵ».

کەیفی ماوەیەك پێش حاجی لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی [م] بەرانبەر ساڵانی (١٨٨٢ - ١٨٨٣) لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە و حاجیش بە هەڵبەستە ناودارەکەی «فەلەك بە تیر و کەمانێ لە ئێمە چویتە کەمین» بە شێوەیەکی پڕ شۆڕ و سۆزی ئاوارەیی دەیلاوێنێتەوە و لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ:

**لە «کوێرەدێ»[1] یێ کە «کەیفی»ی تیابێ فیردەوسە**

**جەهەننەمە کە نەما «کەیفی»، شاری «قوستەنتین»**[2]

**پێنجەم:** هەرچەندە حاجی وەك ڕووناکبیرێکی پێشکەوتنخوازی سەردەمی خۆی سەیری مەسەلەی نەتەوایەتی کردووە و ویستوویەتی بە جۆرێکی زانستیانە چارەسەری فەلسەفەی ژیان بکات، بەڵام لە سنووری فەلسەفەی ئایینی ئیسلام نەچۆتە دەرەوە. دەتوانین بە حاجی بڵێین: «شاعیر و مەلایەکی ڕووناك بیر بووە» هەرچەندە هەندێ جار وەك زانایەکی ماتریالیست بیری لە کاروباری ژیان کردۆتەوە و گوتوویەتی:

**لازمە خول بخۆی وەکوو بەرداش      هەموو قەڕنێ دەگۆڕێ ئەمری مەعاش**[3]

---

١. کوێرەدێ: بە دوو مانا دێ، یەکەمیان بە مانای دێیەکی بچووك دێ و دووەمیشیان بە مەبەستی «کوێرەدێ»ی زاینگەی «کەیفی» دێ.

٢. مەبەستی لە شاری قوستەنتین: شاری ئەستەمبۆڵە کە «کەیفی» تێدا ژیاوە و هەر لەو شارەشدا کۆچی دوایی کردووە.

٣. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی»، بەغدا ١٩٢٥، ل: ٣٦.

لە هەمانکاتیشدا وەك مەلایەکی خواپەرستی ئیماندار بەرپەرچی فەلسەفەی هەندێ فەیلەسووفی وەکوو ئەفلاتوون (٤٣٠ - ٣٤٧)ی پێش زایین، دەدادەتەوە کە گوتوویەتی «دنیا قەدیمە» واتا: «دنیا یا خود ماددە کۆنە»و دەڵێ:

**فەلاتوون تۆ دەڵێی دنیا قەدیمە!؟ لە خمخانەت بنێن وەك خۆت لە خم نا**[١]

**شەشەم:** حاجی تا کۆتایی ژیانی ژنی نەهێناوە و بێ ژن و ماڵ و مناڵ ماوەتەوە و ئەم بارە تایبەتییەی ژیانیشی بووەتە کۆسپێك لە بەردەم کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی دیوانی شیعرەکانی، چونکە ئەگەر ژن و مناڵ و نەوەی ببوایە، هیچ نەبوایە هەندێ لە شیعرەکانیان بۆ دەپاراست و بۆ لێکۆڵەری ئەم سەردەمەمان دەبوون بە سەرەداوی بەدوادا چوون و هەڵکردنی زانیاری ڕاست و تەواو لە بارەی ژیان و شیعر و شاعیرییەتیەوە.

حاجی لە دێڕە شیعرێکیدا ئەم ڕاستییەی بێ کەس و بێ ژن و منداڵییەی خۆی بۆ خەڵکە کە ڕوون کردۆتەوە و خۆی لە بێ کەسیدا بە میراتگری حەزرەتی عیسا داناوە و گوتوویەتی:

**هەر منم ئێستە وارسی عیسا بێ کوڕ و ماڵ و بێ ژن و مەئوا**[٢]

دیسانەوە هەر لە بارەی بێ کەسی و بێ مناڵی خۆیەوە دەدوێ و ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە هەرچەندە بێ کوڕ بووە، بەڵام لە سایەی شیعرەکانییەوە باوکی کوڕانە، واتا: شیعرەکانی جگەرگۆشەی ئەون و وجاغی بەو شیعرانەیەوە ڕوونە، لەم بارەیەوە دەڵێ:

**ئەوی شاعیر نەبێ کۆرە وجاغی لە سایەی شیعرەکان، بابی کوڕانم**[٣]

**حەوتەم:** حاجی تەمەنێکی درێژی بەسەر بردووە، بە حیسابی ئەو نووسەر و لێکۆڵەرانەی کە دەڵێن: لە ساڵی ١٨١٥دا لە دایك بووە و لە ساڵی ١٨٩٧دا کۆچی دوایی کردووە (٨٢) ساڵ ژیاوە. بە ڕای ئەو نووسەرانەی کە دەڵێن لە ساڵی ١٨١٧دا لە دایك بووە، دەبێ تەمەنی هەشتا ساڵ بوو بێ لە کاتی مردنیدا. بە مەزەندەی مامۆستا مەسعوودیش وەك لەمەو بەر پەنجەمان بۆ

---

١. گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، چ٣ هەولێر ١٩٦٩، ل: ٢٧.
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ١٠٠. ٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ٣٩.

درێژکرد، دەڵێ: ئیحتیماله له ساڵی ۱۸۲۴ له دایك بووبێ. بەم حیسابەش (۷۳= ۱۸۲۴-۱۸۹۷) ساڵ ژیاوه و هەر سێ تەمەنەکەیشی ئەو وەسفانەی بە ڕاست دەگەیەنن کە گوتوویەتی:

سەرو ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکـە　　　شەوێ هەمڕازمە پشمین و کۆکە

هەروەها گوتوویەتی:

لە بەر پیری ئەوەندە بێحەواسـم　　　دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ئیناسم[1]

هەروەکوو ساغیش بۆتەوە حاجی لە ساڵی ۱۸۹۷دا لە شاری ئەستەنبووڵ، لە ئاوارەیی و بێ کەسیدا سەری ناوەتەوە و لە بەری «ئوسکودار»، لە گۆڕستانی «قەرەج ئەحمەد» نێژراوە.[2]

## حاجی قادر و شیعری نەتەوەیی

حاجی قادر وەك شاعیرێکی کورد، هەر چەندە بە پێی قۆناغ و سەردەمی سەرهەڵدانی خۆی لە ناو سنوور و بازنەی قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و سالم و کوردیدا دەدۆزێتەوە کە لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بەردی بناغەیان بۆ داناوەو پێشی دەگوترا «قوتابخانەی شیعری بابان»، ئەم خاسیەتانەی ئەو قوتابخانەیەش بەسەر شیعرەکانی حاجی تا لە کۆیە و لە کوردستانی عێراق و ئێران بوو دەسەپاندرا، بەڵام کاتێ کە چووە شاری ئەستەنبووڵ و بیر و باوەڕی کوردایەتی لەلا پەروەردە بوو، وردە وردە ڕێبازی شیعری گۆڕا و خۆی لە بابەتی غەزەل و دڵداری کێشایەوە و کەوتە سەر شیعری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی دانان و ڕێبازێکی نوێی گرتە بەر.

هەرچەندە ئەو ڕێبازەی بە ڕوخساری شیعرەکانی هەر لە قاڵبی کۆندا ماوەتەوە، بەڵام لە بارەی ناوەرۆکەوە، جۆرە سۆز و بیرێکی نوێ بوون و حاجی دەستی لە باسی زوڵفی درێژ و چاوی بەخەو هەڵگرت و کەوتە سەر چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی کورد و کۆمەڵایەتی میللەتەکەی.

---

۱. مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب۱ بەغدا ۱۹۷۳، ل: ۱۰٦.
۲. گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی» چ۳ هەولێر: ۱۹٦۹، ل: ۵.

ئەوکارەی حاجیش ڕێچکە و ڕێبازێکی تازەی لە دنیای شیعری کوردیدا خوڵقاند، چونکە ئەگەر شیعری نەتەوەیی لە سەردەمێکی پێش حاجیش سەری هەڵدابێ، ئەوا وەك شیعرەکانی حاجی پێگەیشتوو نەبوون. ڕاستە شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی (١٦٥٠-١٧٠٦) پتر لە سەدەیەك پێش حاجی لە ئێش و ئازاری نەتەوەی کوردەوە دواوە و دەردەکانی دەستنیشان کردوون و دەستی بۆ دوژمنە گەورەکانی ئەوسای کورد درێژ کردووە، کە ڕۆم (عوسمانلی) و عەجەم (ئێران) بوون و هەر ڕۆژە کوردیان بە دەردێك بردووە و ئەم هەڵوێستەی «خانی» بووەتە سەرمەشقێك بۆ شیعری نەتەوەیی دانان لە لای حاجی و هەروەها شاعیرێکی گەورەی وەکوو سالمی ساحێبقڕان هەرچەندە لە چامە درێژە پڕ سۆزەکەیدا لەسەر شەڕی نێوانی عوسمانلی و کوردە بابانەکان سۆزێکی پڕجۆششی نەتەوەیی کورد دەنوێنێ، بەڵام تەنیا چامەیەك نەیکردووە بە شاعیرێکی نەتەوەیی و بە شاعیری غەزەل ناسراوە.

هەرچەندە وەك بۆمان دەرکەوت شاعیری دیکەی کورد ڕچەی ڕێبازی شیعری نەتەوەییان شکاندووە، بەڵام هیچکامێکیان وەکوو حاجی قادر وا بە قووڵی و بەرووبەرێکی وا بە دەرەتان پەرەیان بە شیعری نەتەوەیی کورد نەداوە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی حاجی لە دەوروبەرێکی بەهاتوباتی شارستانێتی وەکوو شاری ئەستەنبووڵی سەدەی نۆزدەهەم و سەردەمی شاعیریەتی و هاتنە ناو مەیدانی ئەدەبی کوردی لە گەرمەی پێگەیشتنی جووڵانەوەی ئازادیخوازی نەتەوایەتی میللەتان لە وڵاتە دراوسێکانی دەوڵەتی عوسمانلی و کارتێکردنی لە سەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد.

نووسەر و ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی هەریەکە بە جۆرێك لە حاجی قادری کۆیی دواون، هەیە دەڵێ: «حاجی قادر بە پێشڕەوی کاروانی ئەو شاعیرە کوردانە دادەنرێ کە ڕێگەی خەبات و تێکۆشانیان بۆ نەتەوەی کورد کێشاوە و شیعریان کردووە بە بەشێکی جودا نەکراوە لە خەباتی گەل و بە چەکوشەکەی «کاوە» بۆ ورد و خاش کردنی دوژمنان».[1]

حاجی ئەو ڕاستییەی بۆ ساغ بووبووەوە کە دەردی کوشندەی نەتەوەی کورد دوژمنایەتی و یەكنەگرتنی دەستە و چین و سەرپاکی ڕۆڵەکانی گەلەکەیەتی، بۆیە هەردەم «هەستێکی

١. د. عزّالدين مصطفى رسول «الواقعية في الادب الكردي»، بيروت ١٩٦٦، ص٧٢.

نەتەوایەتی پیرۆز و خۆشەویستییەکی بە سۆزی بۆ نیشتمان و گەلەکەی بووە، ئەو هەست و خۆشەویستییەی بوون بە سەرچاوەی ئەم هەموو شیعرە بەرزانەی کە چ ئەوکاتە و چ ئێستاش بە چرایەکی ڕێگا ڕوونکەرەوەی نەتەوەی کورد دادەنرێن و هەر ئەو هەست و خۆشەویستییەی بووە وای لێ کردووە کە یەکیەتی هەموو ڕوویەکی ژیانی میللەتی کوردی زۆر مەبەس بێ».[١]

هەر وەك لەم دوو سێ دێڕە شیعرەیدا دەڵێ:

لە دەشت و دێی ویلایەت بینە ئەحباب — وەکوو شەخسێکی واحید بن لە هەر باب
لەمەولا پاکتان با بێنە سەر وەی — لە بۆتان تا بەبان و سەر حەدی ڕەی
هەمووتان بینە یەك دەستوور و نووسین — جل و بەرگ و زوبان و ڕەسم و ئایین[٢]

وە یاخود لە هەڵبەستێکی دیکەیدا چەند بە دڵسۆزی داوای ڕێککەوتن و یەکگرتنی ڕۆڵەکانی هەموو تیرە و هۆزەکانی میللەتی کورد دەکات، تاکوو وەك هێزێکی گەورە و کاریگەر بەرامبەر بە دوژمنانیان بوەستن، هەر وەك دەڵێ:

تا ڕێك نەکەون قەبیلی ئەکراد — هەروا دەبنە خەرابە ئابادا!
ئەنواعی میلەل لە گەورە تا چووك — خەملیوە مەمالیکی وەکوو بووك
یەك بەرگن و یەك زوبان و یەك ڕەنگ — بێ غەیبەت و عەیب و عار و بێ دەنگ[٣]

نووسەر و ڕەخنەگری ئەدەبی کوردیمان بە جۆرێکی دیکە لە حاجی و شیعرەکانیەوە دەدوێن و دەڵێن: «بە سەیر کردنی بەرهەمەکانی حاجی، [حاجی] بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی شیعری کوردی لە ئەدەبی کورددا دەژمێردرێ، ئەو قوتابخانەیەش پێی دەگوترێ قوتابخانەی «تنویر = ڕۆشن کردنەوە» وەیا خود دەتوانین ئێمە پێی بڵێین: قوتابخانەی ڕۆشنبیری. گرنگترین خاسیەتەکانی ئەم قوتابخانە شیعرییەش نزیكبوونەوەیەکی یەکجار گەورەیە لە میللەت و دەربڕینی هیوا و ئاوات و ئازار و داخوازییەکانی بە جۆرێکی

---

١. موحەممەدی مەلاکەریم «حاجی قادری کۆیی» بەغدا ١٩٦٠، ل: ٥٠.
٢. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ل: ٢٠٣
٣. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ل: ١٥٩.

فراوانتر و گەلێ گەورەتر لە شاعیرەکانی پێشوو».[١]

هەمان نووسەر و لێکۆڵەر لە شوێنێکی دیکەی بابەتەکەیدا نووسیویەتی دەڵێ: «لە بەراورد کردنی حاجی لەگەڵ شاعیرانی جووڵانەوەی «تنظیمات» کە نوێنەرەکانیان لە ئەدەبی تورکی عوسمانلیدا «شناسی» و «نامیق کەمال» و «توفیق ضیاءالدین» و «ضیا پاشا» و «عبدالحق حامد» بوون، لە یەکچوونێکی گشتی دەبینین لە نێوانی حاجی و ئەو شاعیرە تورکە عوسمانلییانەدا، بەڵام حاجی وەك شاعیری نەتەوەیەکی ئازار دراو و چەوساوە جیاوازی لە دوو شتدا لەگەڵ ئەو شاعیرانەدا هەیە:

١. باری مرۆڤایەتی لە شیعرەکانی حاجی قادردا پترە.

٢. لە هەڵوێستدا شۆڕشگێڕانەتر دێتە مەیدانەوە».[٢]

حاجی وەك تێکۆشەرێکی قاڵ بووی ناو بۆتەی خەباتی نەتەوەیی دەبینین «لە شیعرەکانیدا وتەی وای گوتووە سوودی میللەتی تێدابێ، بۆیە دەتوانین بڵێین: هەڵبەستەکانی شۆڕشێك بوون لە دژی کارەسات و خراپەکاری ناو ژیانی نەتەوەی کورد و شۆڕشێك بوون لە دژی ئەو شاعیرانەی هەر خەریکی عەشق و دڵداری بوون و شۆڕشێك لە دژی داگیرکەری وڵاتی کوردستان و ئەو شێخ و دەروێشانەی ئایینیان کردبوو بە هۆیەك بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکەکە و سڕکردنیان».[٣]

ئەو دوژمنە داگیرکەرەی کوردستانی سەردەمی حاجی قادر هەر هەمان دوژمنی داگیرکەری سەردەمی "ئەحمەدی خانی"ی مامۆستای بووە و لەو کاتەی کە خانی «ڕۆم و عەجەم» وەك دوژمنی گەورە و داگیرکەری کوردستان دادەنێ و دەڵێ:

**ئەڤ ڕۆم و عەجەم بوان حەسارن    کرمانج هەمی لە چار کنارن**

**هەر دوو تەرەفا قەبیلی کرمانج    بۆ تیری قەزا کرینە ئارمانج**[٤]

---

١. د. ئیحسان فوئاد «بەرهەمی حاجی قادری کۆیی و جێگەی لە ئەدەبی کوردیدا»، کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەی بە زمانی ڕووسی، موسکۆ ١٩٦٦ (خۆی بۆی کردین بەکوردی، ك.ش).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣. د. عزّالدین مصطفی رسول «الواقعیة فی الادب الکردي»، بیروت ١٩٦٦، ص٧٢.

٤. م. ب. ڕۆدنکۆ، «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی، مۆسکۆ ١٩٦٢، ل:٣٢.

دەبینین لە سەردەمی حاجیش هەر هەمان ڕۆم و عەجەم دەستیان بەسەر خاکی وڵاتەکەیدا گرتووە و لە نێوانی خۆیانیان دابەش کردووە، هەروەك لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ:

**لە مابەینی «کڵاوسوور»[١] و «کڵاوڕەش»[٢]    پەرێشانین دەبینە میسلی گای بەش[٣]**

حاجی دوای داواکردنی یەکگرتنی هەموو دەستە و چینەکانی میللەت و دەستنیشانکردنی دوژمنی داگیرکەری وڵاتەکەی، دێتە سەر مەرجی دووەمی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی، ئەویش مەسەلەی چەکە و لە گەلێ جێی شیعرەکانیدا ئەم مەسەلەیە دووبارە و سێ بارە دەکاتەوە و جارێك دڵێ:

**سەلاحی ئێوە ئێستاکە «سیلاحە»**

**تەماعی گەورەیی، بێ «چەك» نەکەن، نەك[٤]**

وەیاخود جارێکی دیکەش لە هەڵبەستێکی تریدا هەمان مەسەلەی گرنگی چەك دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ:

**بە شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە    ئەمن خامەم هەیە و شیر نادیارە![٥]**

حاجی وەك سیاسییەکی ئەمڕۆ، دەیەوێ «خامە و چەك» بە یەکەوە لە خەباتی نەتەوەییدا بەشداری بکەن، چونکە بە تەنیا «خامە»ی نووسین نابێتە هۆیەکی کاریگەری خەبات و خەباتی شۆڕشگێڕیش بە تەنیا چەك ناکرێ ئەگەر لە پاڵ ئەو چەکەدا خامە و نووسین و ڕۆشنبیری و تێگەیشتنی لەگەڵدا نەبێ،[٦] هەر وەك لە نموونەیەکی دیکەیدا ئەمە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:

---

١. کڵاو سوور: مەبەستی لە تورکە عوسمانلییەکان بووە.
٢. کڵاو ڕەش: مەبەستی لە ئێرانییە قاجارییەکان بووە.
٣. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی کۆیی»، بەغدا ١٩٢٥، ل: ١٦.
٤. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی کۆیی»، بەغدا ١٩٢٥، ل: ١١.
٥. گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، چ٣ هەولێر ١٩٦٩، ل: ١٣٠.
٦. کەریم شارەزا «سەرهەڵدانی شیعری سیاسی کوردی»، «گۆڤاری نووسەری کورد»، بەغدا ١٩٨٢، ل: ٣١، ژمارە (٩).

**سەیف و قەڵەم شەریکن لەم عەسرەدا، دریغا**
**شیرم قەڵەم تراشە و کالانییە قەڵەمدان**[١]

حاجی لەبارەی خەباتی نەتەوایەتییەوە لەمە زیاتر دەڕوات و لە دێڕە شیعرێکی دیکەدا مەسەلەی یەکگرتنی ڕۆڵەکانی نەتەوە و تەگبیر کردن و مشوور گێڕانی بە نهێنی و مەسەلەی بوونی چەك دەکات بە بەرنامەی تێکۆشان و دەڵێ:

**جۆشێك بدەن وەکوو هەنگ تەگبیر بکەن بە بێدەنگ**
**ئەسبابی شەڕ پەیا کەن تۆپ و تفەنگ و هاوان!**[٢]

حاجی لە هەنگاوی سێهەمیدا سەرکردەیەك بۆ ئەو بزووتنەوە نەتەوەییەی کورد دەستنیشان دەکات، ئەو کەسەش «یەزدان شێر» بووە کە لە بنەماڵەی بەدرخان پاشا بووە، هەروەك لە قەسیدە پڕ سۆزەکەی «لە ڕۆماکەوتە بەر چاوم»دا ئەم ڕاستییەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە لە سەرەتای قەسیدەکەدا دەڵێ:

**لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم کەسێکی هائیم و حەیران**
**بە هەیئەت تێگەییم کوردە، بە شێوەی ئەهلی کوردستان**
**کە چوومە خدمەتی پرسیم: برادەر خەڵقی کام جێگەی؟**
**لە کام لا هاتووی؟ گریا! گوتی: بابان! گوتم: بابان؟**[٣]

حاجی قادر دوای داڕشتنی سەرەتای قەسیدە پڕ جۆش و خرۆش و سۆزە نەتەوەییەکەی، دەکەوێتە سەر دڵدانەوەی کوردە بابانییەکە و بە گوێیدا دەچرپێنێ کە میرێکی کورد ماوە کە جێی پشت پێبەستنی میللەت بێ بۆ سەرۆکایەتی ئەو بزووتنەوە ڕزگاری خوازییەی نەتەوەی کورد و دەڵێ:

---

١. گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، چ٣ هەولێر ١٩٦٩، چ٣، ل: ٤٥.
٢. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ل: ٧١.
[ئەم بەیتە، وەکوو لەمەولا باسی دەکەین، هەڵواسراوە و لەوانەیە کە شیعری حاجی نەبێت و خرابێتە نێو دیوانەکەیەوە. بۆ ئاگاداری زیاتر سەیری پارچە شیعری (خاکی جزیر و بۆتان)ی ئەم دیوانە بکە.]
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل: ٥٧.

له پاشی ئه‌و هه‌موو گریان و نـاڵه و زاریـیه پـێم گـوت:

عه‌زیزم غه‌م مه‌خۆ هێنده، له سایه‌ی ڕه‌حمه‌تی ڕه‌حمان

ئـه‌میرێك مـاوه پـاشایه، گـوتی: كـێیـه؟ گـوتم: شـێره!

گــوتی: لێره؟ گــوتم: لێره! هــه‌تا تــاران و هـیندستان

به خۆی شێره وه‌كوو ناوی، له شه‌ڕدا دوژمـن ئـه‌ندازه

ته‌مایان هه‌ر به ئه‌و ماوه جه‌میعی خـاكـی كـوردستان[1]

هه‌چی جێگه‌ی ئومێدمانه و ئه‌وی دڵخۆش ده‌كا ئه‌مڕۆ،

كه‌سی دی له‌و به‌ده‌ر نابێته غه‌مخۆری گـه‌لی كـوردان![2]

گه‌وره‌یی حاجی قادر ـچ وه‌ك شاعیرێكی نه‌ته‌وه‌یی و چ وه‌ك زانـایه‌كـی تـێگـه‌یشتوو و ڕابه‌رێكی گه‌له‌كه‌ی ـ له‌وه‌دا نییه كه وه‌ستایانه ده‌ردی كۆمه‌ڵایـه‌تی و ڕامـیاری نـه‌ته‌وه‌كـه‌ی ده‌ستنیشان ده‌كات، به‌ڵكوو گه‌وره‌یی حاجی له‌وه‌دایه له‌گه‌ڵ دۆزیـنه‌وه‌ی ئـه‌و ده‌ردانـه‌دا ده‌رمان و چاره‌شیان بۆ ده‌دۆزێته‌وه، هه‌روه‌ك له‌و پێشه‌كییه‌دا بینیمان و ساغ بووه‌وه.

---

١. هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل: ٥٠

٢. مه‌سعوود موحه‌مه‌د «حاجی قادری كۆیی»، ب٣، به‌غدا ١٩٧٦، ل: ٣٦٩.

**خوێنەری بەڕێز!** بۆیە ئێمە تەنیا کەوتینە سەر لێکۆڵینەوەی شیعرە نەتەوەییەکانی حاجی، چونکە هەرچەندە هەندێ نموونەی بەهێز و سەرکەوتووی لە شیعری غەزەل و وەسفیشدا هەبێ، بەڵام بە تێکڕایی هەر بە شاعیرێکی نەتەوەیی ناسراوە و کە لە ئەدەبی کوردیدا ناوی شیعری نەتەوەیی دێ، ئەوا خەڵکە کەگورج حاجی قادر و ئەحمەدی خانییان دێتەوە یاد. نەشمان ویست پتر بە دوای شیعرەکانی بکەوین و نموونەی تریان لێ بێنینەوە، چونکە مەبەستی سەرەکیمان لەم کارە ئەدەبییەماندا زیاتر ساغ کردنەوەی شیعرەکانی و تۆژینەوەی دیوانەکەی حاجییە، نەك لێکۆڵینەوەی زۆر بەربڵاو لەسەر ژیان و شیعر و شاعیرییەتی چونکە هەندێ نووسەر و لێکۆڵەری خامەبەهێزمان بەر لە ئێمە زۆر بە فراوانی لەو لایەنانەیان کۆڵیوەتەوە و مافی ڕەوای خۆیان پێ داوە.

**کەریم مستەفا شارەزا**

**سەردار حەمید میران**

**١٩٨٤/٥/١٤**

## هێمای سەرچاوەی دەقەکان:

ڕ. ك: جەمال خەزنەدار «ڕۆژی کورد» بڵاو کردنەوە و پێشەکی و لە سەر نووسین، بەغدا: ١٩٨١.

ت. ڕ: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد «تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا»، بەغدا: ١٩٧٨.

ع. س: عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی»، بەغدا: ١٩٢٥.

گ. م: گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، چ٣، هەولێر ١٩٦٩.

م. ڕ. س: مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس.

م. م: مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب١، بەغدا ١٩٧٣، ب٢، ١٩٧٤، ب٣، ١٩٧٦.

ڕ: **کوردستان**: گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (١) ساڵی (٢) بەغدا ١٩٧٢.

ع. م. ن: عەبدولمەجید نوورەددین جەلیزادە، هەندێ لە شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، دەستنووس.

م. ع. ق: دەقەکانی موحەممەد عەلی قەرداغی لە گۆڤاری بەیانی ژمارە (٥٣) و (٥٥) و (٦٦) و نووسەری کوردی ژمارە (٦)ی خولی دووەم.

**خوێنەری بەڕێز!** لە ساغکردنەوەی دەقی شیعرەکانی حاجیدا زمانی ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەهەممان ڕەچاو کردووە، ئەو زمانەی کە «نالی» بەردی بناغەی بۆ دانا و قوتابخانەیەکی شیعری لەسەر بنچینەی ئەو زمانە داناو «سالم و کوردی»یش بەشداریيان لەگەڵدا کرد و گەلێ شاعیری دەرەوەی مەڵبەندی «بابان» پەیڕەوی ئەو قوتابخانەیان کرد و حاجی کۆییش یەکێك بوو لەو شاعیرانە. زمانی شیعری ئەوسایان پڕ بوو لە وشەی بێگانە و وەکوو ئێستا پوخت نەکرابوو جا ئەگەر لە ناو شیعرەکانیدا چاوت بە وشەی ئاوەها کەوت ئەوە لەبەر ڕەچاو کردنی ئەو زمانە ئەدەبییەی سەدەی ڕابوردووە وا حاجی وای گوتووە.

## (١)
## گوتم بە بەختی خەواڵوو

گوتم بە بەختی خەواڵوو: بەسە ئەتۆ بیو خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا[1]

گوڕەی بەهاریە، ئێستێکە شاخ و داخای وڵات
پڕە لە لالە و نەسرین و نەرگسی شەهلا[2]

لە گرمە گرمی سەحاب و لە هاژەیی باران
چیایە پڕ لە هەرا و نواڵە پڕ لە سەدا[3]

پڕە لە سەیل و لە گۆلاو و کانی ڕوویی زەمین
پڕە لە بەرق و بریقەی برووسکە جەووی سەما

شکۆفە درهەمی، شاباشی بایی وەعدە دەکا
لە شەوقی مەقدەمی خەملیوە داروبەردی چیا[4]

پیاڵەیی زەڕی نەرگس لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەبنمی وەك دوڕڕ و لوئلوئی لالا[5]

---

١. لە هەندێ دەقدا «وتم» نووسراوە. لە سەر دەقی دەستنووسی «م. ڕ. س» "گوتم"مان نووسی. لە دەقی «گ. م»دا لە جیاتی «بەسە» وشەی «وەرە» هاتووە.

٢. گوڕە: هەڕەت، گەرمە، کات. نەرگسی شەهلا: نەرگسی کاڵ.

٣. لە هەندێ دەقدا «نەواڵ» نواڵ یا نەواڵە: زەوییەکی بەرزی و نزمی هەبێ. (بڕوانە فەرهەنگی خاڵ، ل: ٦١٤).

٤. شکۆفە: خونچەی گوڵ. مەقدەم: مقدم، هاتن. خەملیوە: ڕازاوەتەوە.

٥. سیمین: زیوین. لە دەقی «گ. م»دا «شەونم» نووسراوە. لوئلوئی لالا: نایابترین جۆری مرواریيە. لە دەقی «ع. س»دا «لوئلوئی لالە» هاتووە.

گوڵیش بە پەنجەیی فەیرووزە جامی یاقووتی
لە بۆ نیساری موهەییایە پڕ لە زەڕڕی تەڵا[١]

لە شادی وەك سەفی شایی لە کێو و کەژ ئەزهار
هەژا بە خەلعەتی گوڵگوون و کەوتە ڕەقس و سەما[٢]

چەمەن لە لالە میسالی خەتی ڕوخی دولبەر
سیاه چادری لێ بۆتە خاڵی سەر گۆنا

لە کن بەنەوشە و خاو و هەڵاڵ و بەیبوونی
هەڵاڵی پێستەیی خاوە عەبیر و موشکی خەتا[٣]

چیا لە تەوقەسەری داڕژاوە تا کەمەری
چو زولفی سونبولی دەرهەم، چو پەرچەمی بەڕەزا[٤]

بە جۆشی ئاگری گوڵناری کانی هەڵدەقوڵێ
میسالی دیدەیی وامیق لە حەسرەتی عەزرا[٥]

---

١. فەیروزە: پیرۆزە، ڕەنگ بسەوز، یاخود ڕەنگ شین. [مەبەست لە پەنجەیی فەیرووزە: ساق و تەنەی گوڵە کە سەری‌گوڵەکەی کە وەك جامی شەراب سوور و یاقووتییە، لەسەر دەستی گرتووە و پێشکەشی دەکا]. نیسار: پەخش کردن، بڵاوکردنەوە. موهەییایە: ئامادەیە. تەڵا = «طلا»: وشەیەکی فارسییە بە مانای زێڕ (ئاڵتوون) دێ.

٢. ئەزهار: کۆکراوەی «زهر» بە مانای گوڵ دێ. لە دەقی «ع. س» و «گ. م»دا لە جیاتی «أزهار» وشەی «إظهار» نووسراوە. لە دەقی «ع. س»دا «هوژا» هاتووە، لە «گ. م»یشدا «هوزار» هاتوە. خەلعەتی گوڵگوون: خەڵاتی گوڵ‌ڕەنگ.

٣. [خاو و هەڵاڵە و بەیبوون: سێ جۆرە گوڵی بۆنخۆشن]. موشکی خەتا: جۆرە میسکێکی نایابە، خەتا: ناوچەیەکە لە تورکستانی چینی کە بە میشك بەناوبانگە.

٤. چو: وەکوو چەشنی. سونبول: جۆرە گوڵێکە، سونبولی دەرهەم: سونبولی بە یەکاچوو. بەڕەزا: جۆرە گیایەکە، باڕێزە.

٥. گوڵنار: گوڵی زڕە هەنارە، ڕەنگێکی سووری ئاگرینی هەیە. وامیق و عەزرا: دوو عاشق بوون وەکوو «مەم و زین» و «شیرین و فەرهاد».

قەڵاتی زیوی ڕوخاوە هەرەس بە تۆپی نەسیم
سوپاهی لالە و گوڵ، چادری لە جێ هەڵدا[1]

لە گۆلە شینێ کە قاز و مراوی دێن و دەچن
نەزیری ماه و ستارەن لە قولزوومی مینا[2]

شنەی نەسیمە سەدای ئاوی سافی سەر قەڵبەز
بە ورشە ورشی گیا شەنگەبی بووە شەیدا[3]

خرینگ و هۆڕی قوڵینگ و قەتاری سی لە سەران
دەبێت و کەو دەفڕێت و شەهێن چریکە دەکا

لە پیرە پیڕ و لە سمکۆڵی پیرە گا کێوی
دەلەرزێ گاوی زەمین و دەترسێ گاوی سەما[4]

لە دەنگ و دووکەڵی شینی تفەنگی نیچیرەوان
میسالی سونبولی زوڵفێ کە تێك بچێ بە سەبا[5]

---

١. هەرەس: پەڵە بەفرێکی زۆر گەورەیە بە قەد چیاوە بڕمێتە خوارەوە.

٢. لە هەندێ دەقدا «گۆمە شین» هاتووە، [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: گۆمەشین باشترە، تا ئاماژە بێت بە دێی «گۆمەشین»؛ چونکە حاجی لە دوورە وڵات دایە و حەز دەکا بە شێوەی تەورییە بە ناوی شوێنەکانی لای شارەکەی ئاماژە بکات ـ هەنگاوێ‌تر: ٤٠]. قولزوومی مینا: ئاسمانی مینایی، [ئاسمانی شین].

٣. قەڵبەز: تاڤگەی ئاو. [ورشە ورش: بریقە و ترووسکە]. شەیدا: عاشق، شێت.

٤. [پیرە پیڕ: دەنگی گا. سمکۆڵ: سم و پێ بە زەویدا کوتانی ئاژەڵ]. گاوی زەمین: ئەو گا ئەفسانەییەی کە دەڵێن گۆی زەوی لەسەر پشتی وەستاوە. گاوی سەما: «برج الثور»، کەلووی گا.

٥. لە دەقەکانی «ع. س» و «گ. م»دا نووسراوە «لە بیست و دووکەڵی» بەڵام ئەم دەقەمان لە دەستنووسەکەی «ع. م. ن» وەرگرت و تۆمارمان کرد. [موحەممەدی مەلا کەریم، دوای

چیایە شێخ و کەوای سەوزە، مێزەری بەفرە
سیواکی چووزەرە ڕێواسە، تەیلەسانی گەڵا[1]

چەمەن لە لالە و ڕەیحان و نەستەرەن ئیمڕۆ
سوپێهر و سوبح و شەوە و ئافتابی وەختی زوحا[2]

چنار و عەرعەرە دەفزەن هەزارە نەغمەسەرای
گیاشی زاکیرە تەسبیحی شەبنمی لە مەلا[3]

لە ژووری مێگەلی هەورە، لە ژێری مێگەلی مەڕ
شەبیهی گوڵشەنی خەزرایە، توودەیی غەبرا[4]

لە کێو کەژ کە سەر ئێوارە دێتەوە ماڵات
لە دەوری چادری ساحێبی مەوجی دا، وەستا[5]

---



تێگیرانێکی زۆر لەگەڵ کاك عەبدوڕڕەزاق بیماردا، دەگاتە ئەو قەناعەتەکە «لە بستوو» ـکە بە مانای تەپۆڵکەیە ـ دروستە، نەك «لە دەنگ و» هەروەکوو چۆن لە دەستنووسەکانی لای خۆیدا وەها هاتووە. هەروەها دەڵێ: دەبێ وشەی «زولفێ کە» بەسەر یەکەوە (زولفێکە) بنووسرێت، چونکە مانای شیعرەکە ئاوەهایە: دووکەڵی شینی تفەنگی نێچیرەوان کە لە بستوو ئەچێ بە ئاسمانا، وەك سونبوڵی زولفێك وایە بای سەبا تێکی دابێ. ـهەنگاوێکی‌تر: ۵۳، ٥٤.]

١. تەیلەسان: جبەی سەوز. ٢. سوپێهر: ئاسمان. [زوحا = ضحیٰ]

٣. [هەزار: بولبول] نەغمەسەرا: گۆرانی بێژ. لە دەقی «گ. م»، «شەونم»ی ئەم سەردەمەی ئێستا نووسراوە.

٤. [خەزرا = خضراء: سەوز. مێگەل: ڕان، گەلە]. توودەی غەبرا: گردۆڵکەی بۆر، یا خود عەردی بۆر.

٥. [ماڵات: مەڕو ماڵات]. دەقی ئەم نیوە دێڕەمان لە سەر باسێکی مامۆستا مەسعوود موحەممەد، لە گۆڤاری «کاروان»ی ژمارە «٧»ی ساڵی ١٩٨٣دا، ڕاست کردەوە. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «مەوجی دا وێستا».

لە حـیلە حـیلی کـەحێل و لە بـاڕە بـاڕی مـەڕان
لە دەنگی قۆڕەیـی گـاجووت و بـۆڕەیـی مـانگا[١]

لە گورگە لوور و حەپەی سەگ، لە قاڕە قاڕی بزن
لە عەکسی دەنگی دوبـارەی کـە دێتـەوە لە چـیا[٢]

لە ئـۆحـە ئـۆحـەیی گـاوان و قـیڕە قـیڕی شـوان
لە بگرە بەردەیی کـابان دەبـێتـە حـەشر و حـەلا[٣]

مـەلائیکەی سـەری تـاق و ڕەواقـی مـینایی
دەیێنە جونبوش و لەرزین، دەکەونە حـەولەوەلا[٤]

کە هـەڵکـرا شـەوێ ئـاگـر لە کـوللی ڕەشـماڵەك
خـــجل دەبـــن لە زەوایـــایی خـــەیمەیی والا[٥]

عـــوتارید و زوحـــەل و ئـافتاب و مـاهی تـەمام
خولاسە، سـابیت و سـەییارە تـا دەگـاتە سـوها[٦]

---

١. کەحێل: ئەسپی ڕەسەن.
٢. [وشەی «دوبارە» دەبوا بە واوی جووت (دووبارە) بنووسرایە، بەڵام لەبەر کێشی شیعرەکە بە یەك واو نووسیمان. (هەنگاوێکی‌تر).]
٣. [کابان: خاتوون، کەیبانووی ماڵ. حەشروحەلا: زڵە و قەرەباڵغی، حەشرەلا].
٤. مـەبەست لە «ڕەواقـی مـینایی» ئـاسمانە. لە هـەندێ دەقـدا «ڕەقس و سـەما» هـاتووە. [حەولەوەلا: گوتنی لا حولَ و لاقوةَ إلّا باللّه. ئەم ڕستەیە لە کاتی سەر سووڕماندا دەگوترێ].
٥. خجل دەبن: شەرمەزار دەبن. خەیمەیی والا: خەیمەی بەرز و بڵند، کە مەبەستی ئاسمانە. [زەوایا: کۆی «زاویە»یە بە مانای گۆشە و سووچە].
٦. عوتارید و زوحەل: دوو ئەستێرەن لە کۆمەڵەی خۆر. ئافتاب: ڕۆژ، هـەتاو. مـاهی تـەمام: مانگی تەواو مانگی پڕ. سوها: ئەستێرەیەکی کزە لە کۆمەڵە ئەستێرەی حەوتەوانەدا.

سـەبا! دەزانـی ژیـانم لە دووریـیان مـەرگە؟!
دەسا وەرە بە کـزەی خـۆت خـجل بکـە عـیسا[١]

ئەگـەر مـنم، لە فـیراقـیان کـزەم لە جـەرگەوە دێ
ئـەگـەر دڵە، وەکـوو جـەرگم دەڵێی ئـەوا سـووتا

لە پاشی ئەم هەموو داستانە بەختی خواب ئالوود
میسالی ئەژدەری نوستوو بە ڕق لە خـەو هـەستا[٢]

جـەوابـی دامـەوە ئـەمما جـەوابـەکـی وا ڕەق
نـەما مـەجالی مـەقال و مـوباحەسە لەم لا[٣]

گـوتی: هـەتاکـوو خـەزان و بـەهار و زسـتانە
مـەداری عـەیشی مـەوالیدی عـالەمی غـەبرا[٤]

بـەهاری وا هـەموو سـاڵێکـی دێتـەوە ئـەمما
ئـەوانـی دەچـنە دیـاری مـەمالیکی عـوقبا[٥]

---

١. کزە: کزەی با، شنەی با. [واتە: ئەی بادی سەبا تۆ وەرە من زیندوو کـەرەوە وەکـوو چـۆن حەزرەتی عیسا فووی لە مردوو دەکرد زیندوو ئەبوونەوە].

٢. خواب ئالوود: فارسییە بە مانای خەواڵوو دێ. ئەژدەر: ئەژدەها، عەزیا.

٣. [موحەممەد مەلاکەریم لای وایە کە «لەم لا» هەڵەیە و دروستەکەی «لیمە لا = لِمَ لا»یە کە دوو ئامرازی زمانی عەرەبین (لیمە = لِمَ) واتە: بۆچی، (لا) بە مانا نای نەفیە، سەرجەم واتەی (بۆچی نە)یە کە لە وتووێژدا زۆر دووپات ئەبێتەوە].

٤. [مەداری عەیش: چەرخی ژیان. مەوالیدی عالەمی غەبرا: سك و زا و بەرە و بەرچەی ئەم دونیا تۆزاوییە].

٥. ئەم نیوە دێڕەمان لە سەر باسێکی مامۆستا مەسعوود مـوحەممەد لە گـۆڤـاری «کـاروان» ژمارەی (٧)ی ساڵی ١٩٨٣دا ڕاست کردەوە. لە دەقی «ع. س» و «گ. م»دا، «ئەمانە دەچنەوە» هاتووە. عوقبا: ڕۆژی قیامەت.

یەکێکی نایەتەوە، چوونیان هەر ئەو چوونە
لە شێخ و عالیم و جاهیل، لە پادشاه و گەدا

مەکانە، شەوقی بە عێلاتە، پەشمە کۆنە هەوار
حەیاتە، زەوقی بە ئەحبابی، بایە ئاب و هەوا[1]

ڕەفیقی کۆنە نەماون، جوانەکان پیرن
بە شەق دەڕۆن و لە داری دیارە شەقی عەسا[2]

لە دووسەدی یەکەکی زەحمەتە بناسییەوە
مەگەر بە ناو و نیشان و بە خزم و باب و برا[3]

کە بێی و بچیەوە ئێستا «كَأَنَّهُ» دیسان
سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری جابولقا[4]

خولاسەیی قسە ئێستێکە مەسڵەحەت ئەمەیە
بڵێی بە وەجهی نەسیحەت، بە کاغەز و ئینشا[5]

ئەمان! کوڕانی ڕەفیق و برادەرانی وڵات
بە ئێوە هەر کەگەیی ئەم کەلامی بێسەروپا

---

١. [عێلات: کۆی عێل، خێڵی کۆچەری کە گەرمیان و کوێستان دەکەن]. پەشمە، پەشم: هیچ، بێ کەڵك. ئەم دێڕە شیعرەشمان لە سەر دەقی «کاروان»ی ژمارە «٧» ڕاستکردەوە.

٢. جوانەکان: جاحێڵەکان، گەنجەکان، لاوەکان. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە «لە دووری دیارە شەق و عەسا».

٣. [یەکەکی: یەکێکی].

٤. [کأنّە: وشەیەکی عەرەبییە کە بۆ چواندن بەکار دێت، واتە: وەکوو ئەوە وایە]. ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ دەقدا بەمجۆرەیە: «گەر بێی و بچیەوە ئێستاکە بۆ وەتەن دیسان». جابولقا: شارێکە ناوی هەیە و خۆی نییە. بۆ یەکەم جار لە داستانەکانی هەزار و یەك شەودا ناوی هاتووە.

٥. موحەممەدی مەلا کەریم لای وایە ـ وەك چۆن لە دەستنووسەکانیشدا هەیە ـ وشەی «ئەوەیە» لە نیوە بەیتی یەکەمدا دروستە لە جیاتی «ئەمەیە»، چونکە شوێنەکە جێی ئاماژەی نادیارە.

لە پاش ئەوەی کە تەسحیە و موتاڵەعەی بکرێ
بە یادی من لەبەری کەن لە ڕوویی میهر و وەفا[١]

هەتا لە خیتتەیی بێگانە فەخری پێوە بکەم
لە بەینی زومرەیی ئەحیا و مەجمەعی مەوتا[٢]

ونی مەکەن وەکوو ئاساری «نالی» و «کوردی»
لە سەهوی دیدە بپۆشن، گوزەر بکەن لە خەتا[٣]

نییە لە موومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خواجەیی دیوانی «عَلَّمَ الأسْما»[٤]

ئەوی حەسوود و جەهوولن، لەئیم و ڕەخنەگرن
لە عەیب و ڕەخنەیی عالیم بەری دەبن ئودەبا[٥]

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما[٦]

---

١. تەسحیە: «تەصحیح»، ڕاست کردنەوە. میهرو وەفا: خۆشەویستی و وەفاداری.

٢. [خیتتە = خیططە]. خیتتەیی بێگانە: یا خوتتەیی بێگانە، مانای خاکی بێگانەیە. زومرەیی ئەحیا: کۆمەڵی زیندوان. [مەجمەعی مەوتا: جێی کۆبوونەوەی مردوان].

٣. دیدە بپۆشن: چاو بپۆشن، لە دەقی «گ. م»دا «چاوێ بپۆشن» هاتووە. گوزەر بکەن لە خەتا: بەسەر خەتاکانی تێپەڕن، چاو لە خەتاکانی بپۆشن.

٤. [لام وایە نیوە بەیتی یەکەم ئاوەها ڕاستتر بێت: «نییە لە مومکین، ئیمکانی خەتا و سەهوی نەبێ»، واتە: «یێ»یەکە لە باتی ئەوە بلکێنرێت بە مومکینەوە بنووسێنرێت بە ئیمکانەوە، چونکە مانای نیوە بەیتەکە ئاوەهایە: لە نێو مومکیناتدا ئیمکانی نییە هەڵە و سەهوی نەبێ. بەم شێوە نیوە بەیتەکە هەم لە باری ماناوە و هەم لە باری کێشەوە لەبارترە. مومکین: زاراوەیەکی عیلمی کەلامە بەرانبەر بە «واجیب»ە]. مەبەستی لە «خواجەیی دیوانی عَلَّمَ الأسْما»: خودایە. ئیشارەتە بۆ ئایەتی ﴿وَ عَلَّمَ آدَمَ الأسْماءَ کُلَّها﴾ بەقەرە: ٣١.

٥. جەهوول: نەزان. [لەئیم: ڕژد، چرووك]. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «عالەم».

٦. قەبیح و کەریهن: ناشرین و ڕەزاقورس. ئەعما: «الاعمیٰ»، کوێر و نابینا.

میسالی فەرخەیی «ژیشك» کە پێی دەڵێ دایکی:
ئیلاهی! قاقومە یا خەز، سەموورە یا دیبا؟![1]

شەبیهی جۆڵەکە ڕازی نەبێ بە سەردڕی خۆی
مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا[2]

بەلاغەتێکی هەیە، هیچ زوبانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەسسوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها[3]

کە خۆتی تێ نەگەیێنی، لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەموو هەزەیانە خودا بەڵای لێ دا![4]

بەڵام ئەوانی کە سەرڕافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شەهڕەوایی دەزانن، چ سککەیەکە ڕەوا[5]

چ حیکمەتێکە کە ئاساری کوردە ناموسی
نە کیمیایە، نە عەنقا، لە بەینی ئێمە نەما[6]

---

١. [فەرخ: بێچوو، بەچك. ژیشك: ژەژوو، گیانلەبەرێکە دڕکاوی]. لە دەقی «گ. م»دا لە جیاتی ژیشك «ژووشك» هاتووە. خەز: ئەمەش گیانەوەرێکی وەك سمۆرەیە، کەوڵێکی نەرمی ئاورێشمینی هەیە. قاقوم: قاقم جۆرە گیانەوەرێکە لە سمۆرە دەچێ و کەوڵێکی نەرمی هەیە. دیبا: جۆرە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگی ئاورێشمینە.

٢. سەردڕ: جل وبەرگی چنراوی دەسکردی جۆڵا. [جۆڵەکە: ئەوەی ئیشی جۆڵایی دەکا، واتە: شاڵ و بەرماڵدوور. مامۆستا هەژار لە هەنبانەبۆرینەدا لەسەر وشەی «سەردڕ» ئەم بەیتەی بەم شێوە هێناوەتەوە: «وەکوو جۆڵایێ کە ڕازی... هتد»].

٣. بەها: نرخ، قیمەت.

٤. هەزیان: «هذیان» هوڕێنە.

٥. [شەهڕەوا: دوو مانا دەبەخشێ، یەکەم: بە شایانی پادشایانی دەزانن؛ دووەم: بە «شەهرەوا»ی ئەزانن کە ناوی دراوێکی میرنشینی کورد بووە لە ناوچەی بۆتان. ـهەنگاوێ تر: ٥١]. ڕەوا: حەلاڵ، حەق.

٦. عەنقا: جۆرە باڵندەیەکی خەیاڵییە، ناوی هەیە و ڕەنگی نییە. [مەبەستی ئەوەیە بڵێ: خۆ ئاساری کوردی کیمیا و عەنقا نین، کە دوو شتی نایابن، ئەی بۆچی لەبەین چوون؟!].

ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەبووری لەئیم
نقوودی «حاجی» کە نەیدیوە خوسرەو و دارا[1]

ئومێدی وایە نەسیبی کەریمەکی وابێ
بە خێری دایکی و بابی لە ڕێی خودا بیبا[2]

گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیکایەتم مابوو
کەچی لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا



## (٢)

## ئەوە شاهەنشەهە

ئەوە شاهەنشەهە بۆ عەبد و پاشا
موعەللەق خەیمەیی ئەفلاکی هەڵدا[3]

ئەتۆ مەسنووعی، چیتداوە لە سانیع؟
لە زانینی ئەوە نادانە دانا

---

١. مەندەبوور: وشەیەکی فارسییە بە مانای بەدبەختی غەمگین دێ. نقوودی حاجی: هەرچەندە بە مانای پارەکانی حاجی دێ، بەڵام لێرەدا مەبەستی شیعرەکانیەتی، لە ڕووی بەهادارییەوە شوبهاندوویە بە پارە.

٢. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە دەقی «گ. م»دا بەمجۆرە هاتووە: «ئەمین بە وایە نەسیب و گەر یەکێ وابێ». لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «لە ڕێی خودا»، «لە ڕێی خێرا» هاتووە. لە دەقی «م. ڕ. س.»و «ع. س»دا «بیدا» هاتووە، بەڵام ئێمە دەقی «گ.م»مان لا پەسند بوو «بیبا»مان نووسی.

٣. [موعەللەق: هەڵواسراو، داڵۆسکە. خەیمە: تاوڵ، ڕەشماڵ و چادر. ئەفلاك: کۆی فەلەکە واتە: ئاسمان. واتە: بەبێ ئەستوون و کۆڵەکە چادری ئاسمانی هەڵداوە].

موعەممایە جیهان ئیسمی مـوعەمما
مەکانی ئیسمە نەك جێگەی موسەمما[1]

بـە بـێ‌دیـنی جـەمالی بـێ‌قـەرینی
خەلایق سەر بە سەر ئیمانی هـێنـا![2]

بە با زولفی کە لەرزی تا بـە تـا بـوو،
لەگەڵ لەرز و لەگەڵ تا بوونە هـەمتا[3]

موتاڵای دەوری زولفەینی موسەلسەل
ئەوەندەم کردووە لێم بۆ بـە سـەودا[4]

لە دەوری دوڕڕی دندانی بە قـیمەت
ددانـــی کـــەندووە لوولوویـــی لالا[5]

---

١. موعەمما «مـعمّیٰ»: لوغـەز، ئـەو قسـەی مـانای نـادیارە، [مـەتەڵۆك]. لە دەقـی «گ. م»دا نووسراوە: «جێگەی موعەمما»، بەڵام ئێمە بە پێی دەقی «م. ڕ. س» و ماناکـەی، کـردمان بـە «موسەمما».

٢. دینی: بە مانای دیتنی دێ. بۆ کێشی شیعرەکە بەمجۆرە هـاتووە و لە دەقـی «م. ڕ. س»دا نووسراوە «دیتنی» و کێشەکەی تێکداوە. بێ‌قەرین: بێ‌هاوتا.

٣. [تا: لە نیوە بەیتی دووهەمدا بە مانای یاوە، واتە لەرز و تا].

٤. [موتاڵا: موتالەعە، خوێندنەوە. زولفـەین: زولف +یـن کـە نـیشانەی جـووتە (تـەسنیە) لە عەرەبیدا بە مانای دوو تاڵ مووە، وادیارە کنایە بێت لە دوو ڕشتەی «عـلة و مـعلول» کـە بـە شێوەی زنجیر، (موسەلسەل) دەڕوا تا لە ئەنجامدا ئـەبڕێت و خـودای پـێ سـابت دەکـرێ. سەودا: عەشق، ئەوین. موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: «هەرچەند دەسخەتێکم بۆ پاڵپشـتی قسەکەم نەدۆزییەوە، بەڵام لام وایە «لێم بۆتە سەودا» ڕاسترە». ـهەنگاوێ‌تر: ٥٩].

٥. دندان: ددان، دان. لە دەقی «م. ڕ .س»دا دوندان هاتووە. وە لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «لوءلوئی لالا» بەڵام ئێمە لەسەر دەقی «م. ڕ. س» وەکوو ناو هەڵبەستەکەمان نووسی چونکە ڕاسترە. [لوولوویی لالا: مرواری تroووسکەدار و بە ورشە].

لەلای من پەشمە ئەم زەخمە هەتاکەی
بە زایع ناچێ ئەم سەبرە لەلای خوا[١]

زەمانی حاڵە «حاجی» حاسڵی تۆ
دەبێتە دوێنێ ئەمڕۆ، میسلی فەردا[٢]



## (٣)

## بەستەیی زوڵفی نیگارێکم

بەستەیی زوڵفی نیگارێکم ڕەسەن بازی دەکا
سەففی موژگانی لە تابووری سوپای غازی دەکا[٣]

سامیری گۆسالەیە، توڕڕەی کە تەڕڕاری دەکا
ساحیریی ئەسڵی هەیە غەمزەی کە غەممازی دەکا[٤]

---

١. هەرچەندە وشەی «هەتاکەی» هیچ واتایەکی گونجاو بە پێی شوێنەکەی نادا بەدەستەوە، بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکیش وشەیەکی ڕاستترمان نەدۆزییەوە.

٢. فەردا: وشەیەکی فارسییە بە مانای سبەی، سبەینێ دێ.

٣. لە دەقی «گ. م»دا لە جیاتی «سەففی موژگان»، «تیپی موژگانی» هاتووە. [ڕەسەنباز: تەنافباز، ئەو کەسەی بەسەر تەنافدا دەڕوا و یاری بە پەت دەکات. سەففی موژگان: ڕیزی برژانگ و مژۆڵ. تابوور: ڕیز و سەف. غازی: شەڕکەر].

٤. سامیری: ناوی سیحربازێکی سەردەمی حەزرەتی مووسایە. گۆسالە: گوێلک. مەبەستی لەو گوێلکەیە کە سامیری لە زێڕی دروست کردبوو داوای لە مووساییەکان کرد بیپەرستن. [توڕڕە: پرچی شۆڕەوە بوو بەسەر ناوچاواندا. تەڕڕار: تەردەست، ئەو کەسەی کە بە دەستوبردە لە سیحردا، مەبەست ئەوەیە کە لە دڵبردنا دەستێکی باڵای هەیە. غەمزە: لار و لەنجە، ناز و کرشمە].

هەروەکوو عیسا لەسەر بەحری هەوا کەوتە سەما
هەرچی مووسایی نەبێ چۆن نەفیی ئیعجازی دەکا[١]

مـن فـەقێم و غـەیری سـیپارەم لە بـاخەڵدا نـییە
ئەو کەسەی ساحیب قرانە ئیددعای غازی دەکـا[٢]

ساغی لەم ڕێگایەدا کـاری لە دیـن چـی؟ سـادیقە
هەر کـەسێکـی عـاشیقە ئـەلبەتتە ئـەنبازی دەکـا[٣]

دڵ کە دەربـەندی حـەیا و نـەنگ و نـام و عـارییە
ئەو قسووری کردووە دێ ئارەزووی نـازی دەکـا[٤]

سەیری لەو تـەننازییە قـازی بـە مـوفتی نـاکـرێ،
سۆفی ئیمانی دەدا «حاجی» بە گیان ڕازی دەکـا[٥]



١. لەدەقی «گ. م»دا بەمجۆرە هاتووە: «هـەرچیی مـووسا نـەبێ». دیسـان لە هـەمان دەقـدا ئەمەش بەمجۆرە هاتووە: «نەفسی ئیعجازی دەکا».
٢. غازی و قران دوو جۆرە پارەی کۆنن. [سیپارە: سی تیکە، بەشێك یان جزمێك لە قورئان].
٣. ئەنبازی: دۆستایەتی، هاوکاری.
٤. [قسوور = قصور: کەمکاری، کۆتایی کردن لە کاردا].
٥. تەننازی «طنّاز»ی: وشەیەکی عەرەبییە بە مانای سوخرییەت و گاڵتەجاڕی دێ.
[بە بۆچوونی موحەممەدی مەلاکەریم «مفتی» دروستە نەك «موفتی»، چونکە لێرەدا مەبەست مفت و خۆڕایی بوونە، نە فتوادەر. حاجی، بە گوێرەی ڕێنووسی کۆن «مفتی» لە ڕواڵەتدا لە بەرانبەر «قاضی» داناوە کە ویستوویەتی هەم مانای مفت و خۆڕایی ببێ و هەم مانای موفتی. ـهەنگاوێ‌تر: ٦١].

## (٤)

## تا له مه‌کته‌ب ئه‌و مه‌هه‌م دی

تا له مه‌كته‌ب ئه‌و مه‌هه‌م دی مه‌شقی ئه‌لف و بێ ده‌كا
چاوه‌كه‌م بوویته دوێت و گریه سورخی تێده‌كا[١]

لێی مه‌پرسه مه‌سئه‌له‌ی نوقته‌ی ده‌م و موویی كه‌مه‌ر
مووشكافه، بووعه‌لی باسی په‌ری و جین چێ ده‌كا[٢]

ئه‌م هه‌موو دنیایه خاسسی حوكمی دوو دێوانه‌یه
من له شارم غایه‌تی مه‌جنوون هه‌وای لادێ ده‌كا

قه‌سری عومرم داته‌پی داری له سه‌ر به‌ردی نه‌ما
بانیی توولی ئه‌مه‌ل ئیستێكه ده‌ستی پێ ده‌كا[٣]

خواجه خۆی پیره، وه‌جاغی كوێره، ماڵی بێ‌حیساب
پێم بڵێن ـ ئیشكالمه ـ: ئه‌م كۆششه‌ی بۆ كێ ده‌كا؟

---

١. سورخ: سوور، مه‌ره‌كه‌بی سوور، كه مه‌به‌ستی له خوێنی چاویه‌تی.
[موحه‌ممه‌دی مه‌لا كه‌ریم ئه‌ڵێ: ئێستا لام وایه دوور نییه وشه‌ی «دی»یش له نیوه‌ی یه‌كه‌می ئه‌م به‌یته‌دا «دێ» بێ، به مانا: دێته‌وه. واته: تا دۆست له مه‌كته‌ب دێته‌وه كه چووه مه‌شقی ئه‌لفوبێ ئه‌كا له‌وێ، دیده‌م له خه‌فه‌تا بۆی بووه به دوێتی مه‌ره‌كه‌ب تێكردن و گریان له جیاتی مه‌ره‌كه‌بی سوور ـ كه له حوجره‌ی فه‌قێ «سورخ»یان پێ ئه‌وت ـ فرمێسكی خوێنینی خۆی تێ ئه‌كا. ـ هه‌نگاوی‌تر: ٦٥.]
٢. مووشكافه: مووشكاف، مووقه‌ڵێش. [چێ كردن: ڕاست و ساغكردنه‌وه].
٣. [واته: كۆشكی ته‌مه‌نم ڕووخا (پیر بووم)، كه‌چی ئاره‌زووی دوور و درێژ تازه خه‌ریكه بنه‌ڕه‌تی دیواری هه‌وه‌س و ڕابواردنی ده‌نێ. ئیشاره‌ته بۆ حه‌دیسی پێغه‌مبه‌ر(د.خ) كه ئه‌فه‌رموێ: «**يشيبُ ابنُ آدَمَ و يَشُبُّ فيه خصلَتان: الحرصُ و طولُ الأمل**» واته: مرۆڤ پیر ده‌بێ به‌ڵام دوو ڕه‌وشتی تیا لاو ده‌بێته‌وه: چاوچنۆكی و ئاره‌زووی دوور و درێژ] له هه‌ندێ ده‌قدا سه‌ره‌تای ئه‌م نیوه دێڕه به‌م‌جۆره هاتووه: «بانی بێ توولی ئه‌مه‌ل».

شێخی من بەو غایەتە پشتی لە عالەم کردووە
سوورەتی خۆشی لە نێو ئاوێنە پشتی تێ دەکا

ماچی دەست و پێی ئەمیری دەستگیری حازرە،
شێتە «حاجی» ماچی لێو و دەستی دەستوپێ دەکا[١]



## (٥)
## تمنّيتُ مِنَ الدَّهر

«تَمَنَّيتُ مِنَ الدَّهْرِ نِدائي أَزمِناً نادیٰ:»
گوتی: هەرچی تەمەنناکەی لە دنیا غەیری من نادا[٢]

لە سایەی زوڵفی ئەفشانی پەرێشان دێ خەتی مانی
لە تەسویری ئەگەر جارێ بە وەستایی قەڵەم دادا[٣]

خەتی دەورەی ڕوخی داوە وەکوو مووری سولەیمانی
خەیاڵی کردووە زوڵفت بە حیلە خاتەمی لادا[٤]

---

١. دەستوپێ: بە مانای خزمەتکار دێ. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «شێتە حاجی ماچ لە لێو و دەستوپێی ئەو دەکا».

٢. [واتە: ئەمن ئاواتەخواز بووم لە زەمانە، بانگ و جاڕیشم لەمێژە هەر هاوار دەکا]. أزمناً: جمع زمان، کۆکراوەی زەمانە. لە دەقی «گ. م»دا ڕێنووسەکەی نیوەی بەکوردییەو نیوەشی بە عەرەبییە، کەچی نیوەی دێڕەکە عەرەبییە دەبێ هەمووی بە عەرەبی بنووسرێ.

٣. ئەفشان: بڵاو پەخشان. مانی: وێنەکێشێکی زۆر ناودار بووە.

٤. لەدەقی «گ. م»دا نووسراوە: «دادا». [موحەممەدی مەلاکەریم «مووری» بە لاوە هەڵەیە و ئەڵێ: لەم چاپەدا لەبیرم چوو ڕاستی کەمەوە و دروستەکەی «مۆری»یە واتە: موهر، مۆر، هەروەکوو چۆن «خاتەم» لە دێڕی دووهەمدا بەڵگەیە لەسەر ئەمە. جا مانای بەیتەکە بەم شێوەیە: کە ڕوخساری خۆشەویستی شوبهێنراوە بە نەخشی ناو مۆرەوە و مووی دەور و پشتی

له ژێر قــافی فــیراقـیدا وەهـا فـەرسوودەیە جـیسمم
لەگەڵ عەنقا قـەرینم مـن له ئـیسمی بـێ‌مـوسەممادا[١]

خەدەنگی دیققەتی «حاجی» قەسیمی جەوهەری فەردە
کەچی وەسفی دەمی هەر ما له ژێر پەردەی موعەمماٰدا[٢]



## (٦)

## کە تۆفانی سروشکم کەوتە غەوغا

کـە تـۆفـانی سـروشکم کـەوتە غـەوغا
بە مەه ماهی گـوتی: «یـا حـافظ اللّـه»[٣]

ئــەمن عــەنقاترم بــۆچــی زەبــوونم
لەلام وەك قــافە بـاری تـەنکی ئـەسما

---



ڕووی بە نووسینی ڕەشی سەر کاغەز بە دەوری مۆردا کە ئەنرێ بە کاغەزەوە. (هەنگاوێ‌تر: ٦٦). پێویستە ئەوەش بڵێین مەبەست چ «موور» یا مۆر بێت، حـاجی ئـاماژە بـە چـیرۆکـی حەزرەتی سولەیمان لەگەڵ مێرووڵەدا دەکات، هەروەها باسی ئەنگوستیلەکەشی دەکات کە مۆریشی پێوە بووە].

١. فەرسوودە: هاڕدراو هیلاك. قەرین: هاوتا، هاوڕێ. [عەنقا: باڵندەیەکی خەیاڵییە، سیمورغ. ئیسمی بێ‌موسەمما: ناوی بێ‌خاوەن ناو].

٢. [خەدەنگ: تیر. دیققەت وردبوونەوە. قەسیم: هاوبەش. جەوهەری فەرد: بە بـچووکترین ماکێ کە لەو ئەم دنیا دروست بووە (جزء لایتجزیٰ) واتە: سـەرنج و وردبـوونەوەی حـاجی وەکوو جەوهەری فەرد وردە]. لە دەقی «گ. م» دا نووسراوە: «موسەممادا».

٣. سروشکم: فرمێسکم. غەوغا: هەراو هـۆریـا. [بـە بـۆچـوونی مـوحەممەدی مـەلاکـەریم «مەه» هەڵەیە و «ما» دروستە، چونکە حاجی ئەیەوێ بڵێ:کە فرمێسکم لافاوی کرد، لافاوەکە ئەوەندە زۆر بوو، ماسی کە لەناو ئاوا ئەژی و لە ئاو ناترسێ، پێی وتین: خودا بتانپارێزێ لەم ئاوە. ـهەمان سەرچاوە].

دەزانـــــن مـــن کــە بـــێدار و دیـــارم
سەگی مەجنوونم و غەمخواری لەیـلا[1]

لە دنیا هـەرکەسێ مـەقسوودی عـیشقە
بکـــا وەك مـــن بـە کـوللی تـەرکی دنـیا

کە دایهێنـا و هـەڵیـنـا چـاوی مـەستی
ڕەوان فـیدا دەکـەم دڵ چـاکـی هـێنـا[2]

فـــەلاتوون تـــۆ دەڵێی دنـــیا قـەدیمە؟!
لە خمخانەت بنێن وا خۆت لە خم نـا[3]

ئەدی بۆچی زەمینیش بۆتـە گـەردوون؟
لە سەیلی ئەشکی تـوندی بـێمـوحابا[4]

موسوڵمانان! سوخەن سەربەستە تاکەی؟
لە دەست ئەو کافری بـێدیـنی تـەرسا[5]

لە هەردوو لاوە زوڵفـی کـەوتە گـەردەن
نـە لەملا دەردەچـێ «حـاجی» نـە لەولا



١. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم نیوە دێڕە پشتمان بە دەقی «م. ڕ. س» بەست.

٢. [ڕەوان: گیان]. بۆ ساغکردنەوەی ئەم نیوە دێڕەش هەر پشتمان بە دەقی «م. ڕ. س» بەست.

٣. [فلاتوون: ئەفلاتوون، قەدیم: ئەزەلی. واتە: ئەفلاتوون تۆ ئەڵێی: دنیا قەدیمە و هەر بووە و هەر دەمێنێ. خم: دەفرێکی گـەورەیە لە قـوڕ دروست دەکـرێ کـە شـەراب یـا سـرکە یـا... تێدەکەن].

٤. ئەشك: فرمێسك، ئەسرین، ڕۆندك. [بێ موحابا: بێپەروا، نەترسانە، بێخۆشەویستی].

٥. تەرسا: دیان، گاور، مەسیحی. [سوخەن سەربەستە: قسەی بە پێچ و پەنا].

## (٧)

## دەخیلت بم وەرە ساقی[١]

دەخـــیلت بـــم وەرە ســـاقی «أدِرْ کَأْساً وَ نـــاوِلْها»
غـەم و غـوسسەی دڵم کـەم بـوو «ولی افـتاد مشکـل‌ها»

ئـومێدی مـیسکی مـوشکینم «صبا زان طـرّه بگشـاید»
کە چی نەمزانی بەم دەردە «چە خـون افـتاد در دل‌هـا!»[٢]

لە هیجرانی ئەتۆ بۆ من «چــه أمـن عـیش؟ چـون هـردم»
ئەجەل بانگمان دەکا زووکـەن «کـه بـربندید مـحمل‌ها»

بــڵێ بــمرە دەبــێ بــمری «گــرت پیر مـغان گـوید»
کـە چـونکە خـۆی خـەبەردارە «ز راه و رسـم مـنزل‌ها»

لە بەحری عیشق و بەحری مەوج و «گردابی چنین هائل»
بــــە هـــاواری دڵم نــاگــەن «ســبکبارانِ ســاحل‌ها»

لە ئەووەڵ عیشقی ون کـرد و «بـه بـدنامی کشـید آخـر»
چـلۆن پـەنهان دەبـێ سیرڕێ «کـزو سـازند مـحفل‌ها»

ئەگەر تۆ موخلیسی عـیشقی «ازو غـائب مشـو حـافظ»
کـــە «حـاجی» بـۆ سـەفەر بـڕوا «دَعِ الدُّنـیا وَ أَهْـمِلْها»[٣]

---

١. ئەمە تێهەڵکێشێکی حاجییە لەگەڵ شیعری «حافظی شیرازی». [تەرتیبی ئەم بەیتانەم بە گوێرەی دیوانی حافز ڕیزکردووە، تا لە باری ماناوە ڕێك بێت، ئیدی نازانم چۆن موحەممەدی مەلاکەریم و کاك سەردار و کەریم ئەم جێبەجێیەیان ئەنجام نەداوە!!].

٢. لە دەقی «گ. م»دا ئەم دەقە فارسییە بەمجۆرە هاتووە: «گر صبا زان طره بگشایه». بەڵام ئێمە لەسەر دەقی «م. ڕ. س» ڕاستمان کردەوە. شیعرە فارسییەکە خۆیشی هەر بەمجۆرەیە.

٣. لە دەقی «گ. م»دا ئەم ڕستە عەرەبییە بـەمجۆرە هـاتووە: «دعـی الدنـیا و أهـملها» لێرەدا «دعي» بۆ مێیینەیە و «أمهل»یش بۆ نێرینەیە، بۆیـە ڕاسـتە بـنووسرێ «دع الدنـیا و أهـملها»

## (٨)
## دڵ هیلاکی نازتە

دڵ هـــیلاکـــی نـــازتە بـــا غـــەمزە تـــەدبیری نـــەکـا
هەر دەبێ بـمرێ مـەگـەر خـەللاق تـەقدیری نـەکـا[1]

ئــەی قـــیامەت قـــامەتی «تـــووبا» قـیامم هـەستە تـا
داعیەی بەرزی لە گوڵشەن سـەروی کشـمیری نـەکـا[2]

من خـەوی ئـەو چـاوە عـەرزی ئـیبنوسیرینم دەکـرد
نووست و فەرمووی هیچکەسێ تەفسیر و تەعبیری نەکا[3]

مـــن لە ســـایەی ئـــەم دەرە نـارۆم هـەتا ڕۆژم نـەیێ
بـا بـە کـەیفی خـۆی بکـا بـەدکار و تـەقسیری نـەکـا

چونکە نرخی ماچی تۆی گۆڕی هەموو دەستەو دوعان
خەتتی نەوخێزت وەکوو زوڵفت خودا پیری نـەکـا[4]

---

☞

هەروەك لە شیعرەکەی «حافظ»یش‌دا هەروا هـاتووە و هـەر دوو فـرمانی داخـوازی «دع» و «أهمل» بۆ کەسی نێرن.

١. [موحەممەدی مەلا کەریم «خەللاقی» لە «خەللاق» پێ ڕاسترە، چونکە ئەگەر جـێناوی «ی» بۆ دڵ بڕواتەوە ماناکەی جوانتر دێتـەوە، سـەرەڕای ئـەوەی کـێشـەکـە ڕەوانـتر دەبـێ. ـهەنگاوێ‌تر: ٧٠].

٢. «تووبا»: ناوی درەختێکە لە بەهەشتدا. [واتە: ئەی خۆشەویستم! تو هەستە سەرخـۆت و باڵای بەرز و بڵندی خۆت دەرخەکە وەکوو داری تووبا وایە، با ئیتر سەروی کشمیری ئەوەندە لافی باڵابەرزی لێ نەدا].

٣. ئیبنوسیرین: زانایەکی ئیسلام بووە، لە لێکدانەوەی خەوندا بـەناوبانگ بـووە. [بـە بـڕوای موحەممەدی مەلاکەریم بۆ ئەوەی کێشی نیوە بەیتی دووهەم ڕێك‌وپێك بێت، پێویستە لەسەر وشەی «هیچ»دا سووکە وەستانێك بکرێت. ـهەنگاوێ‌تر: ٧٤].

٤. نەوخێز: تازە هەڵچوو.

پـێی بـڵێ بـادی سـەبا غـەم لێرە بـێ کـەس کـەوتووە
دڵ بوو غەمخواری ئـەمانە، لەحـزەیێ گـیری نـەکـا[١]

ناحەقە ئەو دەرحەقم کـەی دەیگـرێ مـیزانـی حـەق؟
کـاتبی ئـەعمال ئـەگـەر بـێت و تـەرەفگیری نـەکـا[٢]

غەیری دڵ ماوێژە کەس تـیرت لە ڕۆحـی مـن کـەوێ
تا بە جۆشی خوێنی «حاجی» سینە کـەوگیری نـەکـا[٣]



---

١. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «بایی صەبا».

٢. لە دەقی «گ. م»دا، «طەیی فیکری» نووسراوە، بـەڵام «تـەرەفگیری» ڕاسـتە، چـونکە بـە مانای «لایەنگیری» دێ و لەگەڵ تێکڕای مانای شیعرەکە جوان دەگونجێ [کاتبی ئەعمال: ئەو پەرییانەی کە کرداری مرۆڤ دەنووسن و لە سەرشانی ڕاست و چەپ دان. موحەممەدی مەلا کەریم لای وایە «ناحەقی» لە «ناحەق» باشترە، چونکە حاجی ئەیەوێ بڵێ: ئەگەر فریشتەی بنووسی کردەوەی مرۆ کە چاکە و خراپەی ئادەمیزاد لە دەفتەری کردەوە دەنووسێ و هەڵی ئەگرێ بۆ ڕۆژی قیامەت، لایەنگری ئەو نەکا و بە لای ئەویا نەشکێنێتەوە، ترازووی کێشانی حەق و ناحەق چۆن زوڵم و ناحەقی ئەو دەرحەق من ئەگرێتە خۆی؟ ـ هەنگاوێ‌تر: ٧٥].

٣. ماوێژە: مەهاویژە، مەهاوێ.

## (١)

## مەماتم حەیاتە

مـــەماتم حـــەیاتە، حـــەیاتم مـــەمات
کەلێم توند دەبێ ئەو دەمـی ئـیلتیفات[١]

لەبی «نـازەنین»ی بـە خـەتتی «جـەلی»
لە «ئـێران»ەوەی گـرتووە تـا «هـیرات»[٢]

«عــمر گــونبەتی» لەززەتــی داتــەپی
«تەکەڵتوو»ی شکا زینی ئەسپی حەیات[٣]

تــەماعم بــوو دونــیا و عــوقبا بـخۆم
ئەمم چوو لە دەست و ئەوم بۆ نەهات[٤]

لە غـوربەت بـە شـاهی لە بـیر نـاکرێ
زەمـــانی جـــوانـــی و یـــادی وڵات[٥]

---

١. سەرەتای ئەم هەڵبەستەمان لە سەر دەقی «م. ڕ. س» ڕاست کردەوە. [مەمات: مردن. حەیات: زیندوو بوون. ئیلتفات: ئاوڕ لێدانەوە و سەرنج دان].

٢. هیرات: ناوی شارێکە لە وڵاتی ئەفغانستان. [لەب: لێو، لێوار، لچ. خەت: هێڵ. جەلی: ڕووناك، دیار. «نازەنین، جەلی و ئێران» ناوی سێ گوندن لە ناوچەی خۆشناوەتی کە حاجی بە شێوەی ئیلتیفات ئاماژەی بۆیان کردووە. جا لەبەر ئەوەی حاجی ئەیەوێ لە وشەی ئێراندا تەوریە بکا، وا باشترە «ئیران» بنووسرێ تا «ئێران»، تا هەم مانای دێیەکە بدا و هەم مانای وڵاتی ئێران. ـهەنگاوێ‌تر: ٧٨.].

٣. «عمر گونبەت»: بە دوو مانا بەکار هاتووە: یەکەمیان بەو مانایە دێ کە پیر بووە و گونبەتی خۆشی تەمەنی داتەپیوە، لەم حاڵەدا وشەی «عمر» بە «عومر» دەخوێنرێتەوە. دووهەمیشیان بە مانای ناوی دێی «ئۆمەر گونبەت» دێیەکە کەوتۆتە خوارووی کۆیە. لەم حاڵەدا وشەکە «عومەر»ە. «تەکەڵتوو»: دیسان بە دوو مانا بەکار هاتووە، یەکەم: تەکەڵتووی زینی ئەسپی ژیانی خۆی و دووهەمیشیان: ناوی گوندێکە لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شاری کۆیە.

٤. عوقبا: قیامەت.

٥. زەمانی جوانی: سەردەمی جاحێڵی و لاوێتی.

له «قـوشخانه» وه تـا دەمـی «ئـیچقەڵا»
له «بایزاغه» وه تا مەحەللەی «قـەڵات»[1]

هـەموو خـزمی خـۆمـن دەزانـم دەڵێن:
له بێحورمەتیمان بوو «حاجی» هەڵات



## (٢)

## ماهی سەرچاوەی حەیاتم

ماهی سـەرچـاوەی حـەیاتم کـەوته بـەند و داوی شـەست
پشتی دەستی خۆم له حەیوانی و له بـێعـاری نـەگـەست[2]

کــامه لوقــمان کــەوته چــەنگی پــیری، دەسـتی بـانەدا
کامه ڕۆستەم تووشی بوو نەیخست و دەست و پێی نەبەست[3]

هــێنــده ســوورەت زۆر بــووه، مـەعنا لەبـەینا ون بـووه
ئێسـته کـێ بـێسـوورەت و مـەعنایه عـەیبی بتپـەرست[4]

---

١. قوشخانه و ئیچقەڵا و بایزاغه و قەڵات: چوار شوێن و گەڕەکن له شاری کۆیه، هەروەك له پێشەکییەکەدا مانامان لێدانەوه.

٢. له هەموو دەقە چاپ کراو و دەستنووسەکاندا سـەرەتای ئـەم غـەزەله بـه ١١ بـڕگـەیی و ناتەواوی هاتووه، کەچی ئێمە لەسەر دەقێکی مامۆستا مەسعوود موحەممەد وەکوو سەرەوه ڕاستمان کردەوه. وشەی «شەست» فارسییه به مانای قولاپی زولفی دێ.

٣. [موحەممەدی مەلا کەریم پاش ئەوەی له چاپی پێشووی ئـەم دیـوانـەدا وشـەی «قـۆڵی» لەبەیتی یەکەمدا، بەکاک سەردار وکاک کەریم گۆڕیوه و کردوویه به «دەستی»، ئێستا ئەڵێ: لام وایه «قۆڵی» باشتر بێت. ـ هەنگاوێتر: ٨٠].

٤. [واته: ئەوەنده بایەخدان به ڕواڵەت و زاهیر زۆر بووه، مەعنەویات له بەینا نەماوه، عەیبی بوتپەرست، زوو ئەوه بوو کە سەیری ڕواڵەتی ئەکرد و گوێی به مانا نـەئەدا، بـەڵام ئـێسـتا بوتپەرست ڕەخنەی لێناگیرێ چونکه هەر مەعنا نەماوه تا ئەو گوێی پێ نەدات].

غــەیری چــاوی نــووستووی بــێداری تــۆ نــەمدیتووە
بــۆ نــەزەرکردن بــەسیر و مــەردومی هــوشیار و مــەست[١]

زوڵفی بـۆ دەفـعی هـوجوومی لەشکـری سـوڵتـانی خـەت
کەوتە خـاك و سـەرکەشی دانـا وەکـوو عـەهدی «أَلَست»[٢]

بــا وجــوودی نــەوجوانــی خـەتی سـەوزی دەرکـەوێ
عـەهد و پـەیمانی نـەبوو مـوو بـۆیـە پشـتی پـێ نـەبەست

داوە مــــوویەکــــی بــە دونــیا و بــە «مــافیها» نــەدەی
«حاجی» گەر ئەحبابەکی جانی بە جـانیت کـەوتە دەست[٣]



## (٣)

## بە قسەی بێسەروپا تاڵی مەکە

بــە قسـەی بـێسـەروپا، تـاڵی مـەکـە لەززەتـی خـۆت
بــێ مــوبالات مــەسووتێنــە چـرای فـیکرەتی خـۆت

حـــاڵە نـــەقدینەیە، مــوستەقبەل و مــازی پــەشمە
بێ ئەمەل سەرفی مەکە سیم و زەڕی فـورسەتی خـۆت[٤]

---

١. [بەسیر = بصیر: دڵ ڕووناك. مـەردوم: خـەڵك، یـان مـەردۆمـەك و گـلێنـەی چـاو کـە لە عەرەبیشدا پێی ئەڵێن: ئینسان]. بێداری: هۆشیار، ئاگاداری.

٢. لە دەقی «گ. م»دا ئەم نیوە شیعرە بەمجۆرەیە: «کەوتە خـاك سـەرکـەوشی داوە وەکـوو عەهدی (ألست)». لەم دەقەشدا دەست بۆ ئەوە درێژ کراوە کە بە لەنگی چنگ کەوتووە.

٣. [داوە موویەك: تاڵە موویەکی لوول. «مافیها» ئەوەی لە نێو دنیایە. جانی بە جانی: گیانی بە گیانی، واتە ڕاست و بێ گەرد].

٤. [مازی = ماضی: ڕابردوو. حاڵ: ئێستا. موستەقبەل: داهاتوو ئەمەل: ئارەزوو هیوا. لە نێوان

ئـەی سـولەیمانی زەمـان! ئـاخری دەیگـێڕیـیەوە
بە حیکایەت وەکوو خۆت سەڵتەنەت و حیشمەتی خۆت[١]

مـن بـە پـەیغام و بـە قـاسید مـوتەسەللی نـابم
تـاکـوو بـانگم نـەکـەیە بـارەگـەهی حـەزرەتی خـۆت[٢]

وەرە ئـەی دڵ بـەسیە، بـیدە سـەگـانی دەری یـار
دڵەکەی کوتکوتی من یـا جگـەری لەت لەتـی خـۆت[٣]

زوڵفی سەد دەفعە گوتی: خـانە خـراب ڕووی مـەدەریێ!
حەیفە بەربادی مەکـە شـانی مـن و شـەوکەوتی خـۆت[٤]

بـۆچـی یـارانـی وەتـەن دڵ دەشکـێنـی «حـاجی»؟
«ظـاهراً» نـاچیەوە تـۆ، بـاسی مـەکـە غـوربەتی خـۆت





وشـەی «حـاڵ و مـوستەقبەل و مـازی و سـەرف»دا مـوراعـاتی نـەزیر هـەیە. وە لە وشـەی «سەرف»دا ئیهام هەیە، چونکە هەم بە مانای خەرجکردن و هەم بەمانای ئاڵوگۆڕی کردارەکان لە سێ زەمانی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوودا هاتووە.]

١. ئەم نیوە دێڕە شیعرەمان بە پێی دەقی «م. ڕ. س» نووسی.

٢. [قاسید = قاصید: نامەبەر]. پەیغام: پەیام، نامە. [موتەسەللی نابم: دڵم سوکنای بۆ نـایێ، ئۆقرە ناگرێ].

٣. لە دەقی «گ. م»دا لە جیاتی «کوت کوت»، «کون کون» نووسراوە.

٤. دیسان هەر لەدەقی «گ. م»دا لە جیاتی «سەد دەفعە»، «سەد کەڕەڕە» نووسراوە. بـەربادی مەکە: وێرانی مەکە، مەیفەوتێنە.

## (٤)

## جەبەرووتی کە شکا

جەبەرووتی کە شکا دڵ لە حوزووری مەلەکووت
هاتە ئەم عالەمی ناسووتە غەریبێکی نەسووت[1]

ناحەقە شەکوە لە بێ‌عەهدی و بێ‌پەروایی
کەی وەفاییێکی ئەدا کردووە؟ سەد دەفعە زمووت[2]

بە گوڵ و لالە بەهاری ڕوخی ڕازاوەتەوە؛
غایەتی کوێری وەرە هیچ نەبێ سەیری کە بە لووت[3]

وەکوو دەریایە نەسیمی سەحەری سەبزەیی گوڵ
پێکەوە مەوج و حوبابی دەهەژا و دەبزووت[4]

ئەشعەس و باقلی و حاتەم و گەر حەسسانە
دەوڵەتی تۆ بە فەنای نەفسە، سکوونت بە سکووت[5]

---

١. جەبەرووت: هێز و زەبر. [مەلەکووت: پاشا و میر، یان عالەمی ڕۆحانی. ناسووت: عالەمی ئینسانی و سروشت. ئاماژەیە بە چیرۆکی حەزرەتی ئادەم و دەرکرانی لە بەهەشت کە عالەمی مەلەکووت ڕۆحانییە و هاتنە سەرزەمین کە عالەمی ناسووتی و غەیرە ڕۆحانییە].

٢. شەکوە: سکاڵا کردن و شکایەت کردن. [بێ‌پەروا: بێ‌باك. زمووت: کورتکراوی «ئەزمووت»ە. واتە: تاقیت کردەوە ئەزموونت لێ‌وەرگرتووە]. ئەم نیوە دێڕە لە زۆرتری سەرچاوەکاندا بە لەنگی هاتووە.

٣. ئەم دێڕە شیعرەی سێهەم تەنها لە دەقی «م. ڕ. س»دا هاتووە.

٤. مەوج و حوباب: شەپۆل و بڵقی ئاو. [هەژان: شکاندنەوە: دەبزووت: دەجووڵایەوە].

٥. ئەشعەس: کوڕی قەیسی کوڕی مەعدی کەریبە، پاڵەوانێکی ئیسلام بووە. باقلی: پیاوێك بووە ناوبانگی بە گێلی و نەفامی دەرکردووە. حاتەم: مەبەستی لە حاتەمی تەیە کە بە بەخشندەیی بە ناوبانگ بووە. حەسسان: (حەسسان کوڕی سابت) کە شاعیری پێغەمبەر «د. خ» بووە.

هەرچی لەو لاوە نەیێ من لەوێ نایناسمەوە
ئەوی ناسیوتە مەئموورە بە ئەمری جەبەرووت

"نانی خۆی تاکوو بە تەندووری گەرم پێوەنەدا"
نارِوا «حاجی» ئەگەر چاوی دەرێنن بە بزووت![1]



١. ئەم غەزەلەمان بە شێوەیەکی گشتی لە دەقی «م. ڕ. س» وەرگرت چونکە لە دەقەکانی دیکەدا دێڕی سێهەم نییە و پێنجەمیش زۆر شێواوە. [نانی خۆدان بە تەنووری گەرمەوە: بریتییە لە کەڵکوەرگرتن لە هەل و دەرفەت. بزووت: چڵۆسك، دارێ کە سەرەکەی سووتابێ].

## (ا)

## ئەم ئاهووە[1]

ئەم ئـاهووە مـومکین نـییە نـەخجیری بـە تـەدبیر
هەڵ نـاغەڵەتـێ بـاوکە سـەگـی پـیرە لە تـەزویر[2]

چـاهی زەقـەنی مـەهلەکـە ئـەی دڵ بـە گـوریسی
ئەو زوڵفە ئەگەر سیلسیلەیە خۆت مەخە نێو بـیر[3]

ئــەی بــادی سـەبا مـن ببە سـوودی نـییە نـامە
تەشریحی زەعـیفی مـن و غـەم نـایەتە تـەحریر[4]

جەیشی حەبەشی زوڵفی لەگەڵ خەتتی بە شەڕ هات
سـۆفـی دڵی بـێچـارە لە بـەرپێ بـووە هـەنجیر[5]

بەم موهری سولەیمانی زەمان هەروەکوو خورشید
دونــیا بگــرە بـێمـەدەدی خـەنجەر و شـەمشیر

بــێدیــتن و بــێواســیتە چــاتر لە مــن و تــۆ
هیچکەس نییە نەیناسێ ئەگەر شـێتـە ئـەگـەر ژیـر

---

١. ئەم غەزەلەمان لە دەستنووسی «م. ڕ. س» وەرگرت چونکە لە دەقی «گ. م»دا تەنها چوار دێڕە، کەچی لێرەدا هەر حەوت دێڕی غەزەلەکە تەواوە.

٢. ئاهوو: مامز، ئاسك. نەخجیر: نێچیر. [تەزویر: فریودان، فێڵبازی].

٣. چاهی زەقەنی: چاڵی چەناکەی. مەهلەك: جێگەی بە هیلاك چوون و مردن. [سیلسیلە: زنجیر].

٤. تەحریر: نووسین.

٥. [جەیشی حەبەشی: لەشکر و سپای حەبەشی واتە: ڕەش. مەبەست دەستە مووی ڕەشی زوڵفیە. سۆفی دڵ: دڵ ناسك لە دیتنی ژنی نامەحرەمدا، کینایەیە لەوەکە وەکوو چۆن سۆفی لە دیتنی ژنی جوانی نامەحرەمدا تێك دەچێ، هەروا دڵی منیش حاڵی لە دیتنی ئەودا تێك چووە].

بێمیننەتە گەر خوانی وەلی نیعمەتی «حاجی»
ئەم شێخە چییە؟ "قونچکی پیوازە، سەری سیر"[١]



## (٢)

## دەستگیریت لە عەمەلدا کە نەکا

دەستگیریت لە عەمەلدا کە نەکا مورشیدی پیر
دەستی تۆی گرتووە، پێی بەستووی مانەندی ئەسیر[٢]

ڕیشی وەك شیرە بەشیرت، ئەوە جەللادی ئەجەل
قۆلی ماڵیوەتەوە، دەستی لە تۆ داوەتە شیر[٣]

ئەو دەمی هاتمە سەر شەکوە لە خزم و کەسی خۆم
ڕۆستەم و یووسفی گوڵپیرەهەنم کەوتەوە بیر[٤]

مار و ماسین دەبنە ئەژدەری سەحرا و نەهەنگ
دەستوپای بێسەروپای زاڵمە دەیکەن بە وەزیر[٥]

---

١. دەقی ئەم دێڕە شیعرەمان لە سەر دەقی «م. م» ڕاست کردەوە. [وەلی نیعمەت: سەرپەرشت، مشوورخۆر. قونچکی پیواز و سەری سیر: کنایەیە لە هیچکارە بوون].

٢. [مانەند: چەشن، وەك، وێنە] لە دەقەکانی «م. ڕ. س» و «گ. م»دا ئەم وشەیە «دەستگیرت» نووسراوە کەچی ئێمە لە سەر دەقی «م. م» ڕاستمان کردەوە و کردمانە «دەستگیریت».

٣. [بەشیر: مزگێنیدەر. شیر: شمشێر]. ئیشارەتە بۆ حەدیسی پێغەمبەر «د.خ» کە فەرموویەتی: «رسولُ الْمَوْتِ الشَّيبُ».

٤. [شەکوە: گازندە، گلەیی]. پیرەهەن: پیراهەن، کراس، مەبەستی لە کراسەکەی حەزرەتی یووسفە کە بۆ یەعقووبی باوکی نارد و بۆنی کرد چاوە نابیناکانی ڕوون بوونەوە.

٥. ئەژدەر: ئەژدیها. دەستوپا: دەستوپێ، خزمەتکار، نۆکەر. [بێسەروپا: لات، سەرسەری، خوێڕی].

چوومە پـارێزی، کـە مـوژگان و بـرۆم دی لە کـەمین
تیری من بوو بـە کـەمان، پشـتی کـەمانم بـووە تـیر[1]

خــــەفییە نــایەتە لای ئــێمــە لە تــاریکی شــەوا
ڕۆژی ڕوونـــاکــە دەتــرسێ لە عــەوام و لە گــزیر[2]

«حاجی» وەك دڵ تۆ بە گـریە بـە شـوێنـی مـەکـەوە
ئــاسکێکــە بــە بــەزین و بــە هـەرا نـایەتە گـیرا[3]



١. لە دەقی «گ. م»دا نووسراوە: «کە مـوژگانی بـرۆم دی» بـەڵام ئـێمـە لەسـەر دەقـی «م.م» ڕاستمان کردەوە و کردمان بە «موژگان و برۆ». [پارێز: کەمین، خۆحەشاردان، چوونە پـارێز: خۆداگرتن و مڵاس بردنەوە].

٢. [خەفی: ئـەوی خـۆی بشـارێتـەوە. عـەوام: خـەڵکـی ڕەمـەکـی و ئـاسایی. گـزیر: پـیاوی بەردەستی خان و کوێخا].

٣. ئەم نیوە دێڕەشمان هەر لە سەر دەقی «م.م» ڕاست کردەوە. [بەزین: غاردان و ڕاونان].

## (ا)

## وشکە سۆفی

وشکە سۆفی! بڵێ بە شێخی تەرەس
با بە سەرما نەیێ میسالی هەرەس![1]

عەجەبا! شاعیری نەناسیوە
شێر و عەنقا دەکاتە موور و مەگەس[2]

کەر نەبێ! کام پیاوی پێ غەڵەتا،
بەن گرێدان و تا بڕین و نەفەس[3]

فەرقی ناکەس لەگەڵ سەگان ناکەم،
ها! بە عەکسی بخوێنەوە «ناکەس»[4]

حەزدەکەی تێبگەی لە بێدینی
بیە دەروێشی شێخەکان بە هەوەس

---

١. [تەرەس: زلی بێهونەر، ناشرینی خوێڕی، ئەم وشەیە بۆ جنێودان بەکار دێ. سەرما: لێرەدا بە دوو مانا هاتووە؛ یەکەم: بانەیێت بە سەرماندا، دووەم: سەرما و کرێوە].
٢. ئەم بەیتە لە دەستنووسەکانی لای مندا هەبوو لە کاتی سەرپەرشتی کردنی چاپدا تۆمارم کرد، «موحەممەدی مەلاکەریم».
٣. تا بڕین: جۆرە نوشتەیەکە بۆ نەخۆش دەنووسرێ تاکوو لەرزوتا بەری بدا. [بەن گرێدان: ئەو تاڵە دەزووەی کە دوعانووس گرێی دەدا و فووی پێدا دەکا. کەر نەبێ: هەڵدەگرێ «کەر نەبی» بێت و مەبەستی شێخ نەبی بێت کە حاجی زۆر ڕقی لێی بووە و لە هەندێ لە شیعرەکانیدا بە ڕاشکاوی جنێوی پێداوە].
٤. [واتە: ئەگەر وشەی «ناکەس» پێچەوانە بکەیتەوە دەبێتە «سەگان»، سائەمنیش جیاوازییەکی وەها لە نێوان ئەم دوو وشەیەدا نابینم، لە نووسینی کوردی کۆندا کاف و گاف وەك یەك نووسراون].

هــەر زەمــانێ کــە گــوێت زریــنگاوە،
پێت دەڵێ: باری خۆت ببەستە جەرەس[1]

چــەند پــوولێ ئــەگــەر بــهێنــی ئــەتۆ
قەسرت خۆشتر دەبێ لە ئی هەر کەس[2]

بۆچی «حاجی» نەخوێنــێ وەك تــووتی
ئــەم زوبــانە هــەزرای خســتە قــەفەس[3]



## (۲)

## دەستی من دامێنی تۆ[4]

دەستی من دامێنی تــۆ ئــەی خــامەیی مــوشکین نــەفەس
بــا بــنووسین مــاجەرای هــیجرانــی یــاری بــولهەوەس[5]

دەنگی مــورغی دڵ دەیــێ هــەردەم لە داوی زوڵفــی ئــەو
وەك لە تــاری عــەنکەبووتا زیــڕەیــی بــاڵی مــەگــەس

---

۱. [جەرەس: زەنگ. واتە: زەنگی گوێت پەیغامی کۆچت پێ دەدا].

۲. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە هەندێ دەقدا بەمجۆرە هاتووە: قەسرەکەت خۆشترە لە هی هەر کەس.

۳. هەزار: بە هــەردوو مــەعنای ژمــارە و بــولبولیشە. دەقــی ئــەم نــیوە دێڕەش لەلای «گ. م» بەمجۆرە هاتووە: «ئەم زەمانە هوزار دەخاتە قەفەس».

٤. ئەم پارچە هەڵبەستە لە هیچ سەرچاوەیەکی چــاپکراو و دەســتنووسدا نــەهاتووە، تــاکــوو مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی بۆ یەکەم جار لە گۆڤــاری «بــەیان»ی ژمــارەی (٥٥)ی ساڵی ۱۹۷۹دا بڵاوی کردەوە و ئێمەش وا بۆ یەکەم جار لە پاڵ شــیعرەکــانی دیــوانــەکــەیدا پەخشی دەکەین و دڵنیاین کە شیعری حاجی قادرە.

٥. [خامە: پێنووس، قەڵەم. موشکین نەفەس: بۆنی وەکوو بۆنی میسك، بۆنــخۆش. مــاجەرا: چیرۆك. بولهەوەس: کورتکراوی «أبوالهوس»ە واتە: زۆر بەحەز و شەهوەت].

ئەی خودا چ بکەم؟ ئەجەل لەملاوە قەسدی جانیە
دڵبەریش ناردوویەتی: جان ماڵمە نەیدا بەکەس!

تووتی هات و ئیدعای شەککەر فشانی تۆ بکا
حەققی ئەو دوو لێوە گرتی هات و کەوتە نێو قەفەس[1]

تۆ دەزانی خۆ هەتیویت سەبر بێ «حاجی» نییە
بۆچی مەنعی لێ دەکەی؟!گەووادی بێ دین، هەی تەرەس![2]



١. شەککەر فشان: شەکر پەخش کردن، شەکر بڵاوکردنەوە. [حەققی ئەو دوو... واتە: تووتی لە تۆڵەی ئەو ئیدعا درۆیینە کە کردی، حەققی لێوی تۆ گرتی و کەوتە ناو قەفەس، یانی: تووتی کە بە شەککەر فشانی مەشهوورە، قەت ناگات بە دوو لێوی شەکرینی تۆ].
٢. هەر لە دەقەکەی لای مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغیدا مانای ئەم نیوە دێڕە شیعرە بە ناڕێکی هاتووە. [گەوواد: بێناموس، ناموس فرۆش].

## (ا)

## تابلێی فەرقی هەیە

تابلێی فـەرقی هـەیە مـیهری مـن و مـاهی فـەلەك
لە «سەرا» تا بە «سورەییا» لە «سەما» تا بە «سەمەك»[1]

هەر کە لای کردەوە عـوقدەی سـەری زوڵفـی لادا
لە هەموو لاوە سەدای «صَـلِّ عـلیٰ» گـەییە مـەلەك

گوێ لە واعیز مەکە ئەمشەو تەك و تـەنها وەرە لام
ڕۆژی مەحشەر بەمەگەر بمخەنە دۆزەخ بە دەرەك[2]

کوت کوت و تیکە بە تیکەم بکەن و بمدەنە سەگ
جـێگـەمە لەم دەرە نـاڕۆم بـە جـنێو و بـە کـوتەك

خالیسە سیککەیی ئیخلاسی دڵی مـوخلیسی مـن
بیخە نێو بۆتە چ حاجەت بەمە بیدەی لە مـەحەك[3]

ئەی مەهی چاردە سەیری مـەهی دوو هـەفتە بکـە
وەك منی دابـنێ چـاوی مـن و تـۆ نـاگـەنە یـەك[4]

---

١. میهر: ڕۆژ، خۆر. ماه: مانگ. ماهی فەلەك: مانگی ئاسمان. سـەرا «الثریٰ»: خـاك، عـارد. سورەییا «الثریا»: کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ (پـێروو). [سـەما: ئـاسمان. سـەمەك: مـەبەست ئـەو ماسییەیە کە عورەفای قەدیم پێیان وابوو دنیا لە سەر پشتی گایە و گـا کـەش لە سـەر پشـتی ماسییە].

٢. بەدەرەك: چش. «الدرك»: «الدرك الاسفل منَ النار»: جێگایەکە لە قووڵاییی جەهەننەمدا.

٣. [خـالیس، ئـیخلاس، مـوخلیس = خـالیص، ئـیخلاص، مـوخلیص]. لە دەقـی «گ. م»دا نووسراوە: «سککەیی خالیس ئیخلاسی دڵی موخلیسی من». بۆتە: دەفرێکە، یاخود جامێکی پتەوی ئەستوورە زێڕو زیوی تێدا دەتوێنرێتەوە. لە دەقی «ع. ن. م»دا نووسراوە «مـەیخە نـێو بۆتە».

٤. ئەم دێڕە شیعرە تەنها لە دەقی «م. ڕ. س»دا هاتووە.

له نــوقووشی غــه‌زه‌لم چــین و خــه‌تا دامــاون
کێ ده‌ڵێ ئه‌متیعه‌یی کورده کــه‌ڵاش و کــه‌په‌نه‌ك؟![١]

بۆ ته‌ماشای به‌له‌ك و زه‌ندی سپی و چـاوی بـه‌ڵه‌ك
نیشتووه له‌م ده‌ره عـاشق وه‌کـوو حـاجی‌له‌ك‌له‌ك[٢]



(٢)

## له گاوان و شوانی کورده‌کان یه‌ك

له گـــاوان و شـــوانـــی کـــورده‌کـــان یـــه‌ك
بـه‌سه بـۆ له‌شکـری سـه‌د کـه‌ڕڕه دوو له‌ك[٣]

فـــیدای جـــووتیارتان بـــێ حـــاته‌می تـه‌ی
بـــه قـــوربانی ســـه‌پانتان ئـــالی بـــه‌رمه‌ك[٤]

---

١. [چین و خه‌تا: ئه‌و وڵاته‌ی که به نه‌خش و نیگار کێشان به‌ناوبانگه. ئه‌متیعه، کـۆی مـه‌تاع: شت‌ومه‌کی کڕین و فرۆشتن، کاڵا. که‌په‌نه‌ك: فه‌رنجی، په‌سته‌ك].

٢. له هه‌ندێ ده‌قدا له جیاتی «به‌له‌ك» «که‌مه‌ر»، وه له جیاتی «زه‌ندی»: «کـوڵمـی» هـاتووه. [به‌له‌ك: پووز. زه‌ند: نێوان ئه‌نیشك و مه‌چه‌ك. چاوبه‌ڵه‌ك: چاو ڕه‌شی سپی پێست]. له‌ك‌له‌ك: به دوو مه‌عنا هاتووه: یه‌که‌میان به مانای حاجی له‌ك‌له‌که و دووهه‌میشیان: خانه‌یه‌کی ژماره‌ییه و ده‌کاته سه‌دهه‌زار.

٣. دوو له‌ك: له دوو وشه پێك‌هاتووه، دوو له‌گه‌ڵ «له‌ك». «له‌ك»یش وه‌ك له‌مه‌وبه‌ر گوتمان به مانای «سه‌دهه‌زار» دێ، که‌واته دوو له‌ك ده‌کاته دوو سه‌د هه‌زار.

٤. له ده‌قی «مصطفی صائب»دا ئه‌م نیوه دێڕه شیعره به‌م‌جۆره‌یه که لێره تۆمارمان کـردووه. بڕوانه: موحه‌ممه‌د عه‌لی قه‌ره‌داغی، «هه‌نگاوێکی‌تر بۆ ڕاستکردنه‌وه‌ی شیعره‌کانی حاجی قادری کۆیی»، گۆڤاری «به‌یان»ی ژماره‌ی (٦٦)ی ساڵی ١٩٨٠. له‌گه‌ڵ ده‌قی‌تردا: «به فیدایی شوانتان حاته‌می ته‌ی» هاتووه. هه‌روه‌ها دێڕی دووهه‌م له ده‌قی «گ.م»دا به‌م‌جۆره‌ی خواره‌وه هاتووه:

مـــریشکی ئـێوە سـەییادی شـەهێنـە
لە کـن عـەنقا فـڕووجـە حـاجی‌لەك‌لەك

شـوانـی مـێگـەلی کـوردان لە شـەڕدا
وەکوو قەسسابە، دوشمن مێگـەلی شـەك[1]

لە بـــەر حـــیزە بـخۆیـی و نـاتەبایی
لە ژێری حـیزی حـیزان بـووینە دۆشـەك[2]

هەتا وەك "ئـاگـری بـن کـا"ن لەگـەڵ یـەك
ئەگەر تۆفان بـێ لەشکـرتان بـە پـووشەك[3]

---



«فیدای گاوان و شوانتان حاتەمی تەی
بە قوربانی سوپاتان ئالی بەرمەك»

[سەپان: بەو وەرزێرانە ئەڵێن کە زەوی هەڵدەگرن بە دە یەك یان پێنج یەك. ئالی بەرمەك: بنەماڵەیەکی فارسن کە لە سەردەمی عەباسیەکاندا پلەی وەزارەتیان لە ژێر دەستدا بووە و بە ناوبانگن بە دەست و دڵبازی، یەکێکیان «خالید کوڕی بەرمەکە» کە وەزیری هارووونە ڕەشید بووە. ـ«الأعلام للزركلي، خالد برمك»: ٢/٢٩٥.].

١. لە دەقی «مصطفی صائب»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە: «وەکوو قەسسابە، دوشمنی نێرە، گەل شەك». بڕوانە «م.ع. ق»، سەرچاوەی پێشوو.

[موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: لام وایە وشەی «نێرگەل» لە «مێگەل» پەسەندترە و ئەبوو منیش تێکستەی شارەزا و میرانم بەمجۆرە بگۆڕیایە؛ چونکە بەرانبەرکێ پێ کردنێکی جوانی «مێگەل» و «نێرگەل»ی پێ دێتە دی لە بەیتەکەدا و شەڕکەریش دوژمنی ئەکوژێ و شەکە نێریش بۆ سەربڕین ڕائەگیرێ. ـهەنگاوێ‌تر: ٩٥. مامۆستا موحەممەد بۆیە چووەتە سەر ئەم باوەڕە؛ چونکە وشەی شەك بۆ بەرخی نێری دوو سالان بەکار دێ و وشەی «مێگەلی» لەگەڵدا ناجۆرە].

٢. ئەم دێڕە شیعرەی پێنجەم لە دەقی «گ.م»دا نییە و لە کۆمەڵەی «ع.س» و دەستنووسەکەی «م.ر.س» هاتووە.

٣. لە دەقی «ع.س»دا «ژێر کا» هاتووە و لە دەقی «گ.م»یشدا «نێو کا» نووسراوە. بەڵام ئێمە لەسەر دەقی «م.ر.س»مان نووسی چونکە باشتر لەگەڵ زمانی شیعری حاجی دەگونجێت.

"لە گـوێی گـا نـوستوون" بـۆیـێکـە ڕێوی
لەسـەر ئـێوە وەهـا شـێرگـیرە وەك سـەگ[1]

سـەلاحی ئـێوە ئـێستاکـە سـیلاحە
تەماعی گـەورەیی بـێ چـەك نـەکـەن نـەك

کـراوە ئـینتخابی وشکـە سـۆفـی
لە دیـوانـی کـەری بـێنـوقتەیی "شـەك"[2]



١. شێرگیر: ئەوەی شێر دەگرێت، کینایەتە لە تـووڕەیـی و هـەڵچـوون. لە واتـای ئـازایـیەوە هاتووە.

٢. مەبەستی لە «کەری بێنوقتەیی شەك» ئەوەیە، نوختەکەی سەر پیتی شینەکـەی «شـەك» هەڵگیرێ وشەکە دەبێتە «سەك = سەگ».

## (l)

## جیهان! بوویته جەزیرە

جیهان! بوویتە جەزیرەی بەحری گریەم
بەبێ بوهتان ئەتۆ زین و ئەمن مەم[١]

لە جینسی ئادەمی وەك تۆ نەزاوە
پەری ڕوویەك لە ئادەم تا بە خاتەم

ئەمن شێخم، سەرم شاخە، هەناسەم
نەسیمە، دیدە کانی، مێزەرم تەم[٢]

دەڵێن: مەعشووقە دێتە سەر سەرینم
دەزانم وا نییە، «وَ اللّٰهُ أَعلم»[٣]

لەبی زەحاکی فەرمووی ماری زۆلفم
جەمی کەللەی کەیە، مووچەی سەری جەم[٤]

---

١. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «جیهان بۆتە». لە دەقی «م.ر.س»دا وەکوو ناو ئەم هەڵبەستە نووسراوە و لە دەقی «گ.م»یشدا نووسراوە «بەحری ئەکرەم» و لە دەقی «ع.م.ن»دا نووسراوە: «بەحری پڕ غەم».

٢. ئەم تێکستەمان لە دەستنووسێکی ڕۆستەم حەوێزی وەرگرتووە. لە دەقەکانیتردا «ئەمن کێوم، کەلەم شاخە» هاتووە. مانای ئەم دێڕە بەمجۆرەیە و دەڵێ: «من شێخم و کەللەی سەرم شاخی ڕەقە و هەناسەم بای نەسیمە و چاوەکانم «کانی»یە و تەم و مژی لووتکەی چیاش مێزەری سپی منە».

٣. ئەم بەیتە لە دەستنووسی مەلا ڕەسووڵی توربەییدا هەبوو کە فۆتۆیەکی لای موحەممەد عەلی قەرەداغییە. «موحەممەدی مەلاکەریم».

٤. لە دەقی «گ.م»دا «ماری زوڵفی» نووسراوە. [لەب: لێو. زەحاك: ئاماژەیە بە چیرۆکی زەحاکی زاڵم کە وا مەشهوورە لە شارەزووردا پاشا بووە و لەسەر شانی (بە پێی ئەوەی کە لە شانامەی فیردەوسیدا هەیە) دوو مار ڕواوە کە خواردنیان مێشکی سەر بووە، بەم بۆنەوە هەموو ڕۆژێ لاوێکیان بۆ سەر بڕیون و مێشکەکەیان داونەتێ تا لە ئاکامدا بە دەستی کاوەی

مەڵێ کەززابە سۆفی، ساغە واعیز
لەلای من وەك یەکن بێ کەیف و بێ کەم[١]

موریدی سادیق و شێخی کەرامەت
حەریسی قانیعە و عوششاقی بێ غەم

سەوادی ئەعزەمی «قوستەنتەنییە»
گەلێ بێ ناوی کردە سەدری ئەعزەم[٢]

بە دەستوور و بە قانوون و نیزامی
خودا وای کرد کە سووری کرد بە ماتەم[٣]

کورانی دوو هەوێن دنیا و عوقبا
میسالی داکیانن ئەو لەگەڵ ئەم[٤]

---



ئاسنگەر دەکوژرێ. یان مەبەست لە زەححاك: لێوی دەم بەبزەیە. «جەم»ی یەکەم: ژەم وادەی نان خواردن. «جەم»ی دووەم: جەمشید پاشای کۆنی ئێران. کەی: مەبەست زنجیرە شاهانی کیانییە (کەی قوباد و کەی خەسرەو و کەی کاوس و...) مووچە: جیرە، بەش].

١. [کەززاب: هەرە درۆزن. واعیز: وتاربێژ]. بێ کەیف و بێ کەم: بێ چۆنیەتی و بێ چەندی.

٢. [سەوادی ئەعزەم: زۆرینەی خەڵك کە وەك ڕەشایی ئەنوێنێ. وەرگیراوە لە حەدیسێکی پێغەمبەر (د.خ) کە ئەفەرموێ: علیکم بالسواد الأعظم: لەسەرتانە پەیڕەوی لە زۆرینەی موسڵمانانەوە بکەن]. لە دەقەکانی «ع.س» و «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە: «گەلێ بەدناوی کرد ئەو سەدری ئەعزەم».

٣. سوور: [وشەیەکی فارسییە بە مانای جەژن و میوانییش بەکار دێ. بەڵام] لێرەدا بە مانای شادی و خۆشییە. ماتەم: شین، شیوەن. مەبەستی ئەوەیە بڵێ: شادی بوو بە شین... لەدەقی «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە: «خودا دایناوە سووری بوو بە ماتەم» لە دەقی «ع.س»یشدا بەمجۆرەیە: «خوا وای یاوە سووری بوو بە ماتەم».

٤. [هەوێ: ژنانی یەك مێرد دەبنە هەوێی یەکتر کە زۆربەی ئەم هەوێیانە پێکەوە هەڵناکەن، واتە: دنیا و ئاخیرەت ئاوەهان]. ئەم نیوە دێڕە لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرەیە: «مناڵی دایکیانن ئەو لەگەڵ ئەم».

بــه یــەك نــاچن ڕەقـیب و «حــاجی» قــادر
خودایا! ئەو ڕەزیـل کـە و ئـەم مـوکەڕڕەم[١]



## (٢)

## وەها مەشغووڵی تۆیە

وەها مەشغووڵی تۆیە جیسم و جانم
بە ڕۆحکێشانی خۆم زەحمەت بزانم[٢]

ڕەقیب و سەگ چ لازم تا ئەمن هەم؟
بە ڕۆژێ دەرگەوان، شەو پاسەوانـم[٣]

میسالی ڕۆنـی زەیت و مـێوی شـانە
گەلێ زاهیر بـوو سـووتانی نـیهانیم[٤]

پــەرێشـــانی دڵ و جــەمعی ڕەقــیبە
لە سەودای زوڵفی تۆ سوود و زیـانم

بــڵێن: قـــادرا دەڵێم: نـــاوم حـەبیبە
بـــە زیکـری ئـێوە وا فـێرە زوبـانم[٥]

---

١. ئەم نیوە دێڕە لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «خوایا ئەم ڕەزیلە، ئەو موکەڕڕەم».
٢. لە دەقی «گ.م»دا «جیسم و گیانم» هاتووە، بەڵام لە دەقەکانی دیکەدا هەر «جیسم و جانم» نووسراوە، چونکە کێشی سووکترە.
٣. [ڕەقیب بۆ دوو مانا بەکار ئەهێنرێت: یەکەم: ململانێ‌کەر و ئەوکەسەی واکێبەرکێ لەگەڵ کەسێکی تر بکات. دووهەم: چاودێر، دەرگاوان و ئێشکچی. واتە: ئەگەر تۆ منت ببێ هەمکاری سەگت -کە پاسەوانییە بە شەودا- بۆ ئەکەم و هەمکاری دەرگاوانی -کە چاودێرییە بە ڕۆژا-].
٤. [موحەممەدی مەلاکەریم دەڵێ کە «وەها مەعلوومە» باشترە لە «گـەلێ زاهـیر بـوو»، وە ئەڵێ: بەرانبەرکێی «زاهیر» و «نیهان» منی بە هەڵە بردووە. -هەنگاوێ‌تر: ١٠٢].
٥. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە «وافێری زمانم».

ئـەوی شـاعیر نـەبێ کـۆرە وجـاغی
لە سایەی شیعرەکـان بـابی کـوڕانـم

مەڵێن: بێ‌کارە بوو «حاجی» لە ڕۆمـا
ئـــەمن پـیاوم لە نـێو شـاری ژنـانم[1]



## (٣)

## وەکوو ڕۆژ و شەوە

وەکـــوو ڕۆژ و شـەوە فـەرقی گـودازی شـەمع و سـووتانم
کە ئەو هەر شەو دەسووتێ من هەموو دەم گەرچی ئینسانم[2]

بە تەخمین، وەسفی فیردەوس و جەهەننەم بۆچ دەکا واعیز؟
لە سایەی وەسڵ و هیجرانت بە خـۆم دیـتوومە، دەیـزانـم[3]

لە سـیرڕی حـیکمەتی چـاوت گـەیشتم بـاعیسی ڕووحـە
تەبەسسوم ماوە، تـێ‌نـاگـەم لە فـەهمی ڕەمـزی حـەیرانـم

کـــزەی جـــەرگم دەخـــیلت‌بم، فـیراقـم کـرد، ئـەوا مـردم
دەســا دەی بــێرە لام ســاتێ نـــەماوە تــابی هـیجرانـم[4]

ئـەبوو زەیـدی دەکـا ڕۆحـم لەگـەڵ مـاچی دەمت ئـەمما
دەتـــرسێم وەك نـــیشانم دا بــڵێ: هــیچە و پــەشیمانم

---

١. ئەم دوو دێڕە شیعرەی شەشەم و حەوتەم بێ مـنداڵی حـاجی دەگـەیەنێ و دەڵێ: کـە لە سایەی شیعرەکان بابی کوڕانم و دێڕی حەوتەمیش هەر مەسەلەی بێ‌ژنی و بێ‌منداڵی حاجی دەگرێتەوە.
٢. گودازی شەمع: سووتانی مۆم.
٣. [تەخمین: گۆترە و قەرساندن]. فیردەوس: بەهەشت.
٤. [تابی هیجران: تاقەتی دووری]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی وشـەی «هـیجرانـم» وشـەی «حەیرانم» هاتووە.

که دوونێ هاتی فەرمووت بێ و نەهاتم، مەسڵەحەت وابوو
ئەوێسته چاوەکەی مـن چـیدەفەرمووی؟ بـەنده فـەرمانم[1]

ئــەگــەر بــەغدا شکــا سـەددی نـەما داری لەسـەر بـەردی
له دەجــلەی نــاگــرن «حــاجی» دیـاره جـۆشـی گـریانم



## (٤)

## بەشەستی زوڵف و ڕووی ماهی

بەشەستی زوڵف و ڕووی ماهی وەکوو ماهی گـرفتارم
گەهێ دڵگەستەیی مارم، گەهێ گیان خـەستەیی نـارم[2]

سەگی دەرگات و مەجنوون و نجوومی ئاسمان یەکسەر
مەگەر هەر خۆت بزانی چۆن گەواهن من کـه بـێدارم[3]

به یادی نەخلی باڵات ئاو له چاوما بێقسوور هەردەم
دەجــۆشـێ، غـایەتی دوورم دەزانــی مـن وەفـادارم[4]

---

١. [دوونێ: دوێنێ، به شیۆه ئاخاوتنی کۆیه] دیسـانەوه له دەقـی «گ.م»دا له جـیاتی «چـی» وشەی «هەر» هاتووه.

٢. شەستی زوڵف: قولاپی زوڵف، مـەبەستی له هـەڵگـەڕانـەوەی تـاڵەکـانی زوڵفـه. [مـاهی یەکەم:] ماه، مانگ. مانگی دووهەم: ماسی، یان مانگی، وەکوو مانگی. دەقی ئەم نیوه دێڕەی دووهەممان له سەر گۆڤاری «ر. کوردستان» ڕا ست کردەوه.

٣. ئەم نیوه دێڕەشمان له سەر دەقی «ر. کوردستان» ڕاست کردەوه، دەنا له سەرچـاوەکـانی دیکەدا نووسراوه: «سەگی دەرگات و مەجنوونی و نجوومی ئـاسمان یـەکسـەر». گـەواهـن: شاهیدن.

٤. [نەخل: داری خورما. بێقسوور: بێبڕانەوه و کەم و کووڕی. غـایەت: ئـەوپەڕ]. له دەقـی «گ.م»دا نووسراوه: «سەروی باڵات».

لە بەحر و بێشە و سەحرا، نەهەنگ و زەیغەم و ڕووبا
وەکوو سەگ هەڵدەیێن ئێستا لە ئاه و ناڵەیی زارم[١]

ئەمیش جاران نییە قوربان! توفەیلی بێمە سەر خوانت
خەتت میهمانییە ئەمساڵ نەماوە لەززەتی پارم[٢]

بە گریانی ڕیا واعیز بەسەرما هات و نەیزانی
کەوا من ئاشنام ناگاتە قاپیم مەستی هۆشیارم

عیراقی بێنەوان، مەشرەب موخالیف، وەك سەبا هەستە
مەقامی ڕاستی «حاجی» حیجازە گەر دەچێ یارم[٣]



## (٥)

## دوو سەد گوناهی هەیە[٤]

دوو سەد گوناهی هەیە خەڵق با وجوودی کەریم
ئەمی کە داویە دەیدا چ ڕازیقێکە کەریم![٥]

---

١. زەیغەم: «الضیغم» شێر. ڕووبا: «روباه»، ڕێوی. ئەم دێڕە شیعرەمان لە سەر دەقی «م.ر.س» تۆمار کرد.

٢. [توفەیلی = طفیلی: بەو میوانە دەڵێن کە بەبێ بانگهێشت دەڕوا بۆ ماڵی خەڵکی. خوان: سفرە]. میهمانییە، میهمان: میوان.

٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی: «حیجازە» وشەی «کۆیە» نووسراوە. [بێنەوا: هەژار و داماو. مەشرەب موخالیف: تەبیعەت جیاواز و یەك‌نەگر]. مەبەستی حاجی لە ناوهێنانی «سەبا» و «ڕاست» و «حیجاز» باس‌کردنی ناوی مەقامەکانە، نەك مەبەستی لە «مەقام»، «مەکان»بێ و لە جیاتی بڵێ: جێگەی ڕاستی حیجازە یان کۆیەیە.

٤. ئەم هەڵبەستەی حاجی لە هیچ سەرچاوەیەکی چاپکراودا نەهاتووە، تەنها لە دەقە دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا هەیە و ئێمەش لێمان وەرگرت و وا بۆ یەکەمجار بڵاوی دەکەینەوە.

٥. کەریم: مەبەستی خودایە بە مانای سەخی و بەخشندەیە.

مەپرسە دەردی غەریبی و لەززەتی وەتەنم
ئەوی لە دەستی دەگریام ئەمێستە بۆی دەگریم

سەوادی سێبەری تۆیان هەتا نەکردە میداد
نەنووسرا وەرەقی ئەمری «کُنْ فکان»ی قەدیم[1]

ئەمێستە بۆیە نەزیرت لە مەجمەعی ئیمکان
میسالی سایەیی «طوبیٰ» خەرامی تۆیە عەدیم[2]

لەلای مەعاریجی تۆ تەلغراف و بەرق و شیهاب
نەزیری ڕەوتی تەنافبازە فیکری تەبعی عەقیم[3]

جودایی باسی مەکە فەسڵی «قابَ قَوْسَیْن»ت
کەمانی ئەبرۆی تۆ بوو لە بەزمی خاسی عەلیم[4]

خەڵاتی عیززەتی «لَوْلاك» و تاجی «أَرْسَلْناك»
بەسە سەنایی جەلال و کەمالی خوڵقی عەزیم[5]

---

١. سەوادی سێبەر: ڕەشایی سێبەر. میداد: مەرەکەب، حبر [میداد لە زمانی فارسیدا بە مانا پێنووسیش هاتووە. «کُنْ فکان» ئاماژەیە بەو دەستووراتانەی خودای مەزن کە بۆ ئەنجامبوونی کارێك هەرکە فەرمووبێتی «کُنْ» واتە: ببە «فکان» ئەویش خێرا بووە. قەدیم: ئەزەلی واتە: ئەو دەستووراتانەی کە لە ئەزەلدا دراوە. واتە: تا خودا نێوی تۆی نەهێنا پێشەوە، کائیناتی خەلق نەکرد، ئاماژەیە بەوە کە خوای گەورە لەبەر پێغەمبەر تەواوی کائیناتی خەلق کردووە].

٢. [«طوبیٰ»: درەختێکی بەهەشتییە]. خەرام: لارولەنجە.

٣. [مەعاریج: کۆی میعراجە بە مانای پەیژە و ئامرازی سەرکەوتنە، کە مەبەست میعراج و بەرزبوونەوەی پێغەمبەرە بۆ ئاسمانەکان. تەلغراف: تەلگراف. ڕەوت: شێوەی بە ڕێگا ڕۆیشتن. تەبعی عەقیم: زەوق و تەبعی نارێك]. عەقیم: نەزۆك.

٤. [«قاب قوسین»: ئەندازەی دوو کەوان. ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿فَكانَ قابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنىٰ﴾ی سورەتی «النجم»: ٩، کە باس لە میعراجی پێغەمبەر دەکا].

٥. [«لولاك»: ئاماژەیە بەو ڕستە مەشهوورەی کە دەڵێن حەدیسی قودسییە کە خودا

خولاسه، نێوی نبووەت لە پاش ڕیسالەتی تـۆ
مـیسالی مـارگەزیدەی مـولەققەبە بـە سـەلیم[1]

بەبەر شەفاعەتی خۆتی ئەگەر نەخەی «حاجی»
لیباسی کەعبە لەبەر کا، دەبێ بـچێتـە جـەحیم





فەرموویەتی: «لَوْلاكَ لَما خَلقْتُ الأَفلاك» واتە: ئەگەر لەبەر تۆ نەبوایە هیچم دروست نەئەکرد. «أَرسَلناك»: ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿وَ ما أَرْسَلْناكَ إلّا رَحْمَةً لِلْعالَمينَ﴾. بەسە سەنای... ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿وَ إنَّكَ لَعَلىٰ خُلُقٍ عَظيم﴾].

۱. نبووەت: پێغەمبەرایەتی. ڕیسالەت، «الرسالة»: ئەو پـێغـەمبەرایـەتییەی پـەیامی خـودایـی لەگەڵ بێ. [واتە: چەندە ڕاستە بڵێن بە مارانگەستە، تۆ ساغیت، هەر ئـەوەندەش ڕاسـتە بـە کەسێ کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بکا لە پاش تۆ، بڵێن: تۆ پێغەمبەریت].

## (ا)

# ئەم سەگانە

ئــەم ســەگــانەی کــە لەلای ئـێمــە وەزیـر و وکــەلان
بێنــە لای تــۆ ـبــە خــودا ـ نـایکەیە گـاوان و شــوان[1]

ئــەمە کـــەرمێزە دەڵێن وارســـی شـــەرعی نــەبەوین
هەموو عەبدی سەنەمن، باسی مەکـە گـەورەکـەیان[2]

هــەر ئـــەدیبێك بــووە ســاخوا لە دەمـی نـاوە بـڵێ:
دەوڵەتـی داوە بـەکـەر، نـیعمەتی داوە بـە سـەگـان[3]

هەر کەسێکی کەسە، ناکەس نییە، حـەرفێکـی بـەسە
وەرە سەر باسی خـەت و خـاڵی هـەتیوی خـۆمـان[4]

ئەی فدای خاکی دەرت تاجی کەی و مەسنەدی جەم
وەی بە قوربانی سەروفێسی کـەچت تـاجی کـەیان[5]

---

١. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «وەزیر و وکەلان»، «وەکیل و وکەلان» هاتووە و دەربڕینی «کە لەلای» لە کاتی چاپکردندا پەڕیوە و کێشی دێڕە شیعرەکەی لەنگ کردووە.

٢. [سەنەم: بوت]. حاجی مەبەستی لە «وارسی شەرعی نەبەوی» سوڵتان عـەبدولحەمیدی دووەم بووە کە کە لە سەردەمی ژیانی حاجی لە ئەستەمبۆڵ ئەو سـوڵتـان بـووە و خـۆی بـە میراتگری شەریعەتی پێغەمبەر داناوە و بە خۆیان دەگوت: خەلیفەی ئیسلام.

٣. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «دەوڵەتی داوە بە سەگ».

٤. لەدەقی «گ.م»دا وشەی «حەرفێکی» بە «پیتێکی» هاتووە و نووسراوە: «پیتێکی بەسە».

٥. [کەی: عینوانێکە بۆ پادشاکانی کەیانی، چەشنی کەیقوباد، کەیخوسەرەو و کەیکاوس. مەسنەد: تەخت و بارەگـا، دەسـەڵات و پـلەوپایە. جـەم: کـورتکراوەی جـەمشیدە پـادشای بەناوبانگی ئێرانی. فێس: کڵاوی سوور کە تایبەتی توورکان بووە].

خۆم بە "دارا" و بە "ئەسکەندەر" و "خوسرەو" نادەم
گەر بزانم لەبەر ئەم دەرگەیە دەبمە سەگەوان[١]

عاشقانی تۆ هەموو تیری نیگاهێکی بەسە
وەرە دەرگانەکەمان زامینی تۆم بمکە نیشان[٢]

بە ئومێدی ئەسەری حوسنی ڕەزا دەچنە وڵات
شیعرەکانم کە سەراپا وەکوو خۆم بێسەروپان[٣]

"نالی" و خاکی بەبە، «حاجی» و کۆیە بە مەسەل
عەینهی "حافیز" و شیرازە، "کەلیم" و هەمەدان[٤]



## (٢)

## خاکی جەزیر و بۆتان

خاکی جەزیر و بۆتان ،یەعنی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان[٥]

---

١. لە دەقەکانی «م.ر.س» و «ع.س»دا ئەم دێڕە شیعرە بەمجۆرەی خوارەوە هاتووە:
خۆم بە دار و بە سکەندەر و خوسرەو نادەم گەر بزانم لەبەر ئەم قاپییە دەبمە سەگەوان.
٢. لە دەقی «م.ر.س» و «ع.س»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە: «عاشقانت هەموویان تیری نیگاهێکی بەسە».
٣. [ئەسەری: بەرهەم. حوسنی ڕەزا: دڵخۆش کردنی ڕاستەقینە و دڵ بەجێ‌هێنان]. لە دەقی «م.ر.س»دا لە جیاتی «بە ئومێدی»، «بە تەماعی» هاتووە.
٤. [بەبە: کورتکراوەی بابانە، نێوی هۆزێکی بەناوبانگە لە شاری سلێمانی (کە ئیبراهیم پاشای کوڕی سلێمان پاشای بابان بنەڕەتی داناوە) و دەوروبەری سلێمانیدا حاکم بوون. عەینهی: دەقاودەق، ڕاستەوڕاست]. لە چەند دەقێکدا لە جیاتی «عەینهی»، «هەروەکوو» هاتووە.
٥. مخابن: حەیف.

وا ڕێگــەتان دەبــەسرێ عــێلاتــی جــاف و بــڵبـاس
گـەر مـردوون لە گـەرمێن مـەمنووعە بـچنە کـوێستان[١]

کــامی کــچ و هــەتیوی شــیرین بــێ، ڕای‌دەکـێشێن
هــاوار دەبــەنە بــەر کــێ؟ پـەشمە، دەخـیل و ئـامان[٢]

مــــەسجید دەبــــێتــــە دێرە نــاقووسیان مــوئەززین
مــەتڕان دەبــێتــە قــازی، مــوفتی دەبــێتــە ڕەهبان[٣]

هــیچ غــیرەتێك نــەماوە سـەدجار قـەسەم بـە قـورئان
پــەیدا بــێ ئــەرمەنستان نــامێنــێ یــەك لە کــوردان

ســـەرتان لە قـــوڕ هــەڵێنــن، ئــەحواڵمــان بــبینن
چــۆنــین لە دەسـتی زوڵمـی بێ‌دیـنی دوور لە ئـیمان

وەڵڵاهــی ســومە بــیللا، تــەڵڵاهــی ئــەم بــەڵایــە
هــەر هــێنــدی پــێ دەزانـن ئـیقلیمی کـردە تـۆفـان[٤]

تــۆفـانی ئـاو نـییە هـیچ، دەرچــێ لە کـێوی "جـوودی"
بەحری تـفەنگ و تـۆپـە، ئـینسانە بـەحری "عـوممان"[٥]

---

١. لە دەقـی «ع.م.ن»دا لە جیاتی «گـەر مـردوون لە گـەرمێن» نـووسراوە: «گـەر مـردوون لە گەرمیان» و لە دەقی «م.ر.س»یشدا «کە مردبن لە گەرمین» نووسراوە.

٢. لە دەقی «گ.م»دا لەجیاتی «کامی» وشەی «کامە» هاتووە.

٣. [مەتڕان: زانای ئایینی فەلە، پلەباڵاتر لە قەشە و ئەسقەف. دێرە: جێی خواپەرستی فـەلە. موئەززین: بانگوێژ. ڕەهبان: خۆپارێز و چلەکێش بۆ عیبادەت]. لە دەقی «گ.م»دا لە جـیاتی «مەسجید دەبێتە دێرە» بەمجۆرە نووسراوە: «مزگەوت دەبێتە دێر و...».

٤. [سومە = «ثمّ»: لە پاشان. ئیقلیم: وڵات].

٥. ئەم دەقەمان لە دەستنووسەکـەی «ع.م.ن» وەرگـرت دەنـا لە دەقـی «گ.م»دا نـووسراوە: «تۆفانی ئاوێ نییە تا دەرچێ لە کێوی جوود» [جوودی نێوی کێوێکە (بە پێی هەندێ سەرچاوە لە نزیکی شاری موسڵدا)، کە گەمێکەی نووحی پێغەمبەر دوای تۆفانەکە لەسەری لەنگەری گرتووە].

ئـەم قـیسسەیەی کـە کـردم نـاگـاتە چـەند سـاڵی تـر
ئـەم حـاڵەتـە دەبـینن یـەك یـەك بـە چـاوی خـۆتـان[١]

حـاڵ ئـێسـتێکـە وەهـایە مـەگـەر خـودا بـە سـووکی
تـێکـیان بـدا وەئـیللا دوورە لە عـەقڵی ئـینسان[٢]

هـەرچـی وەکـوو بـەیانم بـۆ کـردوون بـە تـەحقیق
پـەیدا دەبـن سـەگـانە، کـام قـوڕ بکـەین بـە سـەرمان[٣]

لەم بـەینە ئـیتتیفاقێ پـەیدا بکـەن بـە مـەردی
فـەرقی نـەبێ شـوان و جـووتیار و مـیر و گـاوان

[سـوێنـدیش بـخۆن بـە دیـن و ئـیمان و سـێ تـەڵاقـە
بۆ حیفزی دیـن و مـیللەت خـۆتـان بکـەن بـە قـوربان][٤]

گـەر هـیچ نـەبێ بـە ئـۆیـن تـابیع بـە دەوڵەتـێ بـن
بـێگـانە چـاکـە دوشـمن نـەك دوشـمنی لە خـۆتـان[٥]

١. ئەم دەقەمان لە چاپی «گ.م» وەرگرت کە لەوێدا نووسراوە: «ئەم قسەیە کە کردم». لە دەقی «م.م»دا نووسراوە «ئەم قیصەی کە کردم».

٢. [سووك: زوو. بەسووکی: بەم زوانە]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «حاڵ ئێستێکـە وەهـایە» نووسراوە: «کار ئێستێکە وەهایە».

٣. موحەممەدی مەلا کەریم لای وایە «سەگانە» هەڵەیە و «سێگانە» واتـە: سـێ قـات، یـان سێجۆر ڕاستە، چونکە وا مەعنا ئەدا بە دەستەوە. سێگانە: وشەیەکی فارسییە و لە شێوە نووسینی فارسیدا «سەگانە» ئەنووسرێت. ـهەنگاوێ‌تر: ١١٥.

٤. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: لەو بەیازەی کە لەبەر دەستما بوو ئەم بەیتەم لەبیرچوو بوو بیخەمە نێو تێکستەکەی کاك کەریم و کاك سەردارەوە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٢١. ئەوا ئێمە بە گوێرەی ئەو جێگەی خۆی بۆی دیاری کردبوو لێرە زیادمان کرد].

٥. ئۆین: وشەیەکی تورکییە بە مانای فێڵ، حیلە، یاری، گەمە دێ.

ڕۆمی وەکوو بەنی موون کەس پشتیان پێ نەبەستێ
کەوتوونە داوی خۆیان، سەرگەشتە ماون و حەیران[١]

کوا والیی سەنەندوج، بەگزادەیی ڕەواندوز
کوا حاکمانی بابان، میری جزیر و بۆتان[٢]

ئەو ئایەتەی «فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ» خوا کە فەرمووی
ئیجرای دەکەن سەگانە «بِالنّفس» شاهی خۆیان[٣]

کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون
سوڵتانی موڵك و میللەت، ساحیبی جەیش و عیرفان

جۆشێك بدەن وەکوو هەنگ، تەگبیر بکەن بەبێ دەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیدا کەن تۆپ و تفەنگ و هاوان[٤]

---

١. سەرگەشتە: سەرلێ تێکچوو.
٢. سەنەندوج: شاری سنەی کوردستانی ئێران.
٣. [فَسيرُوا في الأرض: نەحل: ٣٦. واتە: لە زەویدا گەشت بکەن].
٤. [هاوان: خومپارە هاویژ. موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: لەم بەیازەی بەردەستمدا لەباتی «تەگبیر»، «تەدبیر» نووسراوە، ئەمەش بەڕاست دەزانم، چونکە لەگەڵ شیعری کلاسیکی کوردیدا جۆرترە. هەروەها پێی وایە وشەی «پەیا» دروستە و «پەیدا» هەڵەیە. موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: من لەگەڵ دوکتۆر کەمال مەزهەردا هاودەنگم کە پێی وایە ئەم بەیتە هی حاجی قادر نییە دەستکاری کراوە، چونکە تۆپی «هاوان»، هەرچەند لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دروست کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زیانی لە قازانجی زۆرتر بووە بۆ هەر لایەنێ بەکار هێنرابێ، پشت گوێ خراوە و لەبیر چووەتەوە، دووهەمجار، چەند ساڵ پاش مردنی حاجی قادر، واتە: لە شەڕی ڕووسیا و ژاپۆندا (١٩٠٤ ـ ١٩٠٥) دووبارە بەکار هێنراوەتەوە. هەروەها ئەڵێ: ئەم بەیازەی بەردەسیشم پاشماوەی بەیتەکەی ئاوەها تۆمار کردووە: «ئەسبابی شەڕ پەیاکەن، ئەرکانی حەرب و لێدان». ـهەنگاوێ‌تر: ١١٦، ١١٧].

پــاڕانــەوە و تــەوەککــول لەم عــەسرە پــارە نــاکــا
تــیرە دوعــای «جــەوشن»، پــەیکانە «حــیرز»ی مــەیدان[١]

بـۆچـی بـەشیری ئـێمـە -یـەعنی ڕەسـوولی ئـەکـرەم-
هـیچ ئـەدعیەی نـەزانـی ڕۆژێ کـە دەچـووە مـەیدان؟[٢]

وەك «خــێوە» و «بــوخارا»، بــەڵا نــاڕوا بــە هــیممەت
ڕەفــعی بکــەن مــەشایخ، دەفــعی بکــەن مــەلاتان[٣]

هەر شێخێ کەوتە شوێنی یەك دوو کەسی ڕەش و ڕووت
خەڵکی بە موور دەزانـێ، خـۆی حـەزرەتی سـولەیمان[٤]

یــەکــتان نــەچوونە گــەردش وا تــێدەگــەن لە دنــیا
هــەر پــادشاهی ڕۆمــە و شــاهی عــەجەم لە تــاران[٥]

---

١. جەوشەن: وشەیەکی عەرەبییە بە مانای زرە، زرێی ئاسن دێ. لە دەقی کتێبەکەی «حاجی قادری کۆیی...» مامۆستا موحەممەدی مەلاکەریمدا لە جیاتی «حرزی» وشەی «حزبی» بەکار هاتووە، «حرز»یش، بەمانای جۆرە نووشتەیەك دێ، حزبیش جۆرە دوعایەکە. لە دەقی «گ.م» و «ع.س»یشدا «حیرس» بەکار هاتووە. ئێمە لە سەر دەقی «م.م» «حرز»مان تۆمار کرد.

٢. [بەشیر: مزگێنیدەر. ئەدعیە: کۆی دوعا واتە: پاڕانەوە لە خودا].

٣. [خێوە و بوخارا: نێوی دوو شارن لە ئوزبەکستان کە شوێنـی کـۆبـوونەوەی پـیاوچاکـان و شێخانی تەریقەت بووە]. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «دەفعی بکەن مەشایخ» ئێمە لەسـەر دەقی دەستنووسەکەی «ع.م.ن» کرمان بە «ڕەفعی بکـەن مـەشایخ دەفـعی بکـەن مـەلاتان». چونکە جووت وشەی «ڕەفع و دەفع» جوان لێکتری دەوەشـێنـەوە نـەك هـەردووکیان هـەر «دەفع» بن.

٤. [موور و سولەیمان: ئاماژەیە بەو چیرۆکە قورئانییە کە لە بـارەی حـەزرەتی سـولەیمان و مێلوورەوە هـاتووە. مـوحەممەدی مـەلا کـەریم ئـەڵێ: لەم بـەیازەی بـەردەستمدا لە جـیاتی «شێخێ» «میرێ» هاتووە کە ئەمە زۆر لەبارترە، چونکە لەگەڵ باسی سولەیماندا کە میر بووە جۆرترە و بە تەواوی گلەیی حاجی لە میرانی هاوچەرخی خۆی دەگـەیەنێ. ـهـەنگاوێـتر:

قــوتبی زەمــانە «خــالید» ئــاوارە بــوو وەکــوو مــن
بێ قەدر و قیمەت و شـان، بـێ خـان و مـان و بـێ نـان[1]

شــــیر و قـــەڵەم شـــەریکن لەم عـــەسرەدا درێغــا
شــــیرم قـــەڵەمتــــراشــە و کـــالانییە قــەڵەمــدان[2]

ئــەم مــەسئەلە مـەشهوورە گـەر قـوڕ دەکـەی بـەسەرتا
ئــیکسیرە خــاك و خــۆڵی دەرمــاڵی گــەورە مــاڵان[3]

تــەنها ئــێمــە وەهــا نـین، دیباچەیی "مـەم و زیـن"
حــاڵیت دەکــا چــلۆنــە ئــەحواڵیــان ســوخەندان[4]

خۆتان دەڵێن: ـ ئەگەرچی مـەشهووری خـاس و عـامە ـ
هــــەر ڕێویـــیەك گــــەڕابـــێ ئــازاتــرە لە شــێران

ســەد قــائیمە و قــەسیدە کــەس نــایکڕێ بـە پـوولێ
ڕۆژنــــامە و جــەریدە کــەوتۆتــە قــیمەت و شــان[5]

---

١. مەبەستی مەولانا خالیدی شارەزووری نەقشبەندییە (١٧٧٧ ـ ١٨٢٦ ز). لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «وەك من بووە ئاوارە».

٢. لە هەندێ دەقدا نووسراوە: «سەیف و قەڵەم شەریکن».

٣. ئیکسیر: وشەیەکی یۆنـانییە، بـەو مـاددەیە دەڵێن کـە بـە هـەر مـەعدەنێکی تریدا بکـەن دەیکات بە زێڕ.

٤. دیباچەیی مەم و زین: مەبەستی پێشەکـی مـەم و زیـنی ئـەحمەدی خـانییە [سـوخەندان: قسەزان].

٥. [قائیمە: لاپەڕەی کتێب کە هۆنراوە یا پەخشانێکی تێدا نووسرابێ. جـەریدە: وشـەیەکـی عەرەبییە بە مانای ڕۆژنامەیە]. ئەم دێڕە شیعرە تەنیا لە دەقەکەی «م.ر.س»دا هەیە و ئەوا بـۆ یەکەمجار بڵاو دەکرێتەوە.

بنواڕە سەعی و غیرەت ئێستا لە دەوڵەتی ڕۆم
خۆیان خەزێنەدارن، خۆیان تەبیب و سوڵتان[١]

هەر دوێنێ ئەهلی "سوودان" هەستانە پێ وەکوو شێر
ئێستێکە موستەقیللن مەحسوودی کوللی ئەدیان[٢]

"بولغار" و "سیرب" و "یۆنان"، هەم "ئەرمەن" و "قەرەتاغ"
هەر پێنجیان بە تەعداد نابن بە قەددی بابان[٣]

هەر ئێکە موستەقیللن، کوللێکی دەوڵەتێکن
ساحێبی جەیش و ڕایەت، ئەرکانی حەرب و مەیدان[٤]

هەم حەققیانە ئەرمەن، غیرەتکەشی یەکترن
وەك ئێمە نین لەگەڵ یەك دەعوا بکەن بە شیران[٥]

بۆ فەننی حەرب و سەنعەت، بۆ زەبت و ڕەبتی میللەت
دەینێرنە ئورووپا گەورە و بچووکی خۆیان[٦]

---

١. لە دەقە چاپکراوەکاندا لە جیاتی «دەوڵەتی ڕۆم»، «لە نێو ئەورووپا» هاتووە.
٢. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «ئێستێکە موستەقیللن مادوونی کوللی ئەدیان» لە دەقی «ع.م.ن»یشدا بەم جۆرە هاتووە: «ئێستێکە موستەقیللن وەکوو جەمعی دەوڵەتان». بەڵام ئێمە لەسەر دەقی «م.ر.س» وەکوو سەرەوەمان نووسی چونکە گونجاوترە.
٣. سیرب: خەڵکی وڵاتی «سیربیا»ن کە ئێستە وڵاتێکی سەربەخۆیە و لە یوگسلاڤیای پێشوو جیابۆتەوە. قەرەتاغ: ئەمیش بەشێکە لە یوگسلاڤی پێشوو. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «تەعداد» وشەی «ئەژمار» نووسراوە.
٤. [ئێکە: یەکە. جەیش: هێز، لەشکر. ڕایەت: ئاڵا].
٥. غیرەتکەش: غیرەتکێش، بەغیرت و ئازا. لە دەقی «گ.م»دا «غیرەتکێش» نووسراوە. بەڵام لە دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا «غیرەتکەش» هاتووە و ئێمەش پشتمان بەو بەست، چونکە لەگەڵ زمانی شیعری سەدەی نۆزدەهەمدا دەگونجێ.
٦. [زەبت = «ضبط»: کۆکردنەوە. ڕەبت = «ربط»: پێکەوە لکان].

«حاجی» کەسێکە بێکەس بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ
گوێی لێ دەگرن زەریفە، ناگرن بەڵا لە خۆتان



## (٣)

## لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم

لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم کەسێکی هائیم و حەیران
بە هەیئەت تێگەییم کوردە بە شێوەی ئەهلی کوردستان[١]

کە چوومە خدمەتی پرسیم: برادەر خەڵکی کام جێگای؟
لە کام لا هاتووی؟ گریا! گوتی: بابان! گوتم: بابان؟[٢]

دڵم داوە گوتم: باوکە هەموومان بێ کەسین لێرە
چ قەوماوە؟ گەلێ حەیفە، مەگریێ هەروەکوو باران

گوتی: بۆ غوربەت و ڕووتی نییە ئەفغان و هاوارم
لە داغی حاکمی خۆمە، لە شان و شەوکەتی تورکان[٣]

گەلێکم بیستووە پەستی و بڵندیی دەوڵەتان ئەمما
جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان[٤]

١. مەبەستی لە ڕۆم، شاری ئەستەنبووڵە. [هائیم: سەرگەردان و پەرۆش]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «بە هەیئەت تێی گەییم»، «لە ڕەنگا تێی گەییم» هاتووە.
٢. لە دەقی «گ.م»دا [لە جێگای «لەکام لا هاتووی»]، «لە کام جێ هاتووی» نووسراوە.
٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «ئەفغان» واتا هاوار «گریان». وە لە جیاتی «تورکان» وشەی «کوردان» هاتووە.
٤. [موحەممەدی مەلاکەریم «حاکمی کوردان»ی لە «حاڵی کوردستان» پێ ڕاستترە].

له وەقتی خۆی هەموو شا بوون، سەراپا بێغەم و شا بوون
له جوودا حاتەمی تائی، له شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان[١]

له پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ و شێری ئازا بوو
ئەمێستا مار و مێروو گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران[٢]

له کوێ ما نەعرەتەی تەقله و جلیت و ڕمب و ڕمبازی؟!
له کوێ ما دەنگی زوڕنا و دەهۆڵ و شایی و سەیران؟![٣]

له هاڕەی شەشپەڕو نەڕڕەی سوار و بەرقی شەشخانە،
له تەقەی ناڵ و شەقەی سم، له ڕەقەی تۆبز و قەڵغان[٤]

دەهاتە جونبوش و لەرزین له ماهی بگرە تا ماهی
له سەحرا چەندە وەحشی بوون له ترسان چوونه سەرکێوان[٥]

لەریزی زەبر و زەنگی وان کەسێکی تر نەبوو هەرگیز
بە شیری حیشمەتی کوردە کە ماوە دەوڵەتی ئێران[٦]

سەرا و ئەیوانیان ئێستا کەلاوەی کوندەبوو و جوغدە
ئەگەر مەیدان و دیوانە سەراپا بوویتە جێی دۆمان[٧]

---

١. [تائی = طائی. «شا»ی یەکەم: پاشا و میر. «شا»ی دووەم: شاد و کەیفخۆش].
٢. نیوه دێڕی یەکەمان له سەر دەقی «م.ر.س» تۆمار کرد.
٣. [نەعرەتە: گوڕاندن. تەقله و جلیت: بەو یارییە دەڵێن کە سوارکاران بەسەر ئەسپەوە له گۆ دەدەن (چەوگان)].
٤. [شەشپەڕ و شەشخان: دوو جۆرە چەکی کۆنن. تۆبز: کوتەکی بزمار ڕێژ کراو (گورز). قەڵغان: سپەر].
٥. ماهی یەکەم: ماسی. ماهی دووەم: بە مانای مانگە.
٦. له دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «بە شیر و حیشمەتی وانە دەمێنێ دەوڵەتی ئێران».
٧. جوغد: [بایەقوش] جۆرە کوندەبوویەکە. [دۆم: هۆزێکی کۆچەری کوردن کە بە پیشەی

لە پـاشی ئـەو هـەموو گـریان و نـاڵە و زاریـیە پـێم گـوت:
عەزیزم غەم مەخۆ هێندە، لە سایەی ڕەحـمەتی ڕەحـمان[١]

ئـەمیرێك مـاوە پـاشایە، گـوتی: کـێیە؟ گـوتم: شـێرە!
گـوتی: لێرە؟ گـوتم: لێرە! هـەتا تـاران و هـیندستان

بـە خـۆی شـێرە وەکـوو نـاوی لە شـەڕدا دوژمـن‌ئەندازە
تەمایان هـەر بـە ئـەو مـاوە جـەمیعی خـاکـی کـوردستان[٢]

هەچی جێگەی ئومێدمانە و ئـەوی دڵخـۆش دەکـا ئـەمڕۆ،
کەسی دی لەو بـەدەر نـابێتـە غـەمخۆری گـەلی کـوردان![٣]



(٤)

## پەرچەم و فێسی کەچی تۆ

پەرچەم و فێسی کـەچی تـۆ ئـەی جـوان
تـاجی کـەیانە و عـەلەمی کـاویان[٤]

---



خەڕاتی و کڵاش چنین بەناوبانگن. موحەممەدی مەلاکەریم بە پشت بەستن بە گۆڤاری ژین و جوانی و لەباری مەعناوە، پێی وایە بەجێی «جوغد» «مشکە» باشترە، تا دووجار کوندەبوو دووپات نەبێتەوە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٢٩].

١. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «لە پاشی ئەم هەموو گریان و زاری و ناڵەیە پێم‌گوت:». لە جیاتی «عەزیزم» وشەی «برادەر» هاتووە.

٢. لە هەندێ لە دەقەکاندا لە جیاتی «جەمیعی»، «تەواوی» هاتووە.

٣. ئەم نیوە دێڕە لە دەقەکەی «م.م»مان وەرگرتووە. «بنوارە: مـەسعوود مـوحەممەد، حـاجی قادری کۆیی، بەغدا ١٩٧٦ب٣، ل٣٦٩».

٤. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «کەچی» وشەی «کەچیت» هاتووە. [پـەرچـەم: مـووی سـەر هەنیە. فێس: کڵاو. کەیان: زنجیرە پاشایانی کەی وەك: کـەیکاوس، کـەیخەسرەو و کـەیقوباد ☜

مـــن له غـــەمت ڕێگـــەیەکـم کـەوتەبەر
خوانی بەهەشتە و سەفەری هەفت خوان[1]

بـــیژەنـــی چـــاهی زەقـــەنی تـــۆیـە دڵ
ڕاهـــی نـــەجاتی فـــەلەك و ڕێســـمان[2]

تـــیری مـــوژەت بـــۆ دڵی ئـــەسفەندیار
تـــیری گـــەزی ڕۆستەمی مـازەندەران[3]

فـــیرقەتی تـــۆ لەشکـری ئـــێرانـــییە
ســـەبری مـــنیش لەشکـری تـــوورانـییان

بـــەسیەتی ســا خـــوێنـی سیاوەش نـییە
جـــان و دڵت بـــردووە هـــەم دیـــنمان

«حاجی»یە فیردەوسیی کورد، سا ئەتۆش
گوێ وەکوو مەحموود مەدە قەولی بەدان[4]

---



و...]. عەلەمی کـاویان: ئـاڵای کـاویان، ئـەو کـەوڵەی کـە کـاوەی ئـاسنگەر کـردی بـە ئـاڵای شۆڕشەکەی لە دژی ئەژدەهاك و بوو بە ئاڵایەکی مێژوویی.

١. [هەفت خوان: حەوت قۆناغی دژوار و گران، یەکێکە لە چیرۆکەکانی شانامەی فیردەوسی کە بریتیە لەوە کاتێ ڕۆستەم بۆ نەجاتدانی کەیکاوس دەڕوا بۆ مازەندەران، تووشی حەوت کارەساتی دژوار دەبێ و بە چالاکی لێیان ڕزگار دەبێ. ئێستا ئەم حەوتخوانە بووە بە پەند بۆ ئیشی تووش و ئەستەم. وا مەشهوورە تەنیا ڕۆستەم و ئەسفەندیار توانیویانە لێی دەرباز ببن].

٢. [بیژەن: یەکێك لەکەسایەتییەکانی شانامەی فیردەوسییە]. چاهی زەقەن: چاڵی چەناکە.

٣. [گەز: جۆرێ دارە کە لە شانامەدا دەڵێ: سیمورغ تیرێکی لێدروست کرد و لە نێو ئـاوی زەهردا کوڵاندی و هێنای بۆ ڕۆستەم تا چاوی ئەسفەندیاری پێ بـنگوێ، چـون تـەنیا ئـەمە چارەی کوشتنی بوو].

٤. فیردەوسی: مەبەستی لە ئەبولقاسمی فیردەوسی دانەری شانامەیە، لەسەر داوای سوڵتان مەحموودی غەزنەوی ئەو داستانەی بـە شـیعر هـۆنییەوە. مـەحموود: مـەبەستی سـوڵتـان مەحموودی غەزنەوییە، کە بە قسەی بەدکاران لە جیاتی پاداشت، فیردەوسیی دەربەدەر کرد.

## (٥)

## فەلەك بە تير و كەمانێ[1]

فەلەك بە تیر و کەمانێ لە ئێمە چوویتە کەمین
شکارگاهی زەمینە، لە چەنگی کێوە دەچین![2]

دەخاتە گەردەنی ئێمە میسالی دابەستوو
گوریسەکی بەڵەکی سوبح و شام و ناترسین[3]

بە حوققەبازی و لەعبی زەمانە ناغەڵەتێین
ئەمێستە پێدەکەنین و لە ئاخرا دەگرین[4]

ئەمین مەبە لە سبەینێ ئەمەت بەسەر دێنێ
حوادیساتی زەمانە کە نایەتە تەخمین

وجوودی ئێمە کە ڕۆژی حەیاتی ئاوا بوو
یەقین بزانە کە شەولێگەڕاو و دەربەدەرین[5]

---

١. [هەروەك چۆن لە پێشەکییەکەدا ئاماژەی پێ کرا حاجی ئەم پارچە شیعرەی بۆ لاواندنەوەی شاعیرێکی کوردی داناوە بە ناوی (کەیفی) کە هاوەڵی خۆی بووە لە شاری ئەستەنبۆڵ و لە وێدا فەوتی کردووە].

٢. بۆ کێشی شیعرەکە ئەبێ وردە وەستانێك لە سەر «ر»ی «شکارگاە» بکرێ. شکارگاە: بە مانای شوێن و جێگەی ڕاو دێ. [لە چەنگی کێوە دەچن: واتە: هیچ ڕێگەی دەربازبوونمان نییە].

٣. [دابەستوو: بەو گاجووتە ئەڵێن کە نیر و ئامووری لە مل دەکن و بۆ جووتکردن ئەیبەن]. سوبح و شام: سبەینێ و ئێوارە.

٤. حوققەبازی: وشەیەکی فارسییە بە مانای فێڵبازی یاخود فرۆفێڵ دێ.

٥. [شەولێگەڕاو: شەو لێ شێواو، شەو بە بەتاڵ بەسەربردن].

ئـەم ئـەرزە کـۆنـە هـەوارە، خـەلایقیش کـۆچـە
تەماعی سووری نەبێ کەس لە ژێری چادری شین[١]

دوو گەز زەمین و سێ گەز جاو و مستە خـۆڵێکـە
لیباسی پێخـەف و ڕایـەخ هـەتا دەگـاتە سـەرین[٢]

سـەبا مـوسەللەمی ئـافاقە قـاسیدی غـورەبای
ئـەنیسی یـاری و هـەمڕازی عـاشیقی غـەمگین[٣]

سـبەینێ هـەستە، مـەوەستە خـەبەر بگـەینە وڵات
دیـارە چـەندە حـەزین و غـەریب و بـێ کـەیفین[٤]

کە چوویە سەرحەدی «بابان» و عێلەکەی «جافان»
بگـرییێ هـەروەکـوو بـارانـی مـاهی فـەروەردین[٥]

لە قــورِ بـنیشە بـڵێ: قـەوم و قـیلە هـاوارە!
ئەسیرە «کەیفی» لە ڕۆما لە حەبسی زێری زەمین[٦]

---

١. [سوور: جەژن، ئاهەنگ و شادی]. تەماعی سووری: هیوای شادی و خۆشی. چادری شین: مەبەست لە ئاسمانی شینە.

٢. [جاو: خام، پارچەیەکی سپی کە بە زۆری بۆ کفن بەکار ئەهێنرێت. ڕایەخ: ئەوەی بۆ خستنە ژێر بشێ، ڕاخەر].

٣. [قاسید: نامەبەر. ئافاق، کۆی ئوفوق: ئاسۆ: سۆما. ئەنیس: هاودەم و هاوەڵ].

٤. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «خەبەر» وشەی «وەڵام» بەکار هاتووە. لە دەقی «ع.س»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە نووسراوە: «سبەینێ مەوێستە خەبەر بگەینە وڵات». [لە وشەی «بێ کەیفین»دا تەورییە هەیە، هەم بێ کەیف و شادی دەگەیەنێ و هەم بێ کەیفین واتە «کەیفی»ی شاعیرمان لەدەستداوە].

٥. فەروەردین: ناوی یەکەمین مانگی بەهاری ئێرانییە.

٦. [ڕۆم: ئەستەمبۆڵ. حەبسی زێر زەمین: زیندانی ژێر زەوییە، واتە: مردووە و نێژراوە].

لە کوردی بگرە هەتا تورك و عـارەب و عـەجەمی
لە ئاخ و داخی دەسووتێن و شین دەکەن دەگرین[١]

لە «کوێرەدێ»یێ کە «کەیفی»ی تـیابێ فـیردەوسە،
جەهەننەمە کە نەما «کەیفی»، شـاری قـوستەنتین[٢]

حــەزین و دەرهــەمی ئـەم شـارە زۆری بـێگـانەن
لە حەسرەتی عەجەبا! شارەزووری چەن دەگرین![٣]

گــەلێ هــەناسەی کـێشـا و چـاوی خـۆی گـێڕا
کەسی نەدی لە عەشیرەت، لە داخی چۆن نەمرین!

زوبــانی کـوردی و تـورکی و فـارسی و عـەرەبی
وەهای دەزانی وەکوو بـەیتی خـوسرەو و شـیرین

ئەمەش دەلیلە لە تـەئسیری مـەرسیەی کـە گـوتم:
چــوار زوبــانی تــێدایــە قــەسیدەیی ڕەنگــین

---

١. ئەم دێڕە شیعرە لە هـیچ سـەرچـاوەیەکـی چـاپکراودا نـییە، تـەنیا لە دەسـتنووسەکـەی «م.ر.س» هاتووە ئێمەش وا بۆ یەکەمجار بڵاوی دەکەینەوە.

٢. [وەك چۆن لە پێشەکیەکەیدا ئاماژەی پێکرا «کوێرەدێ» ئەو دێیەیە کە زێدی کەیفی بووە کە حاجی بە شێوەی جوان ئاماژە بەو دێیە ئەکات].

٣. دەرهەم: شێواو پـەشۆکـاو. لە دەقـی «ع.م.ن»دا نـووسراوە: «لە حـەسرەتی شـارەزووری عەجەبا چۆن نەگرین».

[موحەممەدی مەلا کـەریم ئـەڵێ: لە دەسـنووسێکـدا لە جـیاتی «شـارەزووری» نـووسراوە: «شەهرەزووری»، ئێستا لام وایە ئەبوو لە کاتی بەراوردکردنی تێکستەکـاندا «شـەهرەزوور»م بنووسیایە، چونکە لە شیعری کلاسیکی کوردییەوە نزیکترە لە «شارەزووری». ـ هەنگاوێتر: ١٤٠].

«دریــغ و حســرت ازان شــاهباز ســدره نشین
بــه دام مــرگ فــتاد و بــه خــاك گشت دفـین»[١]

«ز لوحـــه‌ی خـــط مـــوزون و قـــطعه‌ی مـــنظوم
خـــجل شــد "ابــن‌هلال" و روان " ابــن‌متین"»[٢]

به کێ بڵێم که به «که‌یفی» بڵێ به‌که‌یف و ســروور:
غـه‌می نـه‌بێ له فـه‌له‌ك عـاکـفانی چـلله گـوزین[٣]

«جُـــــنوبُهُم تَـــتجافیٰ عـــنْ مَـــضاجِعِهِمْ،
یَسْـــتغْفِرونَ لَكَ بِـــالغُدُوِّ حـــتّیٰ حـــین»[٤]

«عــــلیَّ تَـــعْلُو بِأَعـــلَی الْـــجَوْدِ عَـــبْرَتُنا
مَـــدی الزَّمـــانِ أَنُـــوحُ نـــیاحَ مُـــنتَدَبین»[٥]

---

١. [داخ و که‌سه‌ر بۆ ئه‌و شابازه که ئه‌وه‌نده به‌رزه، داری سیدره‌ی به‌هه‌شت، جێی نیشتنه‌وه‌ی بوو ئه‌و مه‌زنه که‌وته داوی مه‌رگ و له دڵی خاکدا نێژرا].

٢. [له‌به‌ر لاپه‌ڕه‌ی خه‌تی ڕێك‌وپێکی هه‌ڵبه‌ستی کێشه‌داری ئه‌و سه‌رشۆڕ بوو «ئیبنوو هیلال» و زوبانی به‌ربوو «ئیبنوو مه‌تین». له‌وانه‌یه ئه‌م ئیبنوو مه‌تینه هه‌ڵه‌ی ڕوونووسکه‌ر بێ و ئیبنوو یه‌مین دروست بێ، چونکه پاشتریش ناوی ئیبنویه‌مین دینێته‌وه].

٣. [عاکفانی چلله‌گوزین: چله کێش، ئه‌و پیاوچاکانه که به نییه‌تی عیباده‌ت چله ده‌گرن و تا چل ڕۆژ له مزگه‌وت یان چله‌خانه‌دا به ڕۆژدا ڕۆژوو ده‌گرن و به شه‌ویشدا عیباده‌ت ده‌که‌ن، یان مه‌به‌ست په‌ریانی ئاسمانه].

٤. [ئه‌و چله‌کێشانه‌ی که خه‌ویان له خۆیان حه‌رام کردووه و دوو پاڵوویان جێگه خه‌و به خۆ ناگرن و خه‌ریکی عیباده‌تن و شه‌و تا به‌یان داوای لێبوردن له خوا بۆ تۆ ده‌که‌ن. ئـه‌م بـه‌یته ئاماژه‌یه به ئایه‌تی: ﴿تَتَجافیٰ جُنُوبُهمْ عَنِ الْمَضاجِعِ یَدْعونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَ طَمَعاً﴾ سه‌جده: ١٦].

٥. [ئـه‌سرینی چـاوه‌کـانم بـه لێزمـه ده‌ڕژێن بـه‌سه‌رمدا، ئـه‌منیش شـین و ڕۆڕۆمـه وه‌کـوو شیوه‌نکه‌ران]. ئه‌م دێڕه شیعره عـه‌ره‌بییه‌ی حـاجی له هـیچ سـه‌رچـاوه‌یه‌کـی چـاپ‌کراویـدا نه‌هاتووه، ته‌نها له ده‌قی ده‌ستنووسه‌که‌ی «م.ر.س»دا هاتووه، ئێمه‌ش تۆمارمان کرد.

«اوگــون کــه اسب کــلامی زمــانه ایـلدی زیـن
کـــــف کــــفایتی کـــــیفیّه ویــردیلر دزگـــین»[١]

«بـــــوگیجه کــیفی افــندی گــورندی رؤیــادیه
جــــنانده زمــرهٔ غـلمان و حــوره اولدی یـقین»[٢]

«کســــــلدی مــاتم نــظمنده زەهــرەنك تــاری
طــاغلدی حســـرتی نــثرنده عـقدەی پـروین»[٣]

«کـــــبیر در بـــــو مــصیبت، عــظیم واقــعه در
«صــغیر» یــازینه تأریــخی، خـامەی مشکـین»[٤]

لەیــەك دوولاوه هــەتیوی له پــاش بـەجێ مـاوه
یەکێکی بیکری مەعانی، دوانــی تـیفلی حـەزین[٥]

---

١. [واته: ئەو ڕۆژه که زمان ئەسپی کەلامی زین کرد، کەفی (لەپی دەست) کیفایەتی جڵەوی دا به دەست کەیفییەوه.]

٢. [ئەمشەو کەیفی گۆیا به خەو دیتراوه، له جیناندا زومرەی غیلمان و حۆرییان لێان یـەقین بوو.]

٣. [واته: تاری زوهره له ماتەمی نەزمیدا، گرێی پـەروین له حـەسرەتی نـەسریدا کـرایـەوه و هەڵوەشا]. ئەم سێ دێڕه شیعره تورکییەی حاجی له هیچ سەرچاوەیەکی چاپکراودا نەهاتووه تەنها له دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا نەبێ. ئێمەش خستمانه پاڵ ئەم لاواندنەوەیه.

٤. [واته: گەورەیه ئەم موسیبەته! واقیعەیەکـی عـەزیمه! «صـغیر»ی بـنووسه تـەئریخەکـەی دیسان، خامەی موشکین!. مانای ئەم چوار بەیته تورکییه موحەممەدی مەلاکەریم له مامۆستا شوکر موستەفا ـکه لێزانی ئەم بوارەیه ـگێڕاوەتەوه. ـهەنگاوێتر: ١٤١].
وشەی «صغیر» به حیسابی «جومەل» دەکاته ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی [م]که ساڵی کۆچی دوایی «کەیفی»یه و بەرانبەر به ساڵی ١٨٨٣ی زایینی دەوەستێ بەم لێکدانەوەی خوارەوەیه:
ص = ٩٠، غ = ١٠٠٠، ی = ١٠، ر = ٢٠٠، صغیر = ١٣٠٠ ه.

٥. [بیکری مەعانی: مانای دەست نەخواردوو و کەس پێ‌نەزانیو. بیکر: کچی شوو نەکردوو. تیفل: منالی ورد].

ئـەمن کـە مـامی ئـەوانـم دەیـاندەمە ئـودەبا،
کـچانی زادەیـی تـەبعی لەتـیفی حـەجلەنشین[١]

وەلێ کوڕانـی ڕەزا نـین بـە خـاکـی ڕۆم و دەڵێن:
لە لای ویـلایەتەوە چـاوەنۆڕی مـامی تـرین[٢]

قـەڵەم شکـا و مـورەککـەب ڕژا و نـامە نـەما
لە داغی قـافیە تـا خـۆی گـەیاندە ئـاه و ئـەنین[٣]

ئەدیب و عاقڵی لەم بـەحرە وەك "تـڕی بـن گـۆم"
گەلێکی ون بووە «حاجی» وە چاکە لێی دەرچین[٤]



١. حەجلە: ژووری ڕازاوەی بووك و زاوایە، حەجلەنشین: ئەو بووکەی کە لە ژووری بووکێنی دانیشتبێ بەتایبەت لە یەکەم شەویدا.

٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «چاوەنۆڕی» وشەی «چاوەدێری» هاتووە.

٣. ئەم بەیتە لە یەکێ لە دەستنووسەکانی لای مندا هەبوو لە کاتی سەرپەرشتی کردنی چاپدا تۆمارم کرد «موحەممەدی مەلا کەریم».

٤. «تڕی بن گۆم» یا خود «وەك تڕی بن گۆم ڕۆیشت» ئیدیۆمێکی کوردییە بە مانای بە فیڕۆ و بە بێدەنگ ڕۆیشتنە. حاجی ئەمەی لەم شیعرەیدا بەکار هێناوە. «بنوارە جەلال مـەحموود، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٢، ل: ٤٧٥».

## (١)
## ئەگەر لێدانە مەقسوودت

ئـەگـەر لێدانـە مـەقسوودت بـفەرموو
وەگـەر قـەتڵە مـەرامت هـا! دەسـا زوو

لە ڕێی خوا مەیکە تـەحسیلداری ئـێمـە
ڕەقـیبی کـافر و بـێدیـن و بـەدخوو

شـەو و ڕۆژێ دەبـرژێم و دەقـرچێم
بە سووتن ئیکتیفا نـاکـەم وەکـوو مـوو[١]

گـەلاوێژە گـەلاوێژی دوو چـاوت
درەوشـاوە، سـەر و ڕیشم سپی بـوو

کە خۆیان خستە بەحری ئەشکی خوێنین
دڵ و جـان بـۆ تـەوافـی خـاڵی هـیندوو

بـە قـەولی تـاجری دەریـایی ئـەخبار
دڵی دێوانە تـێچـوو ڕۆحـی دەرچـوو[٢]

ئەگەر دیققەت بکـەن «حـاجی» دەزانـن
لەبەرچی شێخـەکـان وا بـوونە کـەندوو!



## (٢)
## ئومێدی وەسلی تۆم زانی

ئـومێدی وەسـلی تـۆم زانـی نـیشانەی بـێنـیشانی بـوو
ئەوەی ئێمـەی فـریب دا ئـیلتیفاتی سـەر زوبـانی بـوو[٣]

---

١. وشەی «سووتن» لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «بە سووتان».
٢. لە دقی «گ.م»دا لە جیاتی «تاجیری دەریایی»، «تاجیر و دەریایی» هاتووە.
٣. ئێمەی فریب دا: ئێمەی تەفرە دا.

لە سەر تووری ڕوخت مووسا کە فیرعەونی خەتی لادا
لە سیڕڕی زاری تۆی پرسی جەوابی «لَنْ تَرانی» بوو[1]

ئەگەر "مووسا" و "دارا" بی لە دنیا بەهرەوەر نابی
دەزانی مەنسەبی هەردوو شوانی و ئاشەوانی بوو

لە سایەی لێو و دندانی لە بەرچاوم نەما شانی
ئەگەر لەعلی یەمانی بوو وەگەر ئەڵماسی کانی بوو

مەگەر بیستوویەتی خەتتت لە نێو چاهی زەنەخدانت
ئەسیری یووسفە بۆیە نزوولی کاروانی بوو[2]

ئەوی تۆ هەتبوو و من نەمبوو: قەرار و سەبر و عیززەت بوو
ئەوی من هەمبوو و تۆ نەتبوو: وەفا و میهرەبانی بوو

زەمانی حاڵ و سەرمایەی بەد و نیکت نەبوو کەڵکی
لە موستەقبەل بڵێ: «حاجی» لە مازیدا زەمانی بوو[3]



١. [توور: ئەو کێوەیە کە حەزرەتی مووسا لە سەریدا لەگەڵ خوادا وتووێژی دەکرد. «لَنْ ترانی»: واتە: قەت نامبینی، ئەمە وەڵامی خودای مەزن بوو بۆ ئەو داواکاریەی کە مووسا لە خوای کرد کە خۆی پێ پیشان بدا].

٢. [زەنەخدان: چەناکە]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «نزوولی کاروانی بوو»، «نزوولی کاردانی بوو» هاتووە.

٣. بەد و نیکت: خراپ و چاکت. [حاڵ: ئێستە. مازی: ڕابردوو. موستەقبەل: داهاتوو. موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: لەبیرمان چووە وشەی «کەڵکی» بگۆڕین بە «سوودی». وشەی سوودی نزیکترە بە شیعری کلاسیکی کوردیەوە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٤٣].

## (۳)

## بووکی دنیا

بووکی دنـیا ـوەك دەڵێن ـ وا بـێ‌حـەیا و بـێ‌فـەڕ نـەبوو
هــێنـدە دامـەن هـەڵكـراو و حـیز و مـاڵانگـەڕ نـەبوو[۱]

ڕێی نــــیشانی ئــێمـــە دا ئـــەو ڕۆژە ئـــادەم دەركـــرا
بـــۆیـــەكـی ئـەم عـالەمە بـێ‌شـۆڕش و بـێ‌شـەڕ نـەبوو

ســـۆفـــی بـەم ڕەنگـەكـە واگـۆشـتی بـراكـانی دەخـوا
حـــیكمەتە ڕیشـــی وەكـــوو جـاران درێژ و پڕ نـەبوو[۲]

نـــیسبەتی ئـێمـــە و ئـــورووپا قـــەترەیی دەریـــا نـییە
بۆچ ئولولعەزمێك بە عەزمی بەعسەتی پێی تەڕ نـەبوو؟![۳]

كێ گەڕی پێ كـردبووی تـووشی بـەڵای خـۆتـم بكـەی
ئــەو دەمـە بـاسی عـەزاب و دۆزەخ و كـەوسەر نـەبوو[٤]

ئەی مەهی دوو هەفتە! تا شەمس و قـەمەر تـۆیـان نـەدی
دانـــەگـیرسان ئـەو مـیسالی ئـاگـر، ئـەمیان گـڕ نـەبوو[٥]

---

۱. هەر چەندە نیوە دێڕی یەكەم لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «دونیا هەروەك دەڵێن وا بێ‌حەیا و بێ‌فەڕ نەبووا»، بەڵام كە سەرنجمان دا دەقی «م.ر.س» بینیمان بە ناونیشانەی «بووكی دنیا» نووسراوە و ئەم سەرەتایە باشتر لەگەڵ ناوەرۆكی هەڵبەستەكە ڕێك دەكەوێ. لە دەستنووسێكی لای ڕۆستەم حەوێزیدا «دایكی دونیا» نووسراوە.

۲. ئەم نیوە دێڕەمان لە سەر دەقی «ر.كوردستان» نووسی چونكە سەرواكەی ڕاستە.

۳. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «پێی تەڕ نەبوو»، «تێپەڕ نەبوو» هاتووە.

[ئولولعەزم: ئەو پێغەمبەرانەن كە خوا ئەركی گەورەی خۆی وە ئەستۆیان خستووە كە بریتین لە: نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا و موحەممەد ـدروودی خوایان لەسەر بێ ـ].

٤. گەڕی پێ كردبووی: گێچەڵی پێ كردبووی.

٥. [مەهی دوو هەفتە: مانگی چواردە]. لە دەقی «گ.م» و «م.ر.س»دا لە جیاتی «گڕ نـەبوو»، «گەش نەبوو» نووسراوە.

بەم هەموو تەجریدە وا «حاجی» دڵی خۆشی نەدی
تا لە ئەتوار و قسەی ئەم دەورە کوێر و کەڕ نەبوو[1]



١. [تەجرید: قسەی بێ کوێکڵ، واتە: ڕپ و ڕاست و بێ ڕووودەرباسی قسە کردن، هەروەها زاراوەییێکە لە زانستی بەیاندا. ئەتوار: کۆی تەور = «طور» شێواز و جۆری قسە کردن].

## (ا)

## زەمانە[1]

زەمـــانە ڕەســـمی جـــارانـــی نـــەماوە
چـــراغـــی نـــازم و مـــونشی کـــوژاوە[2]

لە دەوری ئـــێمـــە ڕۆمـــان و جـــەریدە
ئـــەگـــەرچـــی مـــەقسەدە، زانـــینی بـــاوە[3]

ئـــەمان قـــەدری بـــزانـــن ئـــەم کـــتێبـــە
لە دنـــیا ئـــێســـتەکـــی هـــەمتای نـــەماوە

لە ئـــەییامی حـــەیاتی شـــێخـــی خـــانی،
لە ســـەر نـــوسخەی خـــەتی ئـــەو نـــووسراوە

لە لای ئـــەربابی خـــۆی بـــۆ قـــەدر و قـــیمەت
خـــــەزینەی گـــــەوهەرە و کـــیسەی دراوە

لە مەجمووعی دووەل: "سۆران" و "بۆتـان"
لە ســـایەی ئـــەم کـــتێبـــە نـــاسراوە

لەکوردان غەیری «حاجی» و «شێخی خانی»
ئـــەساسی نـــەزمی کـــوردیی دانـــەناوە



١. ئەم هەڵبەستەی حاجی یەکەمجار لە «ڕۆژنامەی کوردستان»ی ژمارە ٣ی ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە دوکتۆر کەمال فوئاد، کوردستان، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (١٨٩٨ ـ ١٩٠٢) کۆکردنەوە و پێشەکی و لەسەر نووسین. بەغدا ١٩٧٢.

٢. [نازم = ناظم: هۆنەر. مونشی: نووسەر، یان ئەوەی لە ناخی خۆیەوە شیعر دێنێتە دی و ئینشا دەکا].

٣. [جەریدە: ڕۆژنامە].

## (٢)

## ئەم خەیمە کە شەمسییەیی[1]

ئـەم خـەیمە کـە شـەمسییەیی شـاهەنشەهی ئـەرزە
تـا چـادری نـیلووفەری سـەر تـەپڵەکـی بـەرزە[2]

ئـــەتنابی وەکـــوو تـــوولی ئـــەمەل لامـــوتەناهی
ئەوتادی وەکـوو کـێوی ئـوحود مـەرکەزی فـەیزە[3]

سەقفی وەکوو گەردوونە، شکـافی وەکـوو ئـەنجوم
پەردەی وەکوو ئەدواری سەما ئـەتڵەسـی سـەوزە[4]

هــەروەك ئــەلیفی "جـانە" سـتوونی لە سکـووندا
نەك تابیعی غـەیرە مـوتەحەڕڕیك وەکـوو هـەمزە[5]

---

١. ئەم قەسیدەیەمان لە دەقی «م.م»دا وەرگرتووە کە لە بەشی دووەمی کتێبەکەی «حاجی قادری کۆیی»دا لە لاپەڕەکانی ٢٤٦ و ٢٤٧ بڵاوکردۆتەوە.

٢. [نیلووفەر: گوڵی لاولاو نیلووفەری: ڕەنگی شین وەك گوڵی لاولاو مەبەست ئاسمانە. تەپڵەك: بەرزترین خاڵی هەرشتێ، تەختەیەکە لەنێوان کۆڵەکە و میچدا]. شەمسییە: چەتر، سەیوان. لە دەقی «م.ر.س»دا نووسراوە: «تا چادری نیلی سەری».

٣. ئەتناب: «أطناب» کۆکراوەی «طُنُب»ە، بە مانای گوریس، پەتی درێژ. [توولی ئەمەل: درێژی هیوا و ئاوات. لاموتەناهی: بێبڕانەوە]. ئەوتاد: «أوتاد»، کۆکراوەی «وَتد»ە، واتا [مێخ و] سنگی ڕەشماڵە کە. [ئەوتاد: لە زاراوەی زانستی ئەستێرەناسیدا بریتییە لە چوار مزڵگە لە دوازدە مزڵگەی «منطقة البروج» کە بریتین لە «الوتد الطالع» و «الوتد الغائب» و «وتدالسماء» و «وتد الأرض». ـ المنجد:٢١٣٨.]

٤. شکاف: وشەیەکی فارسییە بە مانای درز دێ.

٥. [واتە: هەروەکوو چۆن پیتی ئەلف لە وشەی «جان»دا ساکن و نەجمە، کۆڵەکەکانی ئەم ڕەشماڵەش وایە، نەك وەکوو پیتی هەمزە (کە هەر ئەو ئەلفەیە) بزێو بێت شوێنی غەیر بکەوێت، چونکە هەمزە بریتییە لە ئەلفی بزوێندار].

ئەوسافی وەکوو خەتتی دوو زوڵفە بە چەپ و ڕاست
وەك ماری موتەلسەم کە تەلیسمی سەری کەنزە[١]

وەسفی چ بکەم؟ نێوەنی گوڵ، دامەنی سونبوڵ
شایستە سەناخوانی بکەم هەر وەکوو فەرزە

لای ژووری سەمەن نێوەنی گوڵ دامەنی سونبوڵ
لەو سوورەت و مەعنایە کە سەد جەننەتی لەغزە[٢]

فیلجوملە وەکوو خاڵی ڕوخی دولبەری «حاجی»
دڵ پەستە، دەسا بادی سەبا هەستە مەلەرزە[٣]

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئایینی "لاجان"
ئاهێستە بڕۆ نەك وەکوو دێوانەیی هەرزە[٤]

تا داخیلی خەڵوەت دەبی ئەمجا بە وەکالەت
خاکی قەدەمی ماچ بکە بەم تەرزە کە تەرزە[٥]

مەئزوونی ئەوەندە وەکوو ئاهم بە نەزاکەت
لادەی سەری زوڵفی نەوەکوو بیخەیە لەرزە

ئەم نەوعە گوڵە هەڵدەکەوێ ساڵێ لە قەرنێ
نەك وەك گوڵی بازارییە هەر ساڵە کە سەوزە[٦]

---

١. لە دەقی «م.ر.س»دا نووسراوە: «ئەوسافی وەکوو خەتتی جەداویل بە چەپ و ڕاست».

٢. [سەمەن: گوڵی یاسەمەن. نێوەن: نێوەند و ناوەڕاست. جەننەتی لەغز: دەشت و باخی مەتەڵ، واتە: ڕەمز و ڕازی زۆری تێدایە] لە دەقی «م.ر.س»دا لە جیاتی «جەننەتی لەغزە»، «جەننەتی لەفزە» هاتووە.

٣. [فیلجوملە، «فی الجملە»: بەکورتی.]

٤. بەهەشت ئایین: ئەوەی لە شێوەی بەهەشت دایە، لاجان: دەشتێکە کەوتووەتە دیوی کوردستانی ئێران. ئاهێستە بڕۆ: لەسەرخۆ بڕۆ. دێوانە: شێت. هەرزە: زۆر بڵێ.

٥. [تەرزی یەکەم: شێوە، جۆر. تەرزی دووەم: جوان و لەبار].

٦. لە دەقی «م.ر.س»دا نووسراوە: «نەك وەك گوڵی بازارییە مەوجوود هەموو لەحزە».

## (٣)
# دالی قەدم [1]

دالی "قەدم" کە ئەلفی عەسای گرت بە دەستەوە
تیروکەمانە، سەیدی جەوانیم نەبەستەوە! [2]

ئەی پەیکی نالە بێنی سەری زوڵفی بێنە چنگ
گەر خاکی پێی دەڵێی، هەموو دەم وا بە دەستەوە [3]

گاوی فەلەك بە باری غەمی زگ دەهێنتە ئەرز
من چوومە ژێری بێ گلە بەم جیسمی خەستەوە [4]

---

١. ئەم غەزەلەی حاجیمان لە بڵاوکراوەی «رۆشنبیری نوێ»ی ژمارە ١٢ی رێکەوتی ١٩٧٤/٣/١١ وەرگرت کە بۆ یەکەمجار لەلایەن کاك کەمال مستەفا مەعرووفەوە بڵاوکراوەتەوە و ئەویش لە مامۆستا ڕۆستەم حەوێزی وەرگرتبوو پاشان لەسەر دەستنووسێکی لای کاك عبدالرزاق بیمار کە کاك «موحەممەدی مەلاکەریم» لە ڕووی نووسیبووەوە و ساغی کردبووەوە، ڕاستمان کردەوە. لە دیوانە دەستنووسەکەی «م.ر.س»یشدا لە لاپەڕە ٩٩دا هاتووە، ئێمەش وا بۆ یەکەمجار دەیخەینە پاڵ دیوانەکەی.

٢. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: ئەشگونجێ «تیروکەمانی» بێ و مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتەوە: هێشتا تیروکەوانی ڕاوی سەردەمی جوانی و لەزەت لێ وەرگرتنیم ئامادە نەکردبوو، پیر بووم و باڵای وەك تیپی «د» چەماوەم داری عاسای وەك تیپی «ا» ڕاستی بە دەستەوە گرت. ـ‌هەنگاوێ‌تر: ١٤٩].

٣. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەم بەیتەی بەم شێوەیە مانا لێداوەتەوە: ئەی فرستادەی من بۆلای یار کە هاوار و ناڵەمە لە جەور و ستەمی، برۆ بە ڕوویا هاوار بکە و بکڕووزێرەوە، بەڵکوو بۆنی عەتری سەری زولفت چنگ کەوێ، خۆ ئەگەر باسی دەسخستنی خاکی بەری پێی ئەکەی، ئەوە زەحمەت نییە دەسی‌خەی؛ چونکە خۆم هەمیشە لە ژێر پێیدا کەوتووم و خاکی بەری پێی بە دەس ئەماشمەوە و ئەیکەم بەسەرما. ـ‌هەنگاوێ‌تر: ١٥٠].

٤. دەقی نیوە دێڕی یەکەمان لە سەر دەستنووسەکەی «م.ر.س» ڕاست کردەوە.
[موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: لام وایە «دەنێتە» هەم لە «دێنە» و هەم لە «دەهێنتە» ڕاستترە و لەسەر زمان سووکترە و پڕ مەعناترە. ـ‌هەنگاوێ‌تر: ١٥١].

بۆ قەسری وەسفی ئەو مەهە میعماری فیکرەتم
وەستاوە کوللی لەحزە بە خۆی و کەرەستەوە

قوربان! ڕەقیبی سەگ سەروچاوی شکاندووم
چۆن بتگەمێ بە پێی شەل و دەستی شکەستەوە؟![1]

ئەو نەورەسەی ئیجارەیی مسکێنەکان دەکا
حەججاجە گەرچی سەییدە بەم خورج و هەستەوە[2]

تا سوبحی گەردەنی لە شەوی زوڵفی هەڵ نەیێ
«حاجی» مەڵێ بە تالیعی نوستوو: هەڵستەوە[3]



١. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «قوربان»، «دەستی» و لە جیاتی «بتگەمێ»، «پێت‌بگەم» هاتووە.
[موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: لە کاتی بەراوردکردنی دیوانەکەدا لە دەستنووسی مەلا ڕەئووفدا دیبووم کە لە باتی «سەروچاوی»، «دەس و پێی» هاتبوو، بەڵام پشت‌گوێم خست، بەڵام ئێستا «دەس و پێی»م لا ڕاسترە، چونکە شکاندن، زیاتر، بۆ دەست و پێیە نەك بۆ سەر و چاو. ـ هەنگاوێ‌تر: ١٥٢].
٢. لە دەقی «ع.م.ق»دا لە جیاتی «بەم خورجی هەستەوە» نووسراوە: «بەم خەرج و هەستەوە». بنوارە: «نووسەری کورد»ی ژمارە ٦ ساڵی ١٩٨١ خولی دووەم، ل: ٩٥. هەروا لە دەستنووسەکەی لای بیماریش «بەم خەرج و هەستەوە»یە. هەستە: هەستە و پیتاك.
[وەکوو موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: وشەی «هەستە» لە هیچ فەرهەنگێکی کوردیدا بە مای پیتاك نەهاتووە. کەوابوو لەوانەیە لە سەرەتادا وشەکە «دەستەوە» بێ، جا لەبەر شێوە نووسینی کۆنی کوردی گۆڕابێ، ئیتر تێکستی «بەم خورجی» ڕاستە و ئاوەهای لێ دێ: «بەم خورجی دەستەوە» کە مەبەست لە خورج، خورجی سواڵکەرە. ـ هەنگاوێ‌تر: ١٥٥].
٣. نیوە دێڕی یەکەممان لە سەر دەقەکانی «م.ر.س» و «م.م» ڕاست کردەوە، چونکە لە «ڕۆشنبیری نوێ»دا بەم‌جۆرە نووسراوە: «تا سوبحی گەردەن لە شەوی سوبحی هەڵنەیێ» سوبحی یەکەم ڕاستە چونکە بۆ گەردەنە، بەڵام سوبحی دووەم هەڵەیە چونکە نووسراوە: «لە شەوی سوبحی هەڵنەیێ»و ڕاستەکەی «لە شەوی زوڵفی هەڵنەیێ»یە.

(٤)

## ئەگەر جورعەی ڕەقیبت[١]

ئەگەر جورعەی ڕەقیبت لا گولاوە
نەکەی بیخۆیەوە پیس و گلاوە

لە نەغمەی موترب و مەی دانی ساقی
برینم کەوتە سۆ، داغم کولاوە[٢]

لە ڕێگەی تۆ ئەوی بێ پا و سەر بێ
پلۆقەی کەوشە، فەرقی بێ کڵاوە[٣]

مەلێ نایخوێنێتەوە نامەی فڵانی
لە برژان و لە سووتانا کوڵاوە

بە یادی کونجی تۆ «حاجی» وەکوو بووم
لە مەعموورە دەچێتە ناو کەلاوە



---

١. ئەم غەزەلەش لە هەمان بڵاوکراوەی «ڕۆشنبیری نوێ»دا لە لایەن کاک کەمال مستەفاوە بڵاو کراوەتەوە کە ئەویش لە مامۆستا ڕۆستەم حوێزی چنگ کەوتووە و لە ژمارە ١٣ی ڕێکەوتی ١٩٧٤/٣/٢١دا چاپ کراوە و لە لاپەڕە ٨٩ دەقی دەستنووسی «م.ر.س»یشدا هەیە. گەلێ شوێنی ئەم غەزەلەشمان لە ڕووی دەستنووسە ناوبراوەکەی کاک «عبدالرزاق بیمار» و بە گوێرەی بۆچوونی مامۆستا مەسعوود موحەممەد ڕاست کردەوە.

٢. لە دەقی «ڕۆشنبیری نوێ» و «م.ع.ق» و «عبدالرزاق بیمار»دا نووسراوە: «مەیدانی ساقی». ئێمە بە ڕای مامۆستا «م.م» ڕاستمان کردەوە و کردمان بە «مەی دانی ساقی»، بەڵام بە «مەیدانی ساقی»یش دێ.

٣. [پلۆقە: بلۆق، پۆڕگ، تلۆق. موحەممەدی مەلا کەریم ئەم بەیتەی ئاوا مانا لێداوەتەوە: ئەوی لە ڕێی خۆشەویستی تۆدا هەموو شتێکی دانابێ و خاوەنی پێ و سەری خۆی نەبێ، هەمیشە وێڵ و شێت و عەوداڵ ئەبێ و تلۆقی پێی بە هۆی گەڕانی زۆرەوە بۆی ئەبێ بە پێڵاو و کڵاویشی بەسەرەوە نابێ. ـ هەنگاوێ‌تر: ١٥٦].

(٥)

## باسی باوكی مەكە

باسی باوكی مەكە ئارامی نییە ئەو تەرەسە
ڕۆژێ جاسووسە، بە شەو تا بە سبەینێ عەسەسە![1]

ناكرێ مەدح و سەنای تۆ بە زوبان و بە قەڵەم
حەقە مەدحت نەكەم و قافیەزانیم عەبەسە[2]

شێر، وەكوو موورە لە لای زوڵفی كەمەند ئەندازی
فیلە مێشوولە یە، لێی لابدە، عەنقاش مەگەسە[3]

عادەتی گرتووە عوششاقی نەبێ هەڵناكا
وەرنە بۆ كوشتنیان نیمە نیگاهێكی بەسە[4]

لێوی وەك قەندە موكەڕڕەر لە دەما شیرینە
بۆیە تەكرارە وەكوو ناڵە ئەنیسی نەفەسە

چوونە ژێر باری ڕیاسەت كەری و ئەحمەقییە
لە قەتاریش ئەوی پێشەنگە عەلاوەی جەرەسە[5]

بوومی وێرانە بە ڕۆژ و سەگی ئەو كۆیە بە شەو
هەردووكی خزمی یەكن «حاجی» بە بێ خزم و كەسە[6]

---

١. عەسەس: پاسەوانی شەو. ٢. عەبەس: «عبث»: بێ‌هوودە، بێ‌سوود.

٣. موور وشەیەكی فارسییە بە مانای مێرووله دێ. [عەنقا: باڵندەیەكی خەیاڵییە، سیمورغ].

٤. نیوە دێڕی یەكەمی ئەم شیعرە لە دەقی «ر. كوردستان»دا بەمجۆرە هاتووە: «عادەتی گرتووە عوششاقی نەبێ ناژی ئەبەد». بەڵام ئێمە بۆ ڕاستكردنەوەی پشتمان بە دەقەكەی «م.ر.س» بەست و وەكوو ناو پارچە غەزەلەكەمان نووسی.

٥. عەلاوە: «العلاوة»: سەربار.

٦. [كۆ: كووی، كە لە فارسیدا مەبەست كۆڵان و بەردەرگایە. موحەممەدی مەلا كەریم وەها ☞

## (٦)

# ئەگەر خاڵت بڵێم

ئەگەر خاڵت بڵێم میشکی خەتایە
عەزیزی من ئەمەم عەینی خەتایە[١]

لە بەر نەوخێزی سەبزەی دەوری لێوت
تەنم کاهیدە میسلی بەرگی کایە[٢]

دەڵێن عەنناب و شەککەر چاکە بۆ دەرد
گوڵاوی لێوی تۆ بۆ من شیفایە[٣]

تەبیبم هاتە بالینم وەهای گوت:
درێغا! دەردی عیشقە، بێ‌دەوایە[٤]

ئەگەر کوفرە بڵێم من موبتەلاتم
وەرە سا بمکوژە، بیللا غەزایە

ئەوە خاڵە لە سەر گۆنای شەریفت؟
وە یاخود دانەیی داوی بەڵایە؟

---

☞

ئەم بەیتەی لێك داوەتەوە: تەنانەت ئەو بایەقوشەش کە بە ڕۆژ بەسەر کەلاوەوە ئەنیشێتەوە و ئەو سەگەی بە شەو پاسی ماڵ ئەکا، هیچ نەبێ لەبەر ئەوەکە تەنیان، بوون بە خزمی یەك، هەر «حاجی»یەکەسی نییە و بێ‌کەس و دەردە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٥٨].

١. خەتا: ناوچەیەکە لە وڵاتی چین بە جۆرە مامزێك ناودارەکە بۆنی میشکیان لە ناوك دەردەهێنن، هەروەك لەمەوبەریش لە پەراوێزی قەسیدەکەی «گوتم بە بەختی خەواڵوو»دا باسمان کرد. خەتا[ی دووەم]: لێرەدا بە مانای هەڵە و خەتاکردن دێ.

٢. کاهیدە: لاواز، بێ‌هێز، لەڕ.

٣. عەنناب: بەری جۆرە درەختێکە، دەنکی بەقەدر دانەی زەیتوون دەبێ و ڕەنگێکی سووری نایابی هەیە.

٤. [بالین: سەرین، سەردان لە نەخۆش].

خـــەمیدە قـامەتی داوی خـــەمی تـۆم
ئەمەندەی ڕاستە «حـاجی» بـێ ڕیـایە[١]



## (٧)

### ئەی موحەممەد[٢]

ئەی موحەممەد! وەی ئەمینوددەولە! ئیمڕۆ کۆیی تۆ
جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە

موددەتێکـە دەربـەدەر گـەردی دیـاری غـوربەتم
بەندە یادی ئـاستانبۆسـیی ئـەتۆی کـرد هـاتەوە[٣]

چونکە توحفە لازمە هەر کەس لە غوربەت بێتـەوە
بەم دوو فەردە من قەزای سەد گۆنە توحفەم کردەوە[٤]

قـــاوەچی بـــەزمی ئـــەتۆ دنـیایە، سـینی ئـاسمان
ئـــافتابی زەرفـــە، فـــنجانی مـــەهە، قـاوەی شـەوە

ئەو شەوە بۆ هەر کەسێ دونیا بکـاتە ڕۆژی ڕوون
شەو لە خیتتەی عومری ئەو عەنقایە دەربانی خەوە[٥]



---

١. خەمیدە: چەماوە، خوار.
٢. [سەرەتای ئەم غەزەلە وا پیشانئەداکە شیعرێك یا چەند شیعرێکی لە ئەوەڵەوە فەوتابێ].
٣. ئاستان بۆسی: دەرگەی دەرباری پاشا ماچکردن.
٤. توحفە: دیاریی نایاب.
٥. [خیتتە: مەڵبەند، هەرێم]. دەربان: دەرگەوان.

## (٨)

## ئەو فەلەك ڕیفعەتە

ئەو فەلەك ڕیفعەتە هەر لەحزە نیقابێکی هەیە
کێ دەزانێ وەکوو من خانەخەرابێکی هەیە

ڕاستە دڵ خەستە و بێچارە وەکوو نەرگسی تۆ
نەرگسی مەستی ئەتۆ بەس نییە خوابێکی هەیە[١]

شەمعی من سەرزەنشی قەت مەکە پەروانە ئەگەر
ئێستە خامۆشە، شەو ئەڵبەتتە جەوابێکی هەیە

شیعرەکانم کە غەریبی وەتەن و نەو سەفەرن،
وەرە بیخوونەوە ئەم نوقتە سەوابێکی هەیە[٢]

قەدری «حاجی» بگرن، مەقسەدی هەر دیدەنییە
وەرنە هەرچی بگری نانەك و ئابێکی هەیە!



١. خواب، خوابێکی: خەوێکی [خواب، وشەیەکی فارسییە] لە کاتی خوێندنەوەدا بە «خابێکی» دەردەبڕێ.
٢. مەبەست لەم نوقتەیە ئەوەیە، گەر لە وشەی «سەفەر» نوقتەیەك زیاد بکەین دەبێتە «سەقەر» واتا: جەهەننەم. ئەوەش بۆیە بە «ثواب» دادەنرێ، چونکە ئیسپاتی خۆشەویستی وەتەن دەکات، چونکە «حبّ الوطنِ منَ الإیمان».
[موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: مانای ئەم شیعرە بەم شێوەیە: خوێندنەوەی شیعرەکانم لە حوکمی دڵدانەوەدایە بۆیان، کە لە نیشتمان دوورکەوتوونەتەوە و تازەیش لێی دوورکەوتوونەتەوە و هێشتا ئولفەتیان بە غەریبییەوە نەگرتووە و لەبەر ئەوە دڵدانەوەیان، لە دڵدانەوانەی شیعری کەسێکی تر خێرترە کە دەمێك کەوتبێتە غەریبی و ئولفەتی بە نامۆییەوە گرتبێ. ـ هەنگاوێ تر: ١٦٣].

## (٩)

## بای وەعدە

بای وەعدە بەفری بردەوە، یەخبەندی کـردەوە
گوڵ شەمعی پێ‌کرا، شەرەری جەمرە مردەوە[١]

ئەسپی ڕەش و سپی بە گرەو غاردەدەن بە تـاو
وەك ڕۆژ و شەو دیارە لە شـەو ڕۆژ دەبـاتەوە[٢]

بولبول دەخوێنێ، با لە دەفی بەرگی گـوڵ دەدا
غونچە لە بـاتی گـوێ بگـرێ، دەم دەکـاتەوە[٣]

نەرگس لە مێرغـوزار دەزانـی بـەچی دەچـێ؟
بـنوارە ئـاسمان لە شـەوا عـەینهی ئـەوە[٤]

تامی نـەماوە قـیسسە و فـورسەت غـەنیمەتە،
مەعلوومی خاس و عامە هەچی چوو نەهاتەوە[٥]

---

١. یەخبەند: سەهۆڵ، شەختە. [شەرەر: پزووسکە، ئاورینگ. جەمرە: سکڵ، ژیـلەمۆ]. نـیوە دیڕی دووەمان لە دەقی «م.رس»وە وەرگرت.

٢. ئەم نیوە دێڕەمان لە سەر دەقی «ر.كوردستان» تۆمار كرد.

٣. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: شاعیر ویستوویەتی حەڵقەیێکی تەواو زیکر یا کۆڕێکی گەرمی بەزم و سەما پێکەوە بنێ، لەلایەکەوە بولبول بخوێنێ و لەلایەکی‌تریشەوە "با" لە دەفی گەڵای گوڵان لێبدا و غونچەی ملکەچیش لەباتی ئەوەی گوێ بۆ ئەم گۆرانی و بەزمە شل بکا، دەمی هاوار دەکاتەوە و دەپشکوێ. پاش ئەم لێکدانەوەیە، ئەڵێ: ئـەی هـەزار ئـافەرین حاجی قادری هونەرمەند! لە کـوێن ئـەو بـێ‌ئـاگـایانەی کـە هـەر بـە شـاعیری سیاسەت و کۆمەڵایەتیت لە قەڵەم دەدەن و دان بە هونەری شیعرتا نانێن؟. ـهەنگاوێ‌تر: ١٦٥].

٤. ئەم دێڕەمان لە سەر دەقی «م.م» ڕاست کردەوە.

٥. ئەم نیوە دێڕەشمان هەر لە سەر دەقی «م.م» ڕاست کردەوە.

میسلی شەراری کاغەزە سووتاوە عومرمان
ڕۆمی کە دەفع بوو گریی دڵ دەفع دەبێتەوە[١]

لەم وەقتە هەرکەسێ وەکوو «حاجی» لە گوڵشەنا
دەستە گوڵی بە دەستەوەیە دەستی بردەوە[٢]



## (١٠)

## تا گوڵی ڕوخساری تۆ

تا گوڵی ڕوخساری تۆ وەك من هەزاری عاشیقە
ڕاستی قەددت لەسەر سەرو و سنەوبەر فائیقە[٣]

با لە هەردوولا بە زوڵفت باوەشێنی لێ نەکا
مێشی خاڵت نافڕێ پابەندی شەهدی ڕائیقە[٤]

بۆچی گوڵ پێ‌ناکەنێ ئاهم سەحابی باغیە
گریە بارانی بەهارە، ناڵە ڕەعدی باریقە[٥]

---

١. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: نیوەی دووەمی ئەم بەیتە هەرچی لێ بکەی هەر لەنگە، لە ئەو سێ نوسخەکەی‌تریش‌دا کە بەم شێوەیە: «هەروا یەکێکی درەوشاوە مردووە» هەر لەنگە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٦٧.].

٢. ئەم دوو دێڕەی شەشەم و حەوتەمە تەنیا لە دەقی «ع.س»دا هاتووە. (نیوەی دێڕی یەکەمی بەیتی حەوتەم بە گوێرەی دەستنووسێکی لای منە. لە تێکستی ئەسڵیدا بەمجۆرە بوو: «هەرکەس لە وەختی گوڵشەنا هەروەکوو حاجییە». «موحەممەدی مەلاکەریم»).

٣. هەزار: بەمانای هەزار کەس و بە مانای بولبول دێ هەروەك لەمەوبەریش گوتراوە.

٤. شەهدی ڕائیقە: هەنگوینی ساف.

٥. [سەحابی باغیە: هەوری ڕەش و بە بارانی توند، یان هەوری باغی ئەوە. ڕەعدی باریقە: چەخماخەی برووسکەهاویژ و بەتیشك].

شەو لە داغی عاریزت ڕیشی سپی بوو ئاسمان
گەر دەڵێی کەززابە ھا بورھانی سوبحی سادیقە[1]

سونبولی زوڵفت پەرێشانە، قەدی سەروت بڵند
دڵ پەرێشانی پەسەندە نالەباری لائیقە

حاسڵی وەسفی گوڵم نایێتە سەر حەدد و بەیان
شیرنی فەرھادە، لەیلای قەیسە، عەزرای وامیقە[2]

من ئەبێ بمرم ئەگەر مەنعم نەکا «حاجی» لە خۆی
با جەوابی «لنْ ترانـي»، «خرَّ موسىٰ» ساعیقە[3]



---

١. [کەززاب: درۆزن، مەبەست کازێوەیە کە بن ئاسمان ڕووناك دەبێتەوە و پاشان زووش تاریک ئەبێتەوە. سوبحی سادق: جاری دووھەم کە قەراخی ئاسمان ڕووناك دەبێتەوە و ئیدی تاریك نابێ. بورھان: بەڵگە]. عاریز: ڕوومەت، ڕوخسار.

٢. [حەدد: پێناسە. لەیلای قەیس: لەیلای دڵداری قەیسی عامیری مەشھوور بە مەجنوون. عەزرای وامیق: عەزرا دڵداری وامیقە، چیرۆکی ئەو دوو دڵدارە دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی ئەسکەندەری مەگدوونی (ڕۆمی) پێش لە ئیسلام].

٣. [ئەم بەیتە ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿وَ لَمَّا جَاءَ مُوسٰى لِمِيقاتِنَا وَ كَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ قَالَ: لَنْ تَرَانِي وَ لٰكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي، فَلَمَّا تَجَلّٰى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكّاً وَ خَرَّ مُوسٰى صَعِقاً﴾ واتە: کاتێ مووسا ھات بۆ جێژوان و لەگەڵ خوای وتووێژی کرد، گوتی: ئەی پەروەردگارم! خۆت بدە نیشانم با بڕوانم بۆت، خوا فەرمووی: تۆ قەت من نابینی، بەڵام سەیری ئەو کێوە بکە ئەگەر لە جێی خۆی قەراری گرت ئەوە من دەبینی، کاتێ خوا نووری خۆی خستە سەر کێوەکە، کێوەکەی پریش پریشەوە کرد و مووسا دەس بەجێ لەسەر خۆی چوو و ڕما].

## (١١)
## دولبەرم مامزییە

دولبـەرم مـامزییە، بـازی بـە ڕەفـتاری کـەوە
ئەی دڵی خەستە! وەکوو گوربە، بە شوێنی مەکەوە[١]

داغـداری ڕوخـیە لالەیـی حـەمرا لە چـەمەن
نـەرگسەچاو لەبـەری غـەمزەیی غـەممازی ئـەوە

چی لە من داوە ئەجەل حـەقی نـییە بێتـە سـەرم
خۆم ئەسیرم، دڵە نەزرە، ئـەوە جـانشینی گـرەوە[٢]

حەزدەکەی سوبحی قیامەت لە شـەوا دەربکـەوێ
پـێی بـڵێ: دوگـمەیی ئـاوێنـەیی سینەت بکـەوە

سەفەری زوڵفی مەکە «حاجی» شەوت لێ‌دەگەڕێ
با وجـوود ڕۆژە لە لات وایـە کـە تـاریکە شـەوە[٣]



## (١٢)
## تەماشای قامەتم

تەماشای قامەتم پیری چلۆن تیری عـەسای دایـە!
درۆیـە "داری گـەورە وەك نـەمامی تـازە دانـایە"[٤]

---

١. گوربە: وشەیەکی فارسییە، بە مانای پشیلە دێ.
٢. ئەم دێڕە شیعرە تەنها لە دەقی «م.ر.س»دا هەیە.
٣. ئەم دێڕە شیعرەی کۆتاییش تەنها لە دەقی «م.ر.س»دا هەیە.
٤. لە دەقی «ع.م.ق»دا نیوە دێڕی شیعری یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «تەماشای قـامەتی پـیری چلۆن تیری عەسای دایێ». بڕوانە: گۆڤاری «بەیان»ی ژمارە «٥٣»ی سـاڵی ١٩٧٩. دانـایە: دانایێ، ناچەمێتەوە ئەمە پەندێکی پێشینانە حاجی بەکاری هێناوە، ل:٢٠٤ خاڵ.

ڕقی لێمە فەلەك، ساقی کەرەم فەرموو ڕەقی بێنە
ڕقی وشکی لە تۆ نایە ئەمان موتریب! لە تۆ نایە[1]

لە دنیا ئەمتیعەی وەسلی لەگەڵ من ناکرێ سەودا
هەموو چین و خەتا لەم لا لە زوڵفی لام هوەیدایە[2]

کەلیمە ئەو دەمە، زوڵفی عەسایە، خەتتی فیرعەونە
یەدی بەیزایەتی گەردن، جەبینی تووری سینایە[3]

سولەیمانێکە «نالی» خاوەنی دیوان و فەرمانە
نییەکەس بێتە مەیدانی مەگەر «حاجی» خودئاسایە[4]



---



[مەبەستی حاجی ئەوەیە بڵێ: ئەم مەسەلە درۆیە؛ چونکە ئەمن گەورەم و داهاتووم و چەماومەتەوە].

١. [موتریب: ژەنیار، گۆرانیبێژ]. نایە: نایێ، نای ئامێرێکی مۆسیقایە. دیسان لە دەقی «م.ع.ق»دا ئەم شیعرە بەمجۆرەی خوارەوە نووسراوە:
«ڕقی لێمە فەلەك ساقی کەرەم فەرموو ڕیفێ بێنە
ڕقی وشکە لە تۆ نایێ ئەمان موتریب لە نۆ نایێ!!». بڕوانە گۆڤاری «بەیان»ی ژمارە ٥٣ی ساڵی ١٩٧٩.

٢. سەودا: مامڵەت. هوەیدا: ئاشکرا.

٣. [حاجی لەم شیعرەیدا ئەندامی دولبەرەکەی شوبهاندووە بە حەزرەتی مووسا و ئەو شتانەی پەیوەندیان بەوەوە هەیە، بەم ڕەنگە: دەمی وەکوو دەمی کەلیمی ئەوە، زوڵفی وەکوو گۆچانەکەی ئەو دەبێتە مار و موعجیزە، خاڵ و خەتی وەکوو فیرعەون زاڵم و خوێنڕێژە و گەردەنی وەکوو دەستی نوورینی ئەو سپی و نوورانییە و ناوچاوانی وەکوو کێوی توور ڕۆشن و پیرۆزە].

٤. ئەم نیوە دێڕەمان لەسەر دەقی «م.م» ڕاست کردەوە. [موحەممەدی مەلا کەریم لەسەر بۆ چوونی کاك عەبدوڕڕەزاقە، پێی وایە وشەی «خاوەن» دەسکردە و لە جێی «ساحیب» دانراوە؛ چونکە ئەمە لەگەڵ شیعری کۆنی کوردیدا جۆرترە].

## (١٣)

# جەهلی ئیشکالی مەسائیل

جەهلی ئیشکالی مەسائیل وا خەتی زانینمە
زولفی تۆ قەید و حەواشی سیلسیلەی ئاهینمە[١]

دەخڵی خەرجی خۆمە بارانی نەباتاتی زەوی
هەوری پاییز ڕوویی سووتان خوسرەوی هاوینمە

خامە داخوازی دەکا ئەبکاری مەعنا، پێی دەڵێ:
ڕووسیاهی دوو زمان، قەتعی سەرت کابینمە[٢]

ڕۆژی هیجران مەیلی ئەغیاری هەبوو ها بمکوژە
حامیلی باری غەمت هەر گیانە چاو خائینمە

عەزمی تابووری سەفی موژگانی تۆ بۆم هات بەتاو
هێرشی بۆ قەلعەیی ئیمانە یا ئایینمە[٣]

---

١. ئاهین: ئاسن، سیلسیلەی ئاهین: زنجیری ئاسن.

٢. [خامە: پێنووس. کابین: مارەیی بۆ ژن هێنان. ئەبکار، کۆی بیکر: کچ، دەست نەخواردوو قەتعی سەرت: سەربڕینت. موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: واتە: قەڵەم خوازبێنی کچی مەعنای لەوەپێش بە بیری کەسانەهاتوو ئەکا، بیدرێتێ بە سەر نووکیا بێ و بیخاتە سەر کاغەز. ئەویش لە وەڵاما پێی ئەڵێ مارەیی ئەم مەعنا لەوەپێش بە بیری کەسا نەهاتوانە کەکچی بیکری منن ئەوەیە سەرت ببڕم. مەبەستی بەیتەکە دێتە سەر ئەوە کە بۆ ئەوەی مرۆ بتوانێ مەعنای ورد و تیژی بە بیری کەسا نەهاتوو بخاتە سەر کاغەز ئەبێ نووکی قەڵەمە قامیشە بە مەرەکەب ڕەش هەڵگەڕاوە دوو زمانەکەی دابدا و تیژی بکا. ـهەنگاوێ‌تر: ١٧٥]. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «ڕووسیاه و دوو زمان»، بەڵام کە ئێمە سەیری دەقی «م.ر.س»مان کرد بینیمان «ڕووسیاهی دوو زمان» نووسراوە و وا تۆمارمان کرد، چونکە دوو ئاوەڵناو بە ئامرازی پێوەندی (ی) بخرێنە پاڵ یەك ڕەوانترە تا بە هۆی ئامرازی بەستنەوە (عطف) کە «و»ەیە.

٣. [تابوور: ڕیزی لەشکر و سپا].

سەیری «حاجی» کردووە یار هات و ئێستا دەیکوژێ
یـا خـودا وابـێ ئـەمن چـەند ساڵە وا ئـامینمە[١]



## (١٤)
## ڕۆستەمی مازەندەران

ڕۆستەمی مازەندەران ئـەو وەقـتە دەسـتی بـردەوە
هـاتە ڕێی «دێوی سپی» ئـازانـە دەسـتی کـردەوە

هەروەکوو شارانی‌تر کەس ئاشنای کـۆیـێ نـەبوو
شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسـەر کـۆکـردەوە

هەر کەسێکی دایە بەر شـەق زاڵی دونـیایی دەنـی
گۆی لە مەیدانی جەوانـمەردانـی عـوقبا بـردەوە[٢]

ئەم هەموو زوڵمەی ڕەقیب کردی لە ئاخیر دولبەرم
مـاڵی ئـاوا بـێ بـە مـاچی لێوی تـۆڵەی کـردەوە

داستانی هیجری من شەرحی بە نووسین نـاکـرێ
پێت دەڵێم: چۆنە ئەگەر چاوم بە چاوت کـەوتەوە

ئاهی من سوورە، چیا وەك لۆکـە هـەڵلاجی دەکـا
عـوقدەیی زولفـی گـرێی مـویینە بـا نـایکاتەوە[٣]

---

١. ئامینمە: دوعامە، یاخود هەر داوای دوعاکردن و دوعا قبوڵ کردن دەکەم.
٢. [دەنی: پەست]. جەوانمەردان: کۆکراوەی جەوانمەردە و بە مانای بەخشندە و بەخشندەکان، یاخود مەردی ئازا [و جوامێر] دێ. عوقبا: قیامەت، ڕۆژی دوایی.
٣. سوور [صور]: ئەو بۆرییەی کە ڕۆژی قیامەت لێ دەدرێ و چیاکـان وەکـوو لۆکـە پـەڕە دەکرێن.

هەرکە بیستم پێم دەڵێ: «حاجی» سەگی دەرگانەمە
من لە ترسی گورگی بەدکارم کەری خۆم بەستەوە[١]



## (١٥)
## عەسا و قامەتم

عەسا و قامەتم تیر و کەوانە
کەچی دڵ تالیبی ڕەوتی کەوانە[٢]

ئەگەر جەمعی وەکوو عەقدی سورەییا
پەریشانت دەکەم وەك حەفتەوانە[٣]

هەتاکەی هەروەها شەققەی سمت دێ
غەم و غوسسەی جیهان باری گرانە

ددان و مووی سەری وەك کوهنە پیران
نیشانەی داوەشان و هەڵوەرانە[٤]

جەوانی وەك جوانی کەوتە داوی
لغاوی ڕیشیە، زینی ڕەوانە[٥]

---

١. [واتە: هەر گوێم لێبوو یار قسەیەکی لوتفی دەربارە کردم و بە سەگی بەردەرگای خۆیی دانام، زانیم کە بەدکار لە داخا ئەکەوێتە تەقەلای زیان پێگەیاندن و لێ تێکدانم، لەبەر ئەوە لە ترسی کار و باری خۆم ڕێکخست نەوەك بتوانێ دەستێکم لێ بوەشێنێ. ـهەنگاوێ‌تر: ١٧٨].

٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «ڕەوتی کەوان»، «ڕوویی کەوان» نووسراوە. بەڵام ئێمە لە سەر دەقی «م.م» وەکوو سەرەوەمان نووسی.

٣. [حەوتەوانە: حەوت ئەستێرەی نزیك بەیەك، حەوت براڵە]. سوورەییا: کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ «پێروو»ە.

٤. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «کوهنە پیران»، «کۆنە و پیر» هاتووە.

٥. جەوانی: جەحێڵی، گەنجیەتی. جوانی: جوانووی ماین. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: لەبەر سەنگی بەیتە ئەبێ وشەی «جوانی» بە «جووانی» بخوێنرێتەوە. ـهەنگاوێ‌تر: ١٨١].

بەسەرچوو خەتتی سەبزی، مژدە ئەی دڵ
دەمـــی دروێنـــەیە و خـــەرمان و دانــە

ئــەوی خــۆشــم دەوێ مـیسلم نـەدیوە
بـە غـەیرەز خـۆی لە ژێر ئـەم ئـاسمانە

لە بەینی زوڵف و خـاڵ و نـوونی ئـەبرۆ
بـــە ئــەلفی قــامەتی جــانی جــیهانە

لە هــەردوو لامــەوە زوڵفـــی دوو لانــە
ئــــەسیری کــــردم و بـــێ ئــاشیانە[1]

لە ڕۆمــا گــەر مــەتاعێ بـــێ تــەماعی
بـە خـــۆڕایـــی بــدەن هــێشتا گـرانـە

"ئـــــەبووزەڕ" مـــالیکی دنـــیایە لێرە
ئەوی "غازی" هـەیە سـاحێب "قـرانـە"[2]

ئەگەر توججاری «حـاجی»! پـارە بـێنە
مـــەتاعە نــێك و بـــەد، دنــیا دووکـانە[3]

لە بــۆ عــوقبا بــزانـە کـام بـەکـەڵ دێ
ئــەتۆ مــوختاری ئــێســتا لەم مــیانە[4]

---

١. لە هەندێ دەقدا «دوولاتە» هاتووە. ئاشیانە: هێلانە. [واتە: چ لەبەرانبەری یارا دانیشی و چ لای ڕاستی و چ لای چەپیا، زوڵفی لە بەرانبەری، یان پاڵیایەتی و دیلی ئەکا].
٢. ئەبووزەڕ: مەبەستی لە ئەبووزەڕی غەفارییە کە سەحابەیەکـی بـێ‌پـارە و پـوول و هـەژار بووە. غازی و قران: دوو جۆرە پارەی کۆنـن. دوو وشـەی «سـاحیب» و «قـران» پێکـەوە بـە «ساحیبقران»یش ئەخوێنرێتەوە و بەو جۆرەش مەعنایەکی ناسکی تر پێکدێ.
٣. نیك و بەد: چاك و خراپ.
٤. بەکەڵ دێ: کورت کراوی «بەکەڵك دێ»یە.

## (۱٦)

## خەزنەییێکە بەیتی من

خـەزنەییێکـە بـەیتی مـن دوو مـیسرەعم داخسـتووە
کەس تـەماعی تـێنـەکـا ڕێگـای دزم لێ بـەستووە[1]

بـــیکەبەر دیــبایی نــەزمم تــا قــیامەت نــادڕێ
چــونکە ئـەبکاری مـەعانی تـار و پـۆیـی ڕسـتووە[2]

زاهیرەن بەیتم لە «نالی» و «کوردی» زۆر کـەمتر نـییە
تــالعم بــەرگەشتەیە، بــەدبەختە بــەختم نـوستووە

باسی حوور و باسی غیلمان و پەری بۆ من مـەکـەن
وەك مەهی بێمیهری خۆم نەمدیتووە و نـەمبیستووە[3]

نیوەشەو گەر دەرکەوێ وەك ماهی سەرکەل تـەلعەتی
وادەزانــن ئــافتاب و مــوشتەری ســەر بســتووە[4]

دەستوپێی ئەو پادشاهی حوسنە کوێلـەم پـێدەڵێن
هێندە ئەنگوستی پەشیمانیم لە حەسرەت گـەستووە[5]

---

١. میسرەع: «المصراع»، لادەرکەی ژوور، لێرەدا بە نیوە دێڕە شیعر دەگوترێ. [لێرەدا «بەیتی» هەم بە مانا ماڵ و هەم بە مانا دوو نیوە شیعر بەکار بردووە، میسرەعیش هەروەها].

٢. [بیکەبەر: لەبەری بکە وەکو کراسی هاوریشم، یان بیخوێنەوە و لەبەری بکە. دیبا: پارچەیەکی هەوریشمەکە زۆر پتەوە و نەدڕە، ئەبکاری مەعانی: مەعنا و وردەکارییەکی تازەکە کەس پێی نەزانیوە].

٣. [حوور: ئەو ژنە جوانانەی کە خودا لە قورئاندا باسی جوانیانی کردووە و تەیاری کردوون بۆ بەهەشتیان. غیلمان، کۆی غولام: مەبەست گەنج و لاوانی بەهەشتەکە زۆر جوانن].

٤. ئافتاب و موشتەری: ئافتاب ڕۆژە، موشتەریش ئەستێرەیەکی گەڕۆکە لە کۆمەڵەی خۆر بۆ دووری لە زەوی ئێمەوە لە دوای مەریخەوە دێ. بستوو: لێرەدا بە مانای ئاسۆ دێ.

٥. دەستوپێ: خزمەتکار، نۆکەر. کوێلە: بەندە، عەبد.

دڵ لەکونجی سینەداگەر خوێن دەنۆشێ و غەم دەخوا
«حاجی» بۆ قوربانی عیدی وەسڵی تـۆ دایـبەستووە[1]



## (١٧)
## غەم مەخۆ بۆ نان و خوانت

غەم مەخۆ بۆ نان و خوانت خەڵقی هێشـتا نـوستووە
زاڵەکــەی دنــیا تــەنووری مـەشریقی داخســتووە[2]

بێخەویم دایێ نەخۆشـیم لێ کـڕی چـاوی کـەچی
وەك من و بەختی سیاهیم هەر نـەخۆش و نـوستووە

لێت دەشــێوێ هــەر کـە زولفـەینی پـەشێوی لابـدا
مــاهتابی ســەرکەلە یــا ڕۆژەکـەی سـەر بسـتووە[3]

دولبــەرم بــەرمامکی دابــوو لەبــەر ئـێشـی ددان
وادەزانــن ڕوومــەتیم ئـەمشەو لە خـەودا گـەستووە

تاقەت و سەبرم ئەگـەر ڕوویـین‌تەنی "ئـەفراسـیاب"
"ڕۆستەم"ی هیجری لە ئەرزی داوە دەستی بەستووە[4]

---

١. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «خوێن» وشەی «خوێنی» هاتووە، بۆیەگەڕاینەوە سەر دەقەکانی «م.ر.س» و «ر.کوردستان»و پشتمان پێ بەستن. چونکە کێشەکەی لەم دوو سەرچاوەدا تەواوە.

٢. [زاڵ: سەرسپی، لێرە مەبەست پیرەژنی سەرسپییە، هەر چەند موحەممەدی مەلا کـەریم ئەڵێ مەبەست پیرە پیاوە، بەڵام بە قەرینەی تەنوورداخستن ـکە کاری ژنانەیە ـ و دونیا کە بە موئەننەسی هاتووە، وادیارە پیرەژن مەبەست بێ].

٣. [بستوو: کەل، گەردەنە، یاڵ].

٤. ڕوویـین‌تەن: ئـەو پـاڵەوانـە بـەهێزەیـە کـە تـیغ کـار لە جـەستەی نـاکـات. [ئـەفراسـیاب: کەسایەتییەکەی ئەفسانەیی شانامەی فیردەوسییە].

ئەی سەبا یارم ئەگەر پرسی لە حاڵم پێی بڵێ:
مابوو تا ئەو وەقتە هاتم وادەزانم مردووە

غەم مەخۆ قوربان لە بۆ قوربانی عیدی وەسلی تۆ
موددەیێکە بەو ئومێدە «حاجی» خۆی دابەستووە![1]



## (١٨)

## قیسسەی شەبی هیجرانی

قیسسەی شەبی هیجرانی مەکە باسی سبەینە
لەو شامەوە تا سوبحی دوو سەد فەرسەخی بەینە[2]

مەورووسی تووە خولقی حەسەن، حوسنی خەلایق
چونکی کە موسەغغەر بکرێن هەردوو حوسەینە[3]

"قانوون"ی "شیفا"بەخشی نیگاهت بە "ئیشارات"
جەللادی ڕمووزی کوتوبی حیکمەتی عەینە[4]

زاهیر مەکە دەللاکی بە "مووسا"ی یەدی بەیزات
بۆ خەتتی یەهوودی کە شەڕی بەدر و حونەینە[5]

---

١. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «تۆ»، «خۆت» هاتووە.

٢. شام و سوبح: ئێوارە و سبەینە.

٣. [مەورووسی: میرات. خولقی حەسەن: ئاکار و ڕەوشتی جوان. حوسنی خەلایق: خوو و عادەتی ڕێك‌وپێك یان تایبەتمەندیەکی سروشتی]. موسەغغەر بکرێن: بچووك بکرێنەوە. [لەم شیعرەوە وا دەرئەکەوێ کە حاجی ئەم پارچە شیعرەی بۆ حوسەین ناوێك نووسیبێ چونکە ئەڵێ: حوسەین، بچووك‌کراوەی حوسنی خەلایق و خولقی حەسەنە، کە وشەی حەسەن و حوسن ئەگەر بچووك بکرێنەوە هەردووکیان دەبنە: حوسەین].

٤. [قانوون، شیفا و ئیشارات: نێوی سێ کتێبی ئەبوو عەلی سینان].

٥. [دەللاك: سەرتاش. یەدی بەیزا: موعجیزەیەکی حەزرەتی مووسایە، کە وەك ئیدیۆم

تا سادە بوو جانی نەدەویست ئێستێکە لەعلی
دوو شاهدی مەستی خەتی هێناوە کە بەینە

دڵ گەرمە بە دەوری قەمەری گەردشی چەرخی
خورشیدی زەمانە کە هەموو مووجیبی بەینە[1]

یار هاتەوە فەرمووی خەتم هێناوە بە سەوقات
پێمگوت: ئەگەر ئەم توحفەیە بۆ «حاجی»یە مەینە[2]



## (۱۹)

## لە سەر شەو ڕۆژی داناوە

لە سەر شەو ڕۆژی داناوە، مەڵێن فێسی لەسەر ناوە
لە بەر با جامی یاقووتی بە میشکی وشکی داداوە[3]

---



کەڵکی لێوەرئەگیرێت بۆ هەڵمەت و دەستوبرد و لێزانی. موحەممەدی مەلاکەریم سەبارەت بەم بەیتە ئەڵێ: ئەم بەیتە تابلۆیەکی چڕی تێدایە. لەلایەکەوە بەرچاوگرتنی یەدی بەیزای موعجیزەی مووسای پێغەمبەر ـکە «مووسا» بە تیغیش ئەوترێ ـ دەستی چەقۆ هەڵگرتووی دۆست، بە مەبەستی لابردنی مووی ڕەشی ڕووی، شوبهێنراوە بە یەدی بەیزای مووسای پێغەمبەر، بەڵام نەك بۆ بەتاڵ کردنەوەی سیحری فیرعەون، بەڵکوو بۆ کوشتنی جوولەکە کە دەستەی حەزرەتی مووسا خۆینی، وەك چۆن مووەکانی ڕووی دۆست هی خۆینی. لەلایەکی تریشەوە کاری تاشینەکە خۆی شوبهێنراوە بە شەڕی بەدر و حونەین کە دوو شەڕی پێغەمبەری ئیسلامن، یەکەم دژی کافرەکانی قورەیش و دووهەم دژی کافرەکانی هەوازین و سەقیف. ـهەنگاوێ‌تر: ۱۸۹].

۱. گەردشی چەرخە: سووڕانەوەی گەردوون. [مووجیبی بەینە: هۆی جیابوونەوە و فیراقە].

۲. ئەم دەقە لەلای «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «پێمگوت: ئەگەر ئەم دیارییە بۆ حاجییە مەینە».

۳. [فێس: کڵاوی سووری تورکەکان]. لە دەقی موحەممەد عەلی قەرداغیدا «مەڵێ» نووسراوە و لە جیاتی «یاقووتی»، «یاقووتە» نووسراوە. بڕوانە: «گۆڤاری بەیان»ی ژمارە «۵۵»ی ساڵی ۱۹۷۹.

له دامێنی چیا بۆ خەرمەنی گوڵ خێوەتی خارا
بە دوو ئەستووندەکەی زیوین تەنافی زوڵفی هەڵداوە[١]

لەبەرقی ڕەنگی شەڕواڵی حەیا دامێنی هەڵماڵی
له تەقەی دەنگی خڵخاڵی لە گەردوون زوهرە داماوە[٢]

له تەقەی ناڵ و شەقەی پانیبەرزی ئاسمان لەرزی
تەق‌وتۆق کەوتە سەر ئەرزی، دەڵێێ مەحشەر هەڵستاوە[٣]

له ناوەی هەڵگەڕاوەی زوڵفی خاڵی ڕەش تەماشاکەن
بۆ تەیری دڵ بیعەینیهی دەڵێی ئەم دانە ئەو داوە[٤]

---

١. خێوەتی خارا: بە خێوەتێك دەگوترێ لە جۆرە ئاوریشمێك دروست کرابێ. [واتە: له داوێنی چیای سەریەوە تا خەرمانی گوڵی سنگ و مەمکی، خێوەتەکەیش سوخمەکەی بەریەتی. ـهەنگاوێتر: ١٩٠. موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: لام وایە «ئەستووندەکی» ڕاستترە لە «ئەستووندەکەی» ].

٢. لە دەقەکانی «ع.س» و «گ.م»دا لە جیاتی «شەڕواڵی» وشەی «شەڵواری» هاتووە و لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «دامێنی» و شەی «داوێنی» هاتووە و لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا لە جیاتی «خڵخاڵی» وشەی «خرخاڵی» هاتووە.

٣. لە دەقی «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرەی خوارەوە هاتووە:
«تەق‌وتوق کەوتە نێو ئەرزی دەڵێن مەحشەر هەڵستاوە».

٤. ئەم بەیتە لە یەکێ لە دوو دەستنووسەکەی لای مندا هەبوو لێرەدا نووسیمەوە «موحەممەدی مەلا کەریم».

[مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لەبارەی ئەم بەیتەوە وتوویە: «لە ناوەی» نییە و «لە تاویە» و «زوڵفی خاڵی» نییە و «زوڵف و خاڵی»یە، ئینجا خەڵق لە ناو زوڵفی ڕەشا بۆچ تەماشای خاڵی ڕەش بکەن؟! خاڵ ڕەش بێ یا شین، کاتێ جوانە بە سەر گۆنایەکی سپییەوە بێ. موحەممەدی مەلا کەریمیش ئەڵێ: ئەم بۆچوونەم بە دڵە بەم مەرجانە: وشەی «هەڵگەڕاوەی» بکرێ بە «هەڵکراوی» یان «هەڵگەڕاوی» و «زوڵفی» بکرێ بە «زوڵف و» تا مەعنای نیوبەیتەکە وای لێ بێتەوە: «سەیری تاڵی هەڵکراوی و پێچراوەی»، یان تاڵی هەڵگەڕاوە و لوولخواردووی زوڵفی یار و خاڵی ڕەشی بکەن. ـهەنگاوێتر: ١٩٣.]

بە سەد خوونی جگەر فێری نیاز و ناز و عیشوەم کرد
کەچی ئێستا کە دەمگاتێ دەڵێ: سا لاچۆ بەولاوە

لە تەسویری قەڵەم مووی کەوتە بەردەم نوقتەکی دانا
ئەوی کردە کەمەر نەققاش ئەمی بۆ زاری داناوە[1]

دەری تۆ «کەعبە» بوو «حاجی» تەوافی کرد و نەیزانی
چ قەوما کەعبە کەچ بوو «مەسجیدولئەقسا»یە ڕووخاوە![2]



## (٢٠)

## بە ڕوخ و زولفی شەو و ڕۆژی

بە ڕوخ و زولفی شەو و ڕۆژی هەتا ڕۆژ و شەوە
گرپەیی دەم بە دەمم دوژمنی خوونینی خەوە

فیتنەیی غەمزە و نازی نیگەه و چاوە کەوا
هات و هاوار و هەرا و گێچەڵ و تاڵان و ڕەوە

دڵ لە فیکری دەهەنت هالیکی ڕێگەی عەدەمە
یا موقیمی سەری زوڵفی تووە یا ڕاهڕەوە[3]

لەگەڵ ئەم ئاهووە دێ ئەم سەگی ڕێش کۆن و نوێ
دێتە سۆ دێتەوە سوو ڕێشی کە کەونە جدەوە[4]

---

١. ئەم دێڕە لە دەقی «ع.س»دا نییە.
٢. لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «دەری تۆ کەعبەیە».
٣. دەهەن: وشەیەکی فارسییە بە مانای دەم دێ. هالیك: هالك، وشەیەکی عەرەبییە بە مانای مردوو یا فەوتاو دێ. ڕاهڕەو: ڕێبوار، «عابر سبیل».
٤. ڕێش: لێرەدا بە مانای زام، برین دێ. [جدەو: لە کار کەوتوو، یان وڵاخە بەرزەی پشت بریندار. ـهەنگاوێ‌تر: ١٨١].

لە بەهای موژدەیی وەسڵی قـەدەمی چت بـدەمێ
دڵ ئەنیسی سەری کۆی دولبەرە جـانیش گـرەوە[1]



## (٢١)

## لە دەوری خاڵەکەی کوڵمی

لە دەوری خاڵەکـەی کـوڵمـی کـە مـاری زوڵفـی دانـاوە
لە سەر تەسویرەکەی ئادەم مەلەك سەد عـوزری هـێنـاوە

شەوی میعراجی سوبحانە بە قەددی سەروی تـۆی زانـی
لە «سیدرە» جوبرەئیل بـۆیـێ لە نـیوەی ڕێگـە لایـداوە[2]

کە شەیتان تاقی میحرابی برۆی تۆی دی وتی: «یـارب!»
لە سەجدەی حەزرەتی ئادەم سەری خۆم بۆچی بـاداوە!

بـــەڵام ئـەی وشکـە شـێخـانی زەمـانە پـێمبـڵێن ئـاخر
لەبەرچی پـەرچـەمی سـاقی لە سـوبحی جـەبهە تـۆراوە

بـــەغەیرەز بـــاسی ئـەو زارە مـوهیممە دەرکـی ئـەوزارە
ئـــەوی بـیستوومە بـیستوومە، ئـەوی دیـتوومە دامـناوە[3]

چ ســـەییادێکـــە ســـەییادی بـووە سـەییادی ئـوستادی!
چ هەستی کردووە هـەستا چ بـازی بـەست و وەسـتاوە[4]!

---

١. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «جان» وشەی «گیان» هاتووە.

٢. سیدرە: مەبەستی «سدرة المنتهیٰ»یە و درەختێکە وەك لە سـوورەتی «النـجم»ی قـورئان هاتووە، لە ئاسمانی حەوتەمینە.

٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «ئەو زارە»، «ئەو دەمە» هاتووە.

٤. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: مانای ئەم بەیتەم بۆ ڕاست نەبۆتەوە، بەڵام لە پاش چاپی ☜

وەرە «رەبع»ی دڵ و چاوم بەهەشتی ڕوبعی مەسکوونە
هەتا دڵ حەز دەکا باغە هەتا چاو بڕدەکا ئاوە[1]

نیهایەت بمکوژن وەڵڵا لە ماچی لێوی خۆش نابم
ئەوی خوا حەز نەکا نابێ، ئەوی قەوماوە قەوماوە

لە حەققی مەقدەمی «حاجی» قوڕی کوێ کەم بەسەر خۆما
دڵێکم بوو لە دنیادا ئەویش بەینێکە تۆراوە



## (٢٢)

## لە دوو لا ئەژدیهای زوڵفی

لە دوو لا ئەژدیهای زوڵفی لە گەنجی حوسنی ئاڵاوە
لە لایەك عاقڵم ئەمما لە ئەولاوە تەمەع خاوە

لە بۆ مەردوم وەها چاکە کە ماڵی خۆی لە بەرچاو بێ
وەکوو چاوم لە دنیادا ئەگەر مەحسوولی هەر ئاوە[2]

---

☞

دیوانەکە لە دەستنووسەکەی مەلا ڕەئووفدا ئەم پارچە شیعرەم لە شوێنێکی تریشا هەر بە خەتی مەلا ڕەئووف بەرچاو کەوت کە خەتی بە سەر کێشرابوو و لێی نووسرابوو (تکرار)، لەوێدا ئەم نیوە بەیتە بەمجۆرە بوو: «چ سەییادێکی سەییادی، کە بۆ سەییادی ئوستادی»، بەمجۆرە هیچ گرێ لە ڕێی مەعنای شیعرەکەدا نامێنێ. ـهەنگاوێتر: ١٩٦].

١. [روبعی مەسکوون: بە چوار یەکی زەوین ئەڵێن کە وشکانیە و جێ ژینی ئینسانە]. لە دەقی «م.ر.س»دا لە جیاتی «رەبع» وشەی «بەین» هاتووە «رەبع = الرَّبع»یش وشەیەکی عەرەبییە بە مانای «ماڵ یا گەڕەك یاخود وڵات» دێ. مەبەستی نیوە دێڕەکەش ئەمەیە: «وەرە ناو ماڵ و خاکی وڵاتی دڵ و چاوم چونکە بەهەشتی سەردنیایە».

٢. [مەردووم: ناسککارییەکی جوانی تێیدا بەدی ئەکرێ، چونکە هەم هەڵدەگرێ بە مانای ئینسان و مرۆڤ بێت و هەم بە مانای گلێنەی چاو، دیسان لە عەرەبیشدا پێی دەڵێن ئینسان.

☜

له ژووری ئـاوی مـووسایه، له خـواری ئـاگـری تـووره
عه‌جایب خه‌تتی فیرعه‌ونی نـه خـنکاوه و نـه سـووتاوه[1]

ئـه‌گـه‌ر چـاوم له دور بـاری نـه عـه‌ینی مـا نـه ئـاساری
له دیـنی نـاکـه‌وێ چـونکه نـیشانه‌ی خـاڵی هـه‌رماوه

ئه‌مێستێ مووری خه‌تتی ماچ به وه‌جهی توحفه گه‌ر بێنێ
ئـه‌گـه‌ر لاقـی کـوله‌ی پـێدا سـوله‌یمان خـاته‌می داوه[2]

بـه‌سه‌ر ڕوومـا ده‌یـێ تـابووری ئـه‌شکم بـۆ مـه‌دده‌کاری
که دیتم قه‌لعه‌یی حوسنت سوپای خه‌ت مه‌حسه‌ره‌ی داوه[3]

یه‌قین مـورغی دڵم «حـاجی» له داوی زوڵفـی ده‌رنـاچێ
هـه‌تا ئـه‌م خـاڵه مـوشکینه مـه‌کـانی عـه‌نبه‌ری خـاوه[4]



---

☞

واته: مرۆڤ حه‌ز ده‌کا ماڵی له‌به‌ر چاوی بێ، هه‌روا به‌رهه‌می چاویش که ئه‌سرینه له پێش چاودایه].

۱. [ژووری ئاوی مووسایه: مه‌به‌ستی چاویه‌تی. ئاگری توور: مه‌به‌ستی ده‌میه‌تی که هه‌ناسه‌ی ئاورینی لێ دێته‌ده‌ر. خه‌تتی فیرعه‌ون: بۆز بوونی سمێڵیه‌تی].

۲. [ئاماژه‌یه به‌و چیرۆکه‌ی حه‌زره‌تی سوله‌یمان که هه‌موو گیانله‌به‌ره‌کان دیارییان بۆ ئه‌برد، مێلووره‌یه‌کیش لاقه کوله‌یه‌کی بۆ برد. له حه‌یاتولحه‌یواندا (۲/۵۱٦) ئـه‌م شـیعره عـه‌ره‌بییه هه‌یه:

جـائتْ سـليمان يـومَ العـيدِ قـبّرةٌ ... أتتْ بـرِجلِ جـرادٍ كـان فـي فـيها
ترنَّمَتْ بفصيح القول و اعـتذرتْ ... إنّ الهـدايـا عـلى مـقدار مُـهديها

واته: ڕۆژی جێژن مێلووره‌یه‌ك هات بۆ خزمه‌تی سوله‌یمان و لاقی کوله‌یه‌کی به ده‌مه‌وه گرتبوو و ده‌نگی هه‌ڵبڕی و داوای لێبوردنی کرد و وتی: دیاری به ئه‌ندازه‌ی توانای دیاری هێنه‌ره‌که‌یه].

۳. [مه‌حسه‌ره: په‌رژین، ده‌وره‌دان]. ئه‌شکم: فرمێسکم، ڕۆندکم.

٤. مورغی دڵم: ته‌یری دڵم.

## (٢٣)

## قسەییێکم هەیە

قسـەییێکـم هـەیە دەیکـەم مـەڵێ بـێ تـەجرەبەیە
بـاوجوودی ئـەوی نـادانـە لەلای وەك گـەمەیە

مـوقتەزای ئاب و هـەوای خـاکـی دیـاری ڕۆمـە
ئـەهلی سـووتاوی مـەیە، بـەستەیی ئـاوازی نـەیە[1]

حـاکـمی ڕێگـری مـەعموورەیە، قـازیی دزی ڕۆژ
وزەرا و وکـەلای گـورگە، ڕەعـییەت گـەلەیە[2]

سالیکی ڕیخە ئەگەر شێخـە ئـەگـەر مـێخـە، لەوێ
شێخـە هـەر کـامێ نـەدا تـا دەمـرێ هـەر دەدەیـە[3]

زانـی و شـاریب و لۆتـی دەگـرن، والی دەڵێ:
بەری دەن پارەیی خۆی دایـە، چ عـەیبێکـی هـەیە[4]

هـێنـدە بـێگـانە لە ئـیسلامن و ئـەحبابی فـەرەنگ
مـوتتەقی دێوە لەلایـان، مـوتەشەڕڕیـع شـەوەیە[5]

---

١. دیاری ڕۆم: وڵاتی ڕۆم، مەبەستی لە وڵاتی عوسمانلییە.

٢. [مەعموورە: ئاوەدانی. واتە: حاکمی لە ئاوەدانیدا ڕێگری دەکات].

٣. [ڕیخ: شیاکەی ئاژەڵ. موحەممەدی مەلا کەریم وای لێك داوەتەوە: لە وڵاتی ڕۆم، ئەوی شوێن شتی پیس کەوتبێ و پیس و پۆخڵ بێ، شێخ بێ و مێخ بێ، بە شێخی دائەنێن، ئەوی نەیداتێ و پێی نەبەخشێ تا ئەمرێ بە شێتی لە قەڵەم ئەدەن. ـهەنگاوێ‌تر: ١٩٩].

٤. شاریب: مەبەستی لە عەرەق خۆرە.

٥. [ئەحباب، کۆی حەبیب: خۆشەویست، موتتەقی: لە خوا ترس، موتەشەڕڕیع: گوێڕایەڵی شەرع. شەوە: مێردەزمە، مۆتەکە].

زوڵمــیان عــامه له سـەر عــامه، ڕەعــییەت فــەوتا
تۆ مەکە مەنعی عەوامیل، کـە خـەتای گـای بـنەیە[١]

هـەر لە شـا تـا بـە گـەدا تـووشی یـەکـێکـی نـابی
لێی بــپرسی بــە حـەقیقەت بـڵێ: جـەددم ئـەمەیە

لازمــە ئــەم غــەزەلە وەك غــەزەلێ بـیکەنە بـەر
هەر وەکوو «حاجی» ئەگەر شارە، وەگەر دیهکەدەیە[٢]



## (٢٤)

## لە نەزاکەت کەمەری[٣]

لە نەزاکەت کەمەری وەك خـەتی ئـەهلی حـیکەمە
لە نــەبووندا دەهــەنی بــێقسە عـەینی عـەدەمە

---

١. [عامەمە: خەڵکی ڕەشۆکی و ڕەمەکی. عەوامیل، کۆی عامیل: کاربەدەست، کرێکار. گابنە: ئەوگایە لەگێرەکردندا لە نێوان دایە وگاکانی تر بە دەوریدا دەسووڕێنەوە]. لە دەستنووسەکانی لای مندا ئەم دوو بەیتە هەبوو. لە دەقە ئامادەکراوەکەی مامۆستایان شارەزا و میرانیشدا ئەم دوو بەیتە بوو:

«هێندە بێقەولن و خوێنخۆر و نزیکن لە فەساد
فورسەتی بوو دەکوژێ حەققی برای دینی نییە
ئەوگەڕ وگـێچـەڵی بـۆ ڕەعـیەتی خـۆی دانـاوە
زەجرو تەوبیخی مەکە چونکە خەتای گای بنەیە»

من تێکستەکەی سەرەوەم پێ وردتر بوو. «موحەممەدی مەلاکەریم»

٢. دیهکەدە: وشەیەکی فارسییە بە مانای گوندی بچووك دێ.

٣. ئەم پارچە هەڵبەستەی حاجی لە ژمارە ٣٥ی ڕۆشنبیری نوێ و نووسەری کوردی ژمارە ٦ی خولی دووەم و لە دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا هەیە و ئێمەش خستمانە پاڵ ئەم دیوانەی شیعرەکانی حاجی.

چین یەکێکە کەچی زوڵفی کەچی عاجزە، بۆ؟
دڵی سەودایی خەتای کردووە بۆیە نەدەمە[١]

ماچی ئەو غونچە دەمە بێ حەقی جان موهری دەمە
سالیکی ڕاهی عەدەم بێ دەمی نەقشی قەدەمە[٢]

گەر ڕەزا بێ چییە بۆ ماچی دەمی جانی عەزیز؟!
تەجروبەم کردووە عیشرەت بە دەمە نەك بە دەمە[٣]



١. [چین و خەتا، لەم بەیتەدا تەورییەیان تێدایە، چین: وڵاتی چین، چین لەسەر چین و پەیکە خواردن. خەتا: شارێکە لە چین ئاسك و میسکی بەناوبانگە، هەڵە و سەهوو]. لە ڕۆشنبیری نوێدا نووسراوە: «عادزە بۆ» و لە دەقی «م.ع.ق»یشدا وەکوو ئەم دەقە نووسراوە «عاجزە بۆ».
نەدەمە: نەدامەتە، پەشیمانییە.

٢. لە دەقی «م.ع.ق»دا لەجیاتی «موهری»، «مەهری» هاتووە. موهری دەمە: مۆری دەم و زارە.

٣. عیشرەت: دۆستایەتی و بەیەکەوە ڕابواردن بە خۆشی. دەم: بە دوو مانا هاتووە: یەکەم، بە مانای دەم و زارە، دووەمیشیان، وەخت و سەردەم.

## (ا)

## ئەی بێنەزیر و هەمتا

ئەی بێنەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری
بێدار و بێدیاری، بێدار و پایەداری[١]

بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی خەزانی
بۆ مەزرەعەی فەقیران سەرمایەکەی بەهاری

تۆ پادشا نیشانی بۆ هەر سەوادی ئەعزەم
بێسەدر و شانشینی، بێپەردە پەردەداری[٢]

خەللاقی بێفتووری، سوڵتانی بێقسووری
ڕەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری[٣]

فەیرۆزە تەختی گەردوون مەسنووعی نەقشی تۆیە
یاقووت و لەعلی ڕۆژە ئەستێرەکان دەراری[٤]

جێ و مەکانی تۆیە بێجێ و بێمەکانی
لەیل و نەهاری تۆیە بێلەیل و بێنەهاری[٥]

---

١. بێنەزیر و هەمتا: مەبەستی لە خودایە کە هیچ هاوتای نییە. لە دەقی «گ.م» نووسراوە: «هەر تۆی کە بێقەراری».

٢. [سەوادی ئەعزەم: ڕەشایی گەورە کە مەبەست شار و وڵاتە، یان پاتەخت. پەردەدار: دەرگاوانی شا، حاجب].

٣. [بێفتوور: بێسستی، بێباك. قسوور: کەم و کووڕی]. لە هەندێ دەقدا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «جەبباری بێفتووری، سوڵتانی بێقسووری».

٤. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «فەیروزی تەختی گەردوون». [فەیرۆزە تەختی گەردون: سەقفی شینی ئاسمان]. دەراری: کۆکراوەی «دُرِّیّة»ی عەرەبییە. واتە: وەکوو دوڕ وانە.

٥. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «جێ و مەکانی تۆیە» نووسراوە: «جێگە و مەکانی تۆیە».

هەر ئەمری تۆ مەدارە بۆ کار و باری عالەم
هەرچەندە بێوەزیر و بێسەدر و کار و باری

سەحرانەوەردی شەوقت خورشید و ماهی تابان
دوو جارییەن شەو و ڕۆژ بێمەحمەل و عەماری[1]

مەعلوومە بۆ چی «حاجی» مەدحت دەکا بەکوردی
تا کەس نەڵێ: بە کوردی نەکراوە مەدحی باری[2]



## (٢)
## ئاسمانی بێستوون

ئاسمانی "بێستوون" وەك "خوسرەوی" میهری هەڵات
هیندی شەو تێكچوو شکا وەك موویی زەنگی لەشکری

ئیتتفاقەن ئیتتفاقم بوو لەگەڵ «نالی» وەکوو
تاجر و گەوهەر لەگەڵ گەوهەر فرۆش و موشتەری[3]

چەند غەزەل بوون تازە بافتی کارگاهی موشتەری
تاجیر و گەوهەر مەتاع و شامی غوربەت تاجیری[4]

یەك یەکی هێنایەدەر، گەردی کەسادی لێ تەکاند
دایە من فەرمووی درێغا کەس نییە سەوداگەری[5]

---

١. سەحرانەوەرد: گەڕیدەی دەشت و سەحرا. ماهی تابان: مانگی ڕووناك. [مەحمەل و عەماری: کەژاوە، ئەوەی لەسەر وڵاخ دایدەنێن بۆ جێبەجێ کردنی بنیادەم].
٢. نیوە دێڕی یەکەم لە دەقی «ع.م.ن»دا بەمجۆرە دەست پێ دەکا: «ئێستێکە بۆیە حاجی...».
٣. ئەم نیوە دێڕەی دووەممان لە سەر دەستنووسەکەی «م.ر.س» تۆمار کرد.
٤. بافت: قوماشی چنراو. کارگاه: کارگە. نیوە دێڕی دووەممان لە دەقی «م.ر.س» وەرگرت.
٥. سەوداگەری: کڕیار.

دەست بە دەستی خستم و هەم دایە بەربا مەجمەعم
"ئاسەفی" من بای لە جەمعی تۆ کە «حاجی» قادری

.......▬▬●▬▬.......

## (٣)

## ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانی

ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانی
موحەققەق داکی حیزە بابی زانی[١]

وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی
تەفەننون خۆشە گەر چاکی بزانی

سەلاحەددین و نوورەددینی کوردی
عەزیزانی جەزیر و مووش و وانی

موهەلهەل، ئەردەشێر و دەیسەمی شێر
قوباد و باز و میری ئەردەلانی[٢]

ئەمانە پاکیان کوردن، نیهایەت
لە بەر بێ‌دەفتەری ون بوون و فانی[٣]

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زوبانی[٤]

---

١. لە دەقی «ر.ك» و «ت.ر»دا لە جیاتی «موحەققەق»، «موعەییەن»هاتووە.
٢. نیوە دێری یەکەممان لە ڕووی دەقی «ت.ر» ڕاست کردەوە، لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «موهەلهەل ئەردەشێر و دێسمی شێر».
٣. ئەم نیوە دێڕە لە دەقی «ت.ر» و «ر.ك»دا بەمجۆرەیە: «لەبەر بێ‌دەفتەری و نووسینە فانی».
٤. لە دەقی «گ.م»دا «زەمانێ» نووسراوە!

مـــەلا و شـێخ و مـیر و پـادشامان
هــەتا مـەحشەر دەمـا نـاو و نـیشانی[١]

بــە زیــدی مـیر و پـاشامان بـڕاوە
بەسە بـا بـێـینە سـەر ڕێی مـیهرەبانی[٢]

کە دەیگوت شێخی من: من دەسـتگیرم
لەلام وابـوو لەبـەر جـەهل و جـوانـی[٣]

کە پیر بووم تـێگـەیشتم دەسـتی گـرتم
لە کەسب و کـاری تـەحسیلی مـەعانی

بـەڵێ شـێخ قـوتبە ئـەمما قـوتبی ئـاشە
بـە ئـاو و نـیعمەتی خـەڵقـە گـەڕانـی[٤]

لە بۆ ژن دێ لە کۆڵان وەك سەگـی هـار
لە ژن هەڵدێ بە میسلی کـەر لە خـانی[٥]

---

١. لە زۆربەی سەرچاوەکان «مەلا و پیر و شێخ و پادشامان»هاتووە. تـەنها لە دەقـی «ر.ك»دا نەبێ «مەلا و میر و شێخ و پادشامان»هاتووە. بە ڕای ئێمە ئەم دەقە ڕاسـتە کـە نـووسیومانە، چـونکە نـاوی شـێخ یـەك جـار هـاتووە و نـەچووە «شـێخ و پیر» دووبـارە بکـاتەوە، چـووە شەخسیەتەکانی کوردی وەکوو «مەلا و شێخ و میر و پادشا»ی لە شیعرەکەیدا بەکار هێناوە.

٢. [زیدد = ضدّ].

٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «شێخی من»، «پیری من» هاتووە. [موحەممەدی مەلا کـەریم ئەڵێ: «پیری من» لە «شێخی من»م بەلاوە ڕاستترە. ـهەنگاوێ‌تر: ٢٠٤].

٤. [«قـوتب»ی یـەکـەم: پـلەیەکـی بـەرزی تـەریقەتە. «قـوتب»ی دووهـەم: تـەوەرە، خـڕ و گرۆوەرێك کە بەرداش لەسەری دەگەڕێ].

٥. لە دەقی «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرەیە: «لە ژن هەڵدەی لە کۆڵان وەك سەگی هار» و ئەم نووسینەش چ واتایەکی ڕوون و ئاشکرای وەکوو نیوە دێڕەکەی ناو قەسیدەکە نادا.

بــڵێ بــەو ســەر کــزۆڵەی کــوزپەرستە
بــە چــاوی کــلدراو و ڕیشـــی پـانی

کە نەفعێکت نـەبێ بـۆ دیـن و دەوڵەت
بە من چی «نەقشبەند»ی یا نە «مـانی»[1]

کەسێ پـیاوە کــە دانـێ وەك «حــەماغا»
لە بۆ ئـەبنایی جـینسی نـان و خـوانـی

وەیاخود وەك «ئـەميناغا» بـە هـیممەت
بکـــا بــۆ قــەسری مـیللەت پـاسەبانی

بلێ لەم بەحسە هەرکەس مونکیری تۆن
بـــفەرموو سـەهلە ڕێگـەی ئـیمتیحانی

بە ئوممێدی دووسـێ دانـایە «حــاجی»
بـــە هـــەرزانـــی دەدا، دوڕڕی گـرانـی[2]

---

١. [نەقشبەند: نازناوی ڕێبازێکی سۆفیانەیە کە خواجە بەهائەددینی بوخارایی بنەڕەتی دانا و شێخ مەولانا خالیدی شارەزووری لە کوردستاندا برەوی پێدا. مانی: وێنەکێشێکی بەناو بانگە، هەندێکیش دەڵێن پێغەمبەر بووە. مەبەستی حاجی لە شێخ و مەلا ئەوانەیە کە چەقەڵی چەمن و بەتاڵن، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەڵێ: کە نەفعێکت نەبێ بۆ دین، نەك تەواوی شێخ و مەلاکان].

٢. [مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی ئەم بەیتەی بە پێی پیتی ئـەبجەد جـوان لێکـداوەتـەوە کـە لە ئەنجامدا ئەکاتە (٤٩٠٠)، بەڵام موحەممەدی مەلا کەریم هـەر لەسـەر حـیسابەکـەی مـەلا جەمیل بۆی چووە، بەڵام زۆر ڕێك وپێکتر لێکی داوەتەوە، بە چەشنێ ئەم بەیتە ئەباتە تەشقی ئاسمان. ئەڵێ: حاجی قادر کە بە تەمای پاداشی خوا بێ، ئەبێ لەو سنورەدا بە تەمای بێ کە خوا خۆی دیاری کردووە، جا کە خوا لە قـورئاندا فـەرموویەتی: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ واتە: هەر کەس چاکەیەك بکا خوا دەقات پاداشی ئەداتـەوە، حـاجیش وتـوویە: بـە هیوای پاداشی (دوو سێ) لە لای خواوە دوڕڕی گرانبەهای شیعری خۆم داناوە و بە هەرزان پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی ئەکەم.

## (٤)
## پەرێشان زوڵفی تاتاری

پەرێشان زوڵفی تاتاری میسالی ئەژدیهای جەنگی
نەزیری سەروی کشمیری، قیامەت قامەتی شەنگی

لە شەوقی شەمعی ڕوخساری لە بیمی تەعنی ئەغیاری
لە کولبەی سینەیی ناری دەسووتێ دڵ بە بێدەنگی [١]

لە ئەولای کەس قوتار نابێ، چ موئمین بێ، چ کافر بێ
لە ئەم لاش کەس خەلاس نابێ لە هیند و دەیلەم و زەنگی [٢]

تەماشام کردووە نەقشی دەراهیم سەرفی مەمنووعە
کەچی قازی ئیزافەی کرد بە مفتی هاتە بەر چەنگی [٣]

---

☞

ئەتوانین (دوو سێ) بە حیسابی ئەبجەد وا لێك بدەینەوە: (د = ٤)، (و = ٦) ئەمە (١٠)، (س = ٦٠) و (ی = ١٠) ئەمە (٧٠) واتە (٧٠٠ = ٧٠ × ١٠) ئەمەش کە بە گوێرەی ڕێ و شوێنی پاداشی چاکە دانەوەی خوایە دەق لەگەڵ ئایەتی: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ، وَ اللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ واتە: نموونەی ئەوانەی لە ڕێی خوادا خەرج ئەکەن وەك دەنکە دانەوێڵەیەکە حەوت گوڵی لێ ڕوابێ و لە هەر گوڵێکا سەد دەنکە هەبێ، خوا بۆ هەرکەسێ بیەوێ ئەمە دووقات ئەکاتەوە، خوا بەخشش فراوان و بە دەس و دەهەندەیە و بە هەموو شتێ ئەزانێ. بۆیەش لەگەڵ ئەو ئایەتە یەك ئەگرێتەوە چونکە لە وێشا دەنکە دانەوێڵە حەوت گوڵی گرت و هەر گوڵێ سەد دەنکی تیابوو کە ئەکاتە (٧٠٠). ـهەنگاوێ‌تر: ٢٠٧].

١. کولبە: کۆڵیت، خانووی بچووك. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «سینەیی تاری».

٢. [مەبەست لە ئەولا: قیامەتە و ئەم‌لاش: دنیایە].

٣. [«ممنوع الصرف» لە ڕێزمانی عەرەبیدا بەو وشەیە ئەڵێن کە ژێرە (ـِ) و تەنوین (ـٍـٌـً) نەڕواتە سەری مەگین بە هۆی «اضافه» یان ئەلف و لامەوە. وشەی دەراهیم (کۆی درهەم) لەو

☜

دوو ماری زوڵفی شەبڕەنگی کە بێ بۆ لەعلی زەححاکی
لە ترسان پێی دەدا «حاجی» فەرەیدوون تەختی هۆشەنگی



## (٥)
## ئافتابی حوسنی تۆ

ئافتابی حوسنی تۆ ڕۆژە کە دێ و ئاوا دەبێ
قامەتیشت وەك هیلالی یەك شەوە ئاوا دەبێ[1]

کامە دانا مێزەری دانا و فێسی کردە سەر
بێ حەیا و سەرپەل و سەرخۆش و بێپەروا دەبێ

پادشاهێکم هەیە گەر من بکاتە دەرگەوان
حاجیب و خەددامی من "ئەسکەندەر" و "دارا" دەبێ[2]

---



وشە «ممنوع الصرف»انەیە، قازیش چونکە ئیزافەی کردووە بۆ لای خۆی (دراهمي) واتە: درهەمەکانم، ئیدی لە «ممنوع الصرف»ی دەرچووە و ئەکرێت سەرف بکرێ. جا حاجی هەم ئەو یاسا ڕێزمانییەی مەبەست بووە و هەم ئەوەی کە سەرفی واتە: خەرج کردنی دروستە و قەدەغە نییە، یان سەرفی واتە: گۆڕاندنەوەی قەدەغە نییە. دیسان هەڵئەگرێ مەبەست لە مفتی فتوادەر بێ کە ئەم جار دەراهیم بۆلای ئەو ئیزافە بکرێ (دەراهیمی مفتی)]. بە مفتی: بە بەلاش، بە خۆڕایی .

١. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «ئافتابی حوسنی تۆ ڕۆژ کە دێ و ئاوا دەبێ». [بە بۆچوونی موحەممەدی مەلا کەریم «ئاوا دەبێ» هەڵەیە و «ئا وا دەبێ» ڕاستە، چونکە حاجی ویستوویە بڵێ: بەژنیشت وەك مانگی یەکشەوە باریکە کە ئەویش کینایەیە لە جوانی].

٢. [حاجیب: پەردەدار. خەددام: خزمەتکار. ئەسکەندەر و دارا: دوو پادشای ناودارن].

داوی نــــاوە زوڵفـــــی دووڵانــە لە هــەردوو لامـــەوە
دڵ گــــــرفتارە ئـــــەگـــــەر لەم لا نـــەبێ لەولا دەبـــێ[١]

شـــەو لە بـــەزمی دولبـــەرم بـەم تـەعنە وا سـووتاندمی
چـاوی دا پـەروانـە فـەرمووی: عـاشیقی هـەروا دەبـێ[٢]

واســـیفی قـــەددی ئـــەتۆ خـــامەی دەبـێتـە نـەیشەکـەر
ئـــەلفی قـــەددی مـــوستەقیمی قـــافیەی بـــاڵا دەبـــێ[٣]

سەر سپی و دڵ ڕەش بوو «حاجی» تا فەقێ بوو ئێستەکەش
ڕووڕەشـــێکـــە ڕیش سـپی خـوا عـالیمە هـەروا دەبـێ[٤]



## (٦)

### ئێمەش دەمرین

ئێمەش دەمـرین دەبـینە خـاکـی سـەرەڕێ
ئەم ڕۆژ و شەوە تەنووری سوبحی دەگرێ[٥]

دەسگـــا و دووکـــانی شـارەکـان دادەنـرێ
ئـــەمیان دەفـــرۆشـــێت و ئـەویتر دەکـڕێ

ئـــەم بـــاوکی مـــردووە یـــەخەی دادەدرێ
ئەو بووکی نووی هەیە کـەوای بـۆ دەبـڕێ[٦]

---

١. لە هەمان دەقدا نووسراوە: «داوی تاوە زوڵفی دووڵا».
٢. هەر لە هەمان دەقدا نووسراوە: «چاوی دایە دوا».
٣. نەیشەکەر: قامیشی شەکر.
٤. [مەبەست لە سەر سپی ئەوەیە کە جامانە و مێزەرەی سپی بە سەرەوە بووە].
٥. ئەم نیوە دێڕە لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «ڕۆژ و شەو تەنویری سبەینێ دەگەڕێ!».
٦. [نووی: نوێی].

بــێ بسـتە فـەلەك ئـاشەكـی وای نـاوەتەوە
بۆ هاڕدنـی ئـێمـە چ عـەجایب دەگـەڕێ![1]

لادێیش ڕەزی ئـاودەدات و وەردی دەبـڕێ
حەیوانە دەزێ، سەگ دەوەڕێ، کەر دەزەڕێ

لوقمان لەمەدا شـوانـە گـەر خـۆی بکـوژێ
گــاوانــە فــلاتوون لە غـەما گـەر بـدڕێ[2]

ئەم دەستە کە چوو دەستەیەكـی تـازەیە دێ
مەعلووم نەبوو ئەم کەشمەکەشەکەی دەبڕێ[3]

عــالەم هــەموو مــردن لە غــەمی زانـینی
ئەم حیکمەتەیان نەزانی هیچ لێی مەگەڕێ[4]

لەملاوە هــەتا «حــاجی» نــەچێتــە ئـەولا
مــومکین نــییە تــێبگـا لەوە گـەر بـفڕێ[5]

---

١. [بستە: تەوەرەی بەرداش، ئاسنی نێوان گەرووی دوو بەرداش. موحەممەدی مەلا کـەریم پێی وایە «ئێمە تا قیامەت» لە «ئێمە چ عـەجایب» ڕاسـتترە، لەبـەر ئـەوەی لە نـیوەی بـەیتی پێشوودا «ئاشەکی وای» هاتووە پێویست بە عەجایب ناکا. مەعنای ئەم نیوە بەیتە لەگەڵ ئەوەی دەسنووسێکیش ها لە پشتیەوە ئاوەها جوانترە. ـهەنگاوێتر: ٢١٤.].

٢. دیسان لە هەمان سەرچاوەدا، ئەم نیوە دێڕە بەم جۆرە هاتووە: «گاوانە فەلاتوون کە یەخەی دابدڕێ».

٣. هەر لەو سەچاوەیەدا نووسراوە: «ئەم دەستە کەچوو دەستەیەکی نوێی تر دێ».

٤. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ نیوە بەیتی یەکەم بڕگەیەکی ناتەواوە و بە گوێرەی هیچکام لە دەسنووسەکان بۆم ساغ نەکرایەوە. لام وایە وشەی «مردن» یا «مردوون» یان «مردنە» بێ، ئەگەر وابێ لەنگی نامێنێ.] لە دەقی «ع.س» دا نووسراوە: «ئەم حکـیمەتەیان نـەزانـی هـیچ کەواتە مەگەڕێ».

٥. لە دەقی «ع.س»دا ئەم نیوە دێڕە بەمجۆرە هاتووە: «مومکین نییە تێبگا گەر بفڕێ»

## (٧)

## سۆفی بە سەر و ڕیشی

سۆفی بە سەر و ڕیشی، بەمخەرقەیی سەردۆشی
چەند چێڵەگەل و بزنەگەل و مێگەلی دۆشی[١]

فەرمانی کەدا کوشتمی جەللادی نیگاهی
خوونی منی بێچارە عەدوو نۆشی بە خۆشی

لەو وەعدە ڕەقیبم گوتی: بێ عەهد و وەفایە
مەعلووم نەبوو لەم عالەمەدا ڕاست و درۆشی

تەشخیسی دەواکەم مەکە ئەی بووعەلی سینا
لەو چاوە کە بۆم بوو بە شیفای عەینی نەخۆشی

ئەو چاوە وەکوو مەسئەلەیی کوحلە سەوادی
شازە وەکوو نەرگس نییە بێ فەزلی برۆشی[٢]

---

☞

[موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: نیوەی بەیتی یەکەم بڕگەیەکی کەمە، ئەگەر «ئەولا» بکرێتە «ئەوەلا» هیچ ناڕێکی نامێنێتەوە. ـ هەنگاوێ‌تر: ٢١٦].

١. [خەرقەیی سەردۆشی: جبەی سەرشانی. چێڵەگەل: کۆی چێڵە، واتە: مانگا بەرانبەر بە گاگەل، مێگەل: ڕان]. لە دەقی «گ.م»دا نیوەی دێڕی سەرەتای هەڵبەستەکە بەمجۆرەیە: «سۆفی بە سەر و ڕیشی بە خەرقەیی سەر و دۆشی».

٢. [مەسئەلەی کوحل: بەو مەسئەلە ڕێزمانیە ئەڵێن لە زمانی عەرەبیدا کە «اسم التفضیل» کار لە سەر «اسم ظاهر» ناکا مەگەر بەو مەرجانەی کە لە میسالی «ما رأیت احداً أحسن في عینه الكحل منه في عین الحبیب»دا هەیە، ئەم میسالەش ناوبانگی بە مسئەلەی کوحل دەرکردووە. واتە: کەسم نەدیوە کڵە لە چاویدا جوانتر بێ لەو کڵەی وا لە چاوی یارەکەمدایە. سەواد: ڕەشی. شاز: بێ وێنە، تاك، لە یاسا دەرچوو]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «شازە» وشەی «شانە» هاتووە وە لە جیاتی «برۆشی» وشەی «برووشی» هاتووە. مەسەلەکەش لە سەر «چاو و برۆیە» نەك «شان و برووش»!! بۆیە ئێمە پشتمان بە دەقەکەی گۆڤاری «ر.کوردستان» بەست و وەکوو ناو هەڵبەستەکە تۆمارمان کرد.

موشعیر بە وەفاتی منی میسکینی فەقیرە
وا ڕووتە لە خەت بەرگی سیای ماتەمی پۆشی[١]

«حاجی» لە تەوافی حەجەرولئەسوەدی خاڵی
گریانە "سەفا"بەخشی نەوەك "سەعی" و خرۆشی[٢]



## (٨)

## بەم نەحوەیە سەرفی عیشقبازی[٣]

بەم «نەحو»ەیە «سەرف»ی عیشقبازی
موستەقبەلی کەمترە لە مازی[٤]

یەعنی لە مەدا کە بیکوژە زوو
بێ فەرقە حەقیقەت و مەجازی[٥]

---

١. [موشعیر: بێدار و ورياكەرەوە و پیشاندەر].

٢. [حەجەرولئەسوەد: ئەو بەردە ڕەشەیە لە پەنای ماڵی کابەدا کە حاجی لە عاستی ئەوەوە دەست بە گەڕان و تەواف ئەکات. حاجی لەگەڵ باسی خۆشەویستەکەیدا ئاماژە بە مەناسیکی حەج، وەکوو: سەعی (هاتوچۆ) سەفا و مەڕوە، تەواف، دەکا].

٣. ئەم هەڵبەستە لە سەرچاوە چاپکراوەکاندا حەوت دێڕە بەڵام لە دەقی «م.ر.س»دا بووە بە «٩» دێڕ.

٤. [سەرف و نەحو: دوو زانستی زمانی عەرەبین و هەروەها «نەحو» مانای شێوە و جۆر و «سەرف» مانای گۆڕان ئەگەیەنن. واتە: بەم شێوە (نەحوە) گۆڕانکاری (سەرف) لە فەرمانی عەشقبازیدا بکەی زەمانی داهاتووی لە ڕابردوو کەمترە و بەرەو تەواو بوون دەچێ]. بۆ ساغکردنەوەی سەرەتای ئەم هەڵبەستە پشتمان بە دەقەکانی «م.ر.س» و «م.م» و «ع.س» بەست و تۆمارمان کرد.

٥. [کوشتن بە دوو مانا دێ یەکێ مانای ڕاستەقینەیە (حەقیقەت) واتە: تێدابردن، دووەم مانای ناڕاستەقینە (مەجاز) واتە: لێدانی توند و زۆر]. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «یەعنی لەمەدا کە بێن بیکوژە زووا!!».

ئەم شیعرە زەریفە خەتتە چاکە
نووسیومەتەوە لە ڕووی بەیازی[١]

"کەششاف"ی ڕمووزی ئایەتی تۆ
"تەفسیری کەبیر"ی فەخری ڕازی[٢]

بۆ قەددی زراوی بێژراوە!
نیزە و عەلەم و مەسافە غازی[٣]

نەیداوەتە من خودا بە مفتی
بەم مەشرەبە خۆت مەکە بە قازی[٤]

ئەم قافیە شایەگانە ئەمما
عەیبی نییە جاهیلی بە ڕازی[٥]

ئەو ڕزقی موقەڕڕەڕە بە خۆی دێ
سەد دەفعە بخوازی یا نەخوازی

---

١. [بەیاز: پاک نووس، بەرانبەر بە چڵک نووس (مسودە)].
٢. [کەششاف: وەدەرخەر و وەڕووخەر، کتێبێکی بەنرخی زومەخشەرییە لە زانستی تەفسیری قورئاندا. کەبیریش واتە: گەورە، هەروەها تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازیش دەگرێتەوە].
٣. [مەساف: جێی ڕیز بەستن]. قەددی زراو: قەددی زراف، قەددی باریك.
٤. بە مفتی: بە خۆڕایی. [هەروەها حاجی بە وشەی «مفتی»، سووکە ئیلتیفاتێکیشی بە «موفتی» بە مانای فتوادەر، بووە؛ چونکە بە پێی ڕێنووسی کۆن هەردووکیان وەك یەك نووسراون]. دێڕی پێنجەم و شەشەم تەنها لە دەقی «م.ر.س»دا هاتووە.
٥. قافیەی شایەگان: ئەو جۆرە قافیەیەکە پیتی عەرەبی وەکوو: «ض.ظ.ذ» لەگەڵ پیتی غەیرە عەرەبی وەکوو «ز» یەك حیسابیان بۆ بکرێ هەر وەکوو لەم هەڵبەستەدا وشەی وەك: «ماضی» و «قاضی» لەگەڵ وشەکانی «مەجازی» و «غازی» و «دەنازی» بوون بە قافیەی هاوکێش و هاودەنگ.

قــیرتاسی و شـەهرەوایـە «حـاجی»
نــەقدینەیی تــۆ بـە چـی دەنـازی![1]



## (٩)

## مەتنی کوتوبی ئەم دووە

مەتنی کوتوبی ئەم دووە بـا شـەرحـی کـرابـێ
ئیشکالی ڕموزی مـەسەلەی قـازیی مـا بـێ[2]

قازی هەرۆ سینەت سـوپەری تـیری قـەزا بـێ
وەك دینی ڕەوافـیز بـەدەنت بـێسـەروپا بـێ[3]

خۆت حاکمی ئەم مەسئەلەیە کەی دەبێ وابێ
پیری وەکوو تۆ «ماهی» هەبێ و ماکەری گابێ

بێ مروەتێ بـەم مـروەتە قـەت مـروەتی نـابێ
سەد دەفعە کەریش هەروەکوو تۆ مروەتی گابێ[4]

---

١. [قیرتاس: کاغەز، شەهرەوا: بەو پارەیە دەڵێن کە نرخی لەو ناوەی کە هەیەتی کەمتر بێ، جا لەبەر ئەوە، بێجگە لەو وڵاتەی کە لێی دراوە، لە هیچ وڵاتێکی‌تر بایەخ و برەوی نییە].

٢. [وەکوو موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: ئەم پارچە شیعرەی حاجی بۆ لێدوانی ڕووداوێکی نێوان قازیی شوێنێك و ئافرەتێك کە «مروەت»ی ناو بووە، داناوە. «قازیی ما» فارسییە واتـە: قازیی ئێمە، هەروەها لەو قازییە کە گوایە قازیی مێیان بووە، یان قازیی بێحورمەتی وەك ماکەر بووە. ـهەنگاوێ‌تر: ٢٢٠].

٣. لە دەقی «م.ر.س»دا بەمجۆرە هاتووە: «قازی سەر و سینەت سوپەری تیری قەزا بێ».

٤. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «بەم مروەتە بێمروەتییە قەت بڵێ: نابێ». [موحەممەدی مەلاکەریم بە نابەدڵی مانای ئەم بەیتەی کردووەتەوە ئەڵێ: لێی دڵنیا نیم، واتە: هیچ کەسێك لە خۆیا بێمروەت و نامەرد، بە هۆی دەس بە سەراگـرتنی ئـەم ئـافرەتە

«حاجی» دەڵێ ئەم میسرەعە تەئریخییە قازی
«انصافی نیە، عاری چیە، مروەتی گابێ»[1]



## (١٠)

## تا سالیکی مەسالیکی

تا سالیکی مەسالیکی موڵکی قەناعەتی
باکت نەبێ لە ڕێگر و ئەهلی شەقاوەتی[2]

سۆفی عیبادەتی هەموو مەکرو ڕیوەیە
گەر "شێری نەڕ بە گوێ بگرێ" پەشمە تاعەتی[3]

---

☞

(مروەت) ناوەوە نابێ بە مەرد و خاوەن مروەت. با بڵێین کەریش سەد جار لەم مروەتە بپەڕێ و سواری ببێ، ئاخۆ بەوە لە کەریی خۆی ئەکەوێ و ئەبێ بە بنیادەم و خاوەن مروەت؟ ـهەنگاوێ‌تر: ٢٢٢.]

١. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرەیە: «هەر «حاجی» دەڵێ ئەم قسە...تاد»

**تێبینی:** بۆ زانینی حیکایەتی دانانی ئەم شیعرەی حاجی، بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە «٨٤»ی دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپی گیوی موکریانی، هەولێر ١٩٦٩.

[ئەم مێژووە بە پێی حرووفی ئەبجەد دەکاتە (١٢٨٥) جا لەبەر ئەوەی حیسابی ئەبجەد دروست دەربێت پێویستە بە شێوە ڕێنووسی کۆنی کوردی بنووسرێ].

٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «موڵکی» نووسراوە: «ڕێگەی» وە لە جیاتی «باکت نەبێ» نووسراوە: «عاجز مەبە».

٣. ڕیوە: فێڵ. شێری نەڕ: شێری نێر، نێرە شێر. دێڕی نیوە شیعری دووەم بیروڕای حاجی دەردەبڕێ بەرامبەر دینداری تورکە عوسمانلییەکان و شێخەکانی سەر بە ئەوان.

«شێر بە گوێ دەگرێ» یاخود «شێری نەڕ بە گوێ بگرێ» ئەمە ئیدیۆمێکی کوردییە و بە مانای ئازایەتی دێ، حاجی لەم شیعرەدا بەکاری هێناوە. بنواڕە: جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٢، ل:٣٤٢. [پەشمە تاعەتی: واتە: بێ کەڵکە خواپەرەستییەکەی].

ئیخلاسە ئەسلی مەقسەد و خۆڕا شەقی دەبێ
واتێدەگا بە سەرمەقولاتە سەعادەتی[١]

بێ مەعریفەت مەبە لە تەریقی حەقیقەتا
سەر مەنزیلی شەریعەتە جێگەی سەلامەتی

ناگەن بە حیز و ڕێگری ئێمە لە موڵکی ڕۆم
عەللامەیی ویلایەت و شێخی ویلایەتی

مەفهوومی دوو حەدیسی سەحیحم لە بەیتەکا
جێ کردەوە نەزەر بکە کوردی و فەساحەتی

دونیا سەگی لە ئۆغڵەمە تۆقیوە تالیبی
نەیماوە هەر وەکوو سەگی پێ سووتوو ڕاحەتی[٢]

سەد قوببەیی خەورنەق و سەددی سکەندەری
ناگاتە بەیتە کاولی «نالی» و مەتانەتی[٣]

ساقی کەریمە بادەیی بەزمی «أَلَست»ییە
«حاجی» لە جامی قەلبی شکاوە شیکایەتی[٤]



١. [ شەقی: بەدبەخت و تاوانبار].

٢. [ئۆغڵەمە: شەڕ بەتێكچڕژان و ڕژانەسەر یەك].

٣. [خەورنەق: ئەو کۆشکەیە بۆ بەهرامی کوڕی یەزدگرد لە پەنای چۆمی فوراتدا کراوەتە. سەددی سکەندەر: دیواری چین، بەیت: ماڵ، یان دێڕێ شیعر. مەتانەت: قایم و پتەوی، یان حورمەت و مرووەت].

٤. [ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قالُوا بَلىٰ﴾ کە خوای مەزن لە عالەمی ڕۆحدا تەواوی ڕۆحەکانی بانگ کردووە و ئەم پرسیارە لێ کردوون: «ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟» ئەوانیش تێکڕا وتوویانە: بەڵێ تۆ خوای ئێمەی].

## (١١)

# کە هەستا قامەتی بەرزی

کە هەستا قامەتی بەرزی لە فەرقی تاوەکوو ئەرزی
پەرێشان زوڵفی سەد تەرزی بەیەکدا داڕژا و لەرزی[١]

لە دەوری تابەتا وەستا لە تەشبیهی دڵی وەستا
موعەتتەل بوو گوتی: ئێستا لە چین و پێچش و تەرزی

سەدای «یاحیّ»ی دەروێشان لە ترسی زوڵفی پڕ چینی
لە عیسا عەرسەیی گەردوون بە تەنگ هات هەروەکوو دەرزی[٢]

لە سەودای زوڵفی پڕچینی لە نێو چینی نومایان بوو
خەتا و چین و خوتەن یەکسەر گرفتار بوون لە ژێر قەرزی[٣]

هەڵیدا زوڵفی چەوگانی کورەی خورشیدی دا بەر شەق
کە دایدا چی مەلایك بوو لە گەردوون هاتەسەر ئەرزی[٤]

حەیای چوو چەتری تاووس بارەگاهی شەعشەعەی خورشید
کەمەندی پیلەتەن، زنجیری داود، گورزی گۆدەرزی[٥]

---

١. فەرق: تەوقی سەر، واتا لە تەوقی سەری تا دەگاتە عەرد. لە چەند دەقێکدا ئەم بەشە دێڕەی دووەمە بەمجۆرە هاتووە: «بەسەر یەکدا ڕژا و لەرزی».
٢. [ئاماژەیە بە بەرز بوونەوەی حەزرەتی عیسا بۆ ئاسمان و چوونە خزمەتی خۆشەویستی ڕاستەقینەی].
٣. خەتا و خوتەن: دوو ناوچە و شارن لە تورکستان بەجۆرە مامزێك ناسراون کە لە ناوکیان نایابترین بۆنی میشکیان لێ وەردەگیرێ.
٤. [چەوگان: گۆچان، ئەو دارە سەر خوارەی کە پێی لە گۆ ئەدرێ لە یاری چەوگاندا].
٥. [شەعشەعە: تیشك و ترووسکە. پیلەتەن: هەیکەل وەك فیل، نازناوی ڕۆستەمی پاڵەوانە. داود: داودی پێغەمبەر کە لەگەڵ جالوتدا شەڕی کرد. گۆدەرزی: پاڵەوانێکی ئێرانییە چیرۆکی لە شانامەی فیردەوسیدا هاتووە].

دەقيقەك بێ سەری موويەك لە زوڵفی وەرگەڕێ مەودا
لەگەڵ سوبحی قيامەتدا دەكا بێتەقيە سەربەرزی[1]

مريدان مەست و سەرخۆشن لە نەشئەی بادەكەی دەستی
مەلاييك جوملە بێهۆشن بە نازی چاوی پڕ ڕەمزی[2]

مورادی من مريدی خاليسە خەيياتييە كاری
مەلاييك سوورەتە، ئاهوو نيگاهە، «حاجی»يە تەرزی



## (١٢)

## لەسەر تەنافی كە لەرزی[3]

لەسەر تەنافی كە لەرزی هەتيوی سندووسی
شكا مەتاعی زەريفی و قيمەتی لووسی[4]

تەنافی پردی سيراتە مونازيران مەحشوور
مەكانی مەلعەبە حەشرە لە موئمنين و ڕووسی[5]

---

١. [تەقيە: ترس و خۆشاردنەوە، يان «طاقيە» واتە: كڵاو].

٢. [موحەممەدی مەلا كەريم ئەڵێ: بە هەڵە نووسيبوومان: «بادەكەی دەستی» لە كاتێكدا لە دەسنووسەكاندا «بادەيی دەستی»يە. ـهەنگاوێتر: ٢٢٧].

٣. ئەم قەسيدەيەی حاجی لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا حەوت دێرە شيعرە، بەڵام لە دەقی «م.ر.س»دا حەڤدە دێرە و هەندێ دێری بە عەرەبين و بەداخەوە شلۆق و نارێكن.

٤. لە بارەی جێگای دانانی ئەم قەسيدەيە، خوالێخۆشبوو مەلا ڕەئووفی سەليم ئاغا نووسيويە دەڵێ: كاتی خۆی تەنافباز هاتوونەتە كۆيە و ئەمين ئاغای ئەختەر و حاجی قادر بەيەكەوە چوونەتە سەيری و ئەمين ئاغا داوای لە حاجی كردووە ئەم قەسيدەيە لەسەر ئەو بەزمە بنووسێ. بەڵام كاك مەسعوود موحەممەد بەڵگەی بەهێزی بە دەستەوەيە بۆ ئەوەی حاجی قەسيدەكەی لە سندووس يان لە جێگەيەكی تری كوردستانی ئێران داناوە؛ بڕوانە: مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری كۆيی، ب٢، بەغدا ١٩٧٤ ل:٣١٤ـ٣١٥.

٥. مونازيران: تەماشاگەران.

سەمایە عـەرسەیی بـازی گـوریسی کـاهکەشان
ستارە نـازیر و مـاهیش هـیلالی مـەعکووسی[١]

شوعاعی شەعشەعەیی شەمعە مەشعەلی مـاهی
لە شەرمی تەلعەتی ئەو شەو دەیێتە جـاسووسی

دوو چاوی عەینی نەخۆشی لە نێو سەری زوڵفی
گـران و سـووکە لە تـرسی ڕەقیبی کـابووسی

لە کـونجی خـانەقە سۆفـی خـزا و نـەیزانـی
تـەماعی دیـنی نـەبێ یـا ئـەمانی نـامووسی[٢]

وا حـەشرە سۆفـی بـفەرموو هـەتا لە دونـیادا
سـیاهڕوو بـبی و خـەڵق بـزانـێ سـالووسی[٣]

عـیونی تـنقطعُ مـن نِـعمةِ اللّٰـهِ
اَذِقْـني دَمْـعي إلىٰ مـا تـبلُّ مـلبوسي[٤]

و عـيْني عـادَ لِـتَبكي فـما اسـتطالَ لَـنا
عـلىٰ فـراقِ مَـن أَهْـوىٰ يكـونُ مَأيـوسي[٥]

---

١. بازی: یاری، گەمە.

٢. ئەم بەیتە لە تێکستەکەی کاك کەریم و کاك سەرداردا نەنووسراوە. موحەممەدی مەلا کەریم.

٣. سالووس: فڕوفێل.

٤. [هەرچەند مامۆستا موحەممەد فەرمووی بۆم ڕاست نەبۆتەوە، بەڵام پێم وایە ئەکرێ بەم شێوە مانای لێ بدرێتەوە: چاوەکانم نیعمەتی خودایان، کە فرمێسکە و وەکوو باران وایە، لێبڕاوە، ئەدی تۆش فرمێسکی چاوم بڕژێنە و بمهێنە گرین تا جلوبەرگم دەخووسێ. ئەمە لە کاتێکدایە کە «أذقني» بە هەڵە دابنێین و «أرقني» ڕاست بێت].

٥. بەش بەحاڵی ئەم دوو بەیتە کە لە تێکستەکەی کاك کەریم و کاك میراندا نەنووسراوەتەوە ئەبێ بڵێم بۆ منیش ساغ نەکراوەتەوە، لەبەر ئەوەی وەك خۆیـان نـووسینمەوە، بـەڵام ئـەبێ ☞

فیدایی لەنگەری دەستی سینانی "کەیکاووس"
درەفشی "کاوە"، ڕمی "گیو" و نێزەیی "تووسی"[١]

کە هات و کەوتە سەما عیسەوی شکا و نەما
هەلا هەلایی کلیسا، سەدایی ناقووسی

کە هاتە خەندە و فەرمووی: یەلّانجی ماشەڵڵا
بە سادیقی بووە عیسایی میللەتی مووسی[٢]

هەچی کە هاتە تەماشا بە نووکی موژگانی
«فَهٰؤُلاءِ عَبيدي»ی لەسەر دڵی نووسی[٣]

بە وەسفی قەترە بە دەریایە شاعیری وەکوو من
ئەگەر بە قافیە دانێم لوغاتی قامووسی

---



ئەوەندە بڵێم دوور نییە لە بەیتی یەکەمدا «عیونی تنقطُ دمعاً» بووبێ و لە بەیتی دووهەمیشدا ئەبێ «عادت لتبکي فما استطاب لنا» بووبێ. «موحەممەدی مەلا کەریم».

[ئەم بەیتە هەروەك مامۆستا موحەممەد ئاماژەی پێ کرد، هەندێ گرفت و نارێکیی ڕێزمانی تێدایە، بەڵام سەرجەم ئەکرێ ئاوەها مانای لێبدرێتەوە: چاوەکانم پاش ئەوەی وشك بوو بوون دیسان هاتنەوە گرین، ئیدی کەوابوو نا ئومێدی ئێمە بۆ دووری خۆشەویستەکەمان زۆری نەخایاند].

١. [حاجی لەم بەیتەدا ئاماژەی بە چەند کەسایەتییەك و ئەو شتانەی ئەوان پێی بەناوبانگ بوون، کردووە، وەك: کەیکاوس: پادشایەکی ئێرانییە لە پاشا (کیانیەکان). سینان: سەرەڕم. درەفشی کاوە: ئەو لەتە چەرمەی کە کاوەی ئاسنگەر وەکوو ئاڵایەك کردیە سەر ڕمەکەیەوە و چوو بۆ شەڕ لەگەڵ زەححاکدا. گیو: کوڕی گۆدەرز و زاوای ڕۆستەمی زاڵە. تووس: ئیبنو نەوزەر، یەکێکی ترە لە قارەمانانی شانامە. شاری تووس = مەشهەد].

٢. ئەم بەیتەش هەروا لە تێکستەکەی کاك کەریم و کاك میراندا نەنووسراوە: «موحەممەدی مەلاکەریم».

٣. [هؤلاء عبیدی: ئەوانە کۆیلەی منن].

له قـــافیه شــوعەرا عــەیبه لابــدەن ئــەمما
به یادی چاوی ئەمن لادەدەم به مـەخسووسی[١]

جەبینی ماه و ڕوخی میهرە، زوڵفی شەو دەهەنی
سەبەب به قافیه تەنگی بوو «حاجی» نەینووسی[٢]



## (١٣)

## سەد وەکوو ڕۆستەم

سەد وەکوو ڕۆستەم به دڵ قەمچی له ڕەخشی دا، بەزی
وەك گــەیشته خـەندەکـی پـایانی عـومری دابـەزی[٣]

ڕۆژتـــه ئـــەی بـادی نـەورۆزی له بـن بـەفری گـران!
کانی پێی سڕبوو چناریش دەستی چوو پەنجەی تەزی[٤]

سونبولی زولف و گوڵی ڕوخسـار و سـەروی قـامەتی
مـانگی نـیسان و گـوڵان نـەیدی له نـێو بـاغ و ڕەزی

دولبەرم تەنها که بوو لەو بـەینه خـۆی ڕووت کـردەوە
من دڵم خۆش بوو کەچی دووبـاره دایـپۆشـی کـەزی

١. له دەقی «ع.س» و «گ.م»دا نیوه دێڕی شیعری یەکەم، بەمجۆره نـووسراوە: «له قـافیەی شیعر عەیبه لابدەین ئەمما».

٢. نیوه دێڕی یەکەم له دەقەکانی «ع.س»و «گ.م»دا بەمجۆره هاتووە: «جەبینی ماه و ڕوویی میهرە، زوڵفی دەیجووری» بەڵام ئێمه ڕاستییەکەمان لەسەر دەقی «م.م» وەرگرت.

٣. [ڕەخش: ئەسپەکەی ڕۆستەم]. له دەقی «گ.م»دا له جیاتی «پـایانی» وشـەی «دوامـێنـی» هاتووە.

٤. دیسانەوە له هەمان دەقدا له جیاتی «بادی نەورۆزی»، «بایی نەورۆزی» هاتووە. هەر چەند «بایی» له چاو «بادی» کوردیترە، بەڵام ئێمه لەو ڕایەدایـن حـاجی بـه پـێی زمـانی ئـەدەبی سەدەی نۆزدەهەم گوتوویەتی «بادی نەورۆزی...».

غــەمزە دەسـتی کـردە نـاز و مـاری زوڵفـی داخـزی
دڵ لە بەر پێی کەوتبوو ئەم دەیدزی و ئـەو دەیگـەزی

چـاکـی سینەم بـۆچـی ئـەو خـەییاتە نـایدروێتـەوە
چـاوی بـیماری وجـوودی کـردمە دەرزی و دەزی[1]

حاجیب و «حاجی» هەموو ڕۆژێ بەگژ یەکدا دەچوون
بێحەیا بوو ئەو سەگە عاری نەبوو «حـاجی» بـەزی[2]



## (١٤)

### هەموو عومرم

هــەموو عــومرم لە ڕێی هــات و نــەهاتی
بـەسەرچـوو ئـەی ئـەجەل هـەر تـۆ نـەهاتی

لە دەســـتی حــاجیبت چــاوم غــولامت
بــــەراتـــی قـــەبرە، پـــەیکانە خـــەڵاتـــی[3]

بــە ڕوخ فـەرزە غـوباری سـوممی ئـەسپت
بـــماڵم شــاهی پـیل‌ئەفگەن بــە مــاتی[4]

---

١. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «چاکی سینەم»، «چاکی سینگم» نووسراوە.
٢. هەر لە هەمان دەقدا نووسراوە: «عاری هەبوو» کەچی مەبەستی حاجی سەگەو سەگیش دیارە بێحەیایی لێ دەوەشێتەوە. وا ڕاستە بنووسرێ «عاری نـەبوو» [حـاجیب: پـەردەدار و دەرگاوان، ئەم ئیشە وەکوو ئیشی سەگان وایە، بە مانای برۆش هاتووە].
٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «قەبرە» وشەی «قیرە» هاتووە.
٤. [حاجی لەم بەیتەدا وەك شوێنەکانی دیکە بە یەك تیر و دوو نیشان دوو مـانای پـێکـاوە، یەکەم: ئاماژەی کردووە بە هەندێ لەکەرەستەی شەترەنج، دووەم: مانا ڕاستەقینەکانیەتی بەم

لە تـــاوی خـــوسرەوی ســـەییارە ئـــەنجوم
هـــەڵاتـــن، یـــاری مـــن تـــۆ هـــەڵنەهاتی[١]

لە ڕەهـــنی وی دەبـــێ ســـۆفـی وەکـوو مـن
بکـــا پـــێشکـەش هـەموو سـەوم و سـەڵاتی

دەزانــــــم «رَحْـــــمَةً لِـــلْعالَمین»ی
لە بـــــەدبەختی مـــــنە کـــەم ئـــیلتفاتی[٢]

چ گــەنجێکــە ئـیلاهی گــەنجی حـوسنت
لە هـــیچ دیـــنێ نـــەبوو واجـیب زەکـــاتی

لە تووشی خۆم بوو هەرچی تووشی خۆم بوو
لە دەســـتی خـــۆیـــەتی «حـــاجی» شکـــاتی[٣]



☞

شێوەیە: ڕوخ: ڕوخسار، ڕوومەت. قـەڵا: مـۆرەیـەکـە لەم سـەر و لەو سـەری شـەترەنجەوە دائەنرێ و ڕاست ئەگەڕێ. ئەسپ: نێرینەی مایین، مۆرەیەکی تری شەترەنجە کە بە شێوەی (L) دەگەڕێ. شاهـ: پاشا، مۆرەی ئەسڵی شەترەنج کە بە کیش و ماتی یاری تەواو ئەبێ. پیل: فیل، مۆرەیەکە سووچا و سووچ دەگەڕێ. مات: مەلوول و سەرگەردان، بردنەوە و تەواو بوونی شەترەنج]. هەر لە هەمان دەقدا لە جیاتی «بماڵم» نووسراوە: «بە باڵم». پیل ئەفگەن: ئـەو پاڵەوانەی کە فیل لە عەرد دەدات. دێڕە شیعری دووهەم و سێهەم لە دەقـەکـانی «م.ر.س» و «گ.م»دا هەنە و لە دەقی «ع.س»دا نەهاتوون.

١. [خوسرەوی سەییار: هەتاو. ئەنجوم: کۆی نەجم، ئەستێرە. هەڵاتن: ڕاکـردن و بـزربوون، یان خۆرهەڵاتن]. لەدەقی «م.ر.س»دا لە جیاتی «هەڵنەهاتی»، «هەرنەهاتی» هاتووە.

٢. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «لە بەختی من بوو واکەم ئیلتیفاتی».

٣. تووش: تووشی یەکەم: تووڕەیی و سەرگەرمی، [بەدفەڕی و بێ ئـاکـاری]یـە، و تـووشی دووهەمیش: بە مانای بەسەرهات و تووشبوون دێ.

## (١٥)

## ئەی سولەیمانی زەمان[١]

ئـەی سـولەیمانی زەمـان و شـەیخولئیسلامی ئـەنام
قاسیدی ڕێگەی هـیدایـەت هـودهودی دانـا دەبـێ[٢]

مـن هـومام و قـوللەیی قـافی قـەناعەت جـێگـەمە
لایـقی پـەیغامی ئـەو پـەرویزەیە عـەنقا دەبـێ[٣]

بـۆ حـوزووری قـادری بـۆچـی دەنـێری مـاکـیان
ماکیان ئەمری لە سەر شاهێن لە کـوێ ئـیجرا دەبـێ[٤]

وەختی پەیغامت خورووسێکی هەزار پۆپـەم هـەبوو
دایە بەر شـەق قـاسیدێ وا بـێ جـەوابـی وا دەبـێ[٥]

تا هەڵێنێ زاغی شەب تاووسی هـێلکـەی سـوبحدەم
مەزرەعەی چەرخیش لە توخمی نەجمی تا ئاوا دەبێ[٦]

دانـەیی خـەرمانی عـومری تـۆ لە مـینقاری ئـەجەل
دوورە، سەر سەوز و موتەڕڕا بێ هـەتا دونـیا دەبـێ[٧]



---

١. ئەم هەڵبەستە تەنیا لە سەرچاوەی «گ.م»دا هەیە.

٢. ئەنام: «أنام»، خەڵك. هەڵبەستەکە لە دێڕی دووهەمی دەست پێ دەکا. چونکە نیوە دێڕی یەکەمی بێسەروایە.

٣. هوما: باڵندەیەکی خەیاڵییە، تەیری بەختیشی پێ دەڵێن. [قوللەی قـاف: نـێوی لووتکـەی چیایەکی خەیاڵییە کە هوما یان سیمورغ لەوێدایە].

٤. ماکیان: مریشك (وشەیەکی فارسییە).

٥. خرووس: کەڵەشێر (وشەیەکی فارسییە). پۆپە: پۆپنە، پۆپیتە، پۆپنەی کەڵەشیر.

٦. سوبحدەم: سەردەمی بەیانی. [نەجم: هەم بە مانای ئەستێرەیە و هەم بە مانای گـیایە، بـە قەرینەی مەزرەعە و توخم].

٧. [موحەممەدی مەلاکەریم «دوور و»ی بەلاوە لە «دوورە» ڕاسترە. ـ هەنگاوێ‌تر: ٢٣٧].

## (١٦)

## نەققاشی دەمی

نــەققاشی دەمـی نـوقتەکـی دانـا بـە نـیشانی
زانـــی کـــە زەمـی کـردووە، بـێزارە لە مـانی[١]

وەسفی کەمەرت غەیری دەمی تۆ نییە بـیکات
بێ نوقتە بڵێ ئەو خـەتی مـەعدوومە بـەیانی[٢]

سوورەتگەری سەرلەوحەیی دیوانی مەلاحەت
دوو یوسفی کێشاوە بە بـێ ئـەووەل و سـانی[٣]

فەرقێکی نەبوو غـایەتی ئـەو کـردییە سـووکی
زوو هات و ئـەتۆ بـاعیسی نـازت بـە گـرانـی

پێمخۆشە غەزەل فەرشی قودوومی عوقەلا بێ
نەك بێن و لەبەرکەن جوهەلا لەفـز و مـەعانی[٤]

ئیمکانی لەکن ئەو عولەمای مـوو دەقـەڵێشـن
عـــەنقا و وەفــا بـــوو چ مـــیانی چ دەهـانی[٥]

---

١. لە دەقی «م.ر.س»و «گ.م»دا نووسراوە: «نوختەکی»، بەڵام ئـێمـە لە سـەر دەقـی «ع.س» کردمان بە «نوقتەکی»چونکە لەو باوەڕەداین کە زمانی ئەدەبی حاجی لە سەدەی پێشوو بەو جۆرە بووە «نوقتەکی» = «نقطەکی» بەکار هێناوە نەك وەکو ئەمڕۆ نووسیبێتی «نوختەکی». لە دەقی «م.ر.س»دا لە جیاتی «زەمی کردووە» نووسراوە: «دەمی کردووە».

٢. ئەم بەیتە لە یەکێ لە دوو دەستنووسەکەی لای مندا هەبوو لێرەدا نووسیمەوە. ـ موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. مەلاحەت: جوانی.

٤. لە دەقی «م.ر.س»و «گ.م»دا لە جیاتی «نەك بێن و لەبەرکەن»، «بێت و لەبەرکەن» هاتووە.

٥. دەهان: دەم، زار. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە «حاجی بکوژن بەسیە» بەڵام لەسەر دەقـی «ع.س» وشەی «خێرە»مان نووسی، چونکە گونجاوترە و لە دەقێکی کۆنترا هاتووە.

[ساقی بە فیدات بم لەگەڵ ئەو دەرەیی جامت
بۆ مەجلیسی ئێمەش بکە یەك جورعەفشانی][1]

تا دەستی نەدا خەنجەری نەیفەرموو دەسا دەی
«حاجی» بکوژن خێرە ئیتر مەیدەن ئەمانی



## (١٧)

## مەهـ و میهری بە غارەتدا[2]

مەهـ و میهری بە غارەت دا بە شوعلەی شەمعی ڕوخساری
گولستانیش بە یەغما چوو لە تەنگی غونچەیی زاری[3]

لە نەشئەی دیدەیی مەستی هەموو مەیخانە وێرانن
هەموو کەس بەستە زونارە لە سەودای زوڵفی تاتاری[4]

ڕەوان پەروانەیی نارە، منیش وەك چاوی بیمارم
زەمانم وەك شەوی تارە، دلا وەك غونچە خونخواری[5]

دڵ و جان و ڕەوان و تەن، وەکوو ئیمان و دینی من
فیدای ڕوخساری گوڵناری، نیساری زوڵفی تەڕڕاری[6]

---

١. [موحەممەدی مەلاکەریم، ئەم بەیتەی لە کەشکۆڵی مامۆستا حەمە بۆر وەرگرتووە و ئەم شوێنەی بۆ دیاری کردووە].

٢. ئەم هەڵبەستە لە دەستنووسێکی لای موحەممەد عەلی قەرەداغی وەرگیراوە.

٣. مەهـ و میهر: مانگ و ڕۆژ. بە یەغما چوو: بە تاڵان چوو.

٤. [زونار: پشتێندێکە زەردەشتی یان خاچپەرستان لە پشتی دەبەستن].

٥. ئەم بەیتە لە کەشکۆڵێکی «حەمە ڕەش» ناوێکدا هەبوو موحەممەد عەلی قەرەداغی وێنەی گرتووەتەوە و منیش لێرەدا نووسیمەوە. «موحەممەدی مەلاکەریم».

٦. [تەڕڕار: تەڕدەست، ساحیر].

دەخیل ئەی چاوی جادووگەر بفەرموو مەردومان یەکسەر
دەڵێن خەوتووی بێداری، دەڵێن مەخمووری هوشیاری

شوعاع و شەعشەعەی میهری، ئەشیعەی و میشعەلی بەدری
لە سایەی پڕتەوی ڕووتە، بە قوربان نووری یا ناری؟[1]

بپرسە «حاجی» تۆ جاریٚ لە زوڵف و پەرچەمی خواری
بڵێ: گەر تاری بۆچ ماری؟ بڵێ: گەر ماری بۆچ تاری؟[2]



## (١٨)
## لە عەینی لەعلی کانی

لە عەینی لەعلی کانی خەتتی سەبزی بوو بە میوانی
نەنازێ با "خزر" ئیتر کە مەشهوورە بە حەیوانی[3]

هەتا کوحلی غوباری پێی نەکاتە چاوی خۆی مەردوم
سەوادی خوێندنەوەی نابێ شکستەی خەتتی ڕەیحانی[4]

کە هات و کەوتە حەڵقەی گێژی مریەم ئەو دەمە یەکسەر
ئەرەستۆش وەك فلاتوون توون بە توون چووکەوتە حەیرانی[5]

---

١. پڕتەو: تیشك، ڕووناکی. ٢. تار: داو، تاڵ.

٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «بوو بە میوانی»، «تۆ بە میوانی» نووسراوە. مانای نیوە دێڕی دووهەم هێمایەکە بۆ «خدری زیندە» کە [وا مەشهوورە] ئاوی ژیانی خواردۆتەوە هەر بە زیندووەتی ماوەتەوە، حەیوانی: بەمانای زیندووەتی دێ.

٤. شکستە: خەتی کۆنی فارسییە [شێوەیەکە لە خەتی نەستەعلیق کە بە نەستەعلیقی شکستە مەشهوورە. کوحل: کلە، سورمە. مەردوم: خەڵك، بیبیلەی چاو]. ڕەیحانی: جۆرە خەتێکی عەرەبییە.

٥. مریەم: ناوی ئافرەتێکی جوانی سەردەمی ئەفلاتوون (٤٣٠ ـ ٣٤٧)پ.ز، بووە. ئەرەستۆ: زاناو فەیلەسووفێکی هەرەگەورەی گریك بووە؛ (٣٨٤-٣٢٢)ی پ.ز.

ئەگەر ئـەم زولفـە مـوشکینە، وەگـەر ئـەم لەعـلە ڕەنگـینە
دەڵێی سـەحرایـی مـاچینە، دەڵێی کـانی بـەدەخشانی [١]

بخوێنە "کافیە" و "شـافی" "کـەمال"ی نـەشئەیی "جـامی"
سەدی وەك "ئیبنوحاجیب" سەرفی عومری کرد لە دەربانی [٢]

بەجێما «نالی» وەك ناڵی، بە پاش‌کەوت «کوردی» وەك گەردی
کە «حاجی» غاری دا ئـەسپی لە مـەیدانـی سـوخەندانـی [٣]



## (١٩)

## دەڵێن: یار دێتەوە

دەڵێن: یار دێتەوە، بابی مـەحەببەت ـیـاخودا وا بـێ ـ
ئەگەر دوشمن دەڵێ: نـابێ! مـوغەننی تـۆ بـڵێ: نـابێ

---

١. بە دەخشان: ناوی ناوچەیەکە لە وڵاتی ئەفغانستان بە لەعل و یاقووت بەناوبانگە.

٢. کافیە کتێبێکی ناوداری ئیبنوحاجیبە لە زانستی «نەحو = سینتاکس»دا. شافی، شافیە: ئەمەش کتێبێکی تری ئیبنوحاجیبە لە زانستی «سەرف = مۆرفۆلۆژی»دا [بەکار هێنانی وشەی «کەمال» و «جامی» هێمایە بۆ کتێبی «الکمال» و «جامی» کە شەرح و ڕاڤەن لە سەر کتێبی کافیە و شافیە، («الکمال» بۆ شافیە «جامی» بۆ کافیە). هەروەها «ئیبنوحاجیب» لە لایەنی واتاوە بە مانا «کوڕی دەرگاوان»ە کە حاجی بە «دەربانی» ئاماژەی بە مەش کردووە].

٣. [واتە: کاتێ حاجی ئەسپی بەلاغەت و ڕەوانبێژی خۆی تاو دا، نالی وەك ناڵی ئەسپەکەی بەجێما و کوردی وەك گەرد و تۆزی پێی ئەسپی ئەو بەجێما. بەم بەیتەدا دیارە حاجی قادر زۆر باوەڕی بەخۆی بووە و لەوانەیە مەبەستی لە بەجێ‌هێشتنی نالی و کوردی لە بواری شیعری نیشتمانپەروەری و شیعری ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە بوو بێت؛ دەنا نالی پێغەمبەرێکە کە لە نێو کورددا کەس شانی لە شانی نەداوە چ بگات بەوەی کە وەکوو ناڵ لە دووی ئەسپی شیعری حاجی جێ بمێنێت!!!].

دەلەرزێ باغەبان سەروت لە ترسی قامەتی بەرزی
گوتی: ئەم نیکتە بارێکی گرانە تێدەگەی نابێ

لە هیجرەت هەردەمە سەیلی سروشکم ماجەرای چاوم
بە ڕەنگێك ڕەنگی کرد ڕەنگی جیهان باوەڕ مەکە وا بێ

لە ناکاو دولبەرم فەرمووی هەڵستە ئێستەکێ واعیز
لە بۆمان دادەدا وەعزێ، گوتم: باکت چییە با بێ

بە تەزمین فەردەکی «نالی» دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن فەرقمان زۆرە خەزەف قەت وەك گوهەر نابێ[1]

«کەمەندی زوڵفی دوولانە، لە بۆ گەبر و موسوڵمانە
دەکێشێ بێ‌موحابانە، چ لەملا بێ، چ لەولا بێ»[2]



## (٢٠)

## گەر خەڵقی جیهان[3]

گەر خەڵقی جیهان یەکسەرە فەریادڕەسم بێ
وەڵڵاهی مەپوندار بە غەیری تۆ کەسم بێ[4]

وا سۆزی دڵم ئاگری بەرداوەتە جەرگم
تۆقیوە هەناسەش نەفەسێك هەمنەفەسم بێ

---

١. [خەزەف: سواڵەت، کاسەتەل].

٢. ئەمە دێڕە شیعرێکی «نالی»یە حاجی بە «تەضمین» بەکاری هێناوە. بنواڕە: د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا ١٩٧٧، ل: ١٢٩.

٣. ئەم پارچە هەڵبەستەی حاجی قادر لە هیچ سەرچاوەیەکی چاپکراودا نەهاتووە والێرەدا بۆ یەکەمجار لە دەقی «م.ر.س»ە وە بڵاوی دەکەینەوە.

٤. [مەپوندار = «مپندار»، مەپندار: وامەزانە].

موورغی سەحەرم باڵ و پەڕی وەحشەتی ڕێگەی
هەستان و فڕینم یەکە چەرخیش قەفەسم بێ

نادەم بە هەموو موڵکی سولەیمانی زەمانە،
لەم عالەمە ڕووتی چییە هەرگا هەوەسم بێ

هەر شەو بەدزی نەغمە لەسەر سیدرە دەکێشم
با سابیت و سەییارەیی گەردوون عەسەسم بێ[1]

«حاجی» کە نیگارم سەفەری کرد و نەمردم
عەیبم مەکە وەك هاتووە ئەم شەرمە بەسم بێ[2]



## (٢١)

## داغی کردم بە جەفا

داغی کردم بە جەفا لالەروخێ زیبایێ
پیری کردم بە ستەم لامەزەبێ تەرسایێ[3]

---

١. [سیدرە: دارێکە لە بەهەشتدا. سابیت: ئەستێرە. عەسەس: ئێشکچی و چاودێر بەشەواندا].
چ لە دەستنووسە ئامادەکراوەکەی کاك شارەزا و کاك میران و لە نوسخەکانی لای خۆمدا وشەی «سیدرە» و «عەسەسم» لەم بەیتەدا بە «صدرە» یا «صدر» و «عبسم» نووسرابوون، بەڵام من بۆچوونی خۆم لاموابوو «سدرە» و «عسسم» بووە بۆیە وام گۆڕین. موحەممەدی مەلا کەریم. [مانای بەیتەکەش وەهایە: هەرچەندە هەموو ئەستێرەی سابیت و سەییارە هەیە، هەموو پاسەوانی ئاسمان بن، من گوێیان نادەمێ و هەموو شەو بە دزییەوە خۆم ئەگەیەنمە سەر درەختی «سدرة المنتهیٰ» و دەس ئەکەم بە چریکاندن].
٢. [مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لەبارەی ئەم بەیتەوە وتوویە: وشەی «هاتووە» نییە و «هاتەوە»یە، چونکە حاجی ئەیەوێ بڵێ: کە یارم سەفەری کرد و من لە فیراقی نەمردم، هەرکە هاتەوە ئەم شەرمەزاری نەمردنە بەسم بێ. موحەممەدی مەلاکەریمیش ئەم بۆچوونەی بەتەواوی بە دڵە. ـ هەنگاوێ‌تر: ٢٤٧].
٣. [تەرسا: گاور، خاج پەرست].

تیژبین وەقتی ستەم، گاهی کەرەم بێبەسەرێ
لە وەفا هیچ نەزانێ لە جەفا دانایێ[١]

یاری ئەغیار و بە خۆی موئمین و کافر سیفەتێ
خزمی دوشمن ڕەووش و قاتیلی بێپەروایێ[٢]

ناموسوڵمان، سەنەمێ، خوونی موسوڵمان ڕێژێ
سەرکەش و بەدخوو و هەم دڵشکەن و خودڕایێ[٣]

قیسسەیی حاڵەتی ئەو کەشفە لە ڕۆم و عەجەما
نییە وەك «حاجی»یی بێچارە ئەبەد ڕیسوایێ



## (٢٢)

## وا دیارە...

وا دیارە ڕەسم و قانوونێکی دەوران دادەنێ
کوردی ئێمە گەردشی گەرمێن و کوێستان دادەنێ[٤]

---

١. [بەسەرێ = «بصر»ێ: بێ چاو، کوێر].

٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «یاری ئەغیار و بەدخوو»، «یاری ئەغیار و خەوی» هاتووە. دوشمن ڕەوش: دوژمن ڕەوشت، دوژمن سیفەت. بێپەروایێ: بێترسێ، بێباکێ.

٣. دڵشکەن :دڵشکێن.

٤. ئەم قەسیدەیە لەلایەن «م...خ» ناوێکەوە لە لاپەڕە ٢٢،٢١ی ژمارە ١ی گۆڤاری «هتاو کرد = هەتاوی کورد»دا بڵاو کراوەتەوە کە لە ٢٣ی زیلقەعدەی ١٣٣١ ڕێکەوتی ٢٤ی تەشرینی یەکەمی ١٩١٣دا لە ئەستەموول دەرچووە. فۆتۆی هەر دوو پەڕەی بەرگی گۆڤارەکە و لاپەڕە ٢٠، ٢٣یمان لە برای بەڕێز دوکتۆر ئیحسان فوئاد وەرگرت و لە ڕووی تێکستە چاپکراوەکە قەسیدەکەمان بە شێوە نووسینی نوێ نووسییەوە. برایان کەریم شارەزا و سەردار میرانیش ١٣بەیتی لەم قەسیدەیان لە ڕووی ژمارە ١٩ی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا

☞

**ئەی ئەمیری کوردەکان بۆ ئێوە عەیبە و شوورەیی**
**حیزەکی وەك ........................................... دادەنێ** [١]

---



نووسیبووەوە کە لە ١٦بەیتی بە هەندێ هەڵە و دەسکارییەوە لە چوارچێوەی وتارێکی دوکتۆر ئیحسان فوئاددا لێ بڵاو کراوەتەوە تیادا. ئەمەی لێرە بڵاو کراوەتەوە دەقی ئەوەیە لە گۆڤاری «هەتاوی کورد»دا بڵاو کراوەتەوە. ئەبێ ئەوەش بڵێم کە بەش بە حاڵی من قەسیدەکە هێشتا گەلێ ئاڵۆزیی تیایە، هیوام وایە لە دەرفەتێکی‌ترا لێیان بدوێم. ئەو «م...خ» ناوە لە سەرەتای قەسیدەکەدا ئەم چەند دێڕەشی نووسیوە کە بە تەواوی ئەوەی پێ ئیسپات ئەبێ ئەم قەسیدەیە هی حاجی قادرە:

**«کُلّ راعٍ مسْئولٌ عنْ رَعیّتِهِ».**

«شاعیرێ مەشوورێ کوردان، ڕەحمەتی حاجی قارێ کۆیی، بیست و پێنج بەرێ، ژ کەزەبەکێ شەوتی چەند بەیتەك گۆتییە، ئەویژی بخوێنن، ژ لۆمە و گازنا تاریخان بترسن».

واتە: شاعیری بەناوبانگی کورد خوالێ‌خۆش بوو حاجی قادری کۆیی، بیست و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا لە جگەرێکی سووتاوەوە چەند بەیتێکی گوتووە، ئەویش بخوێننەوە و لە سەرزەنشتی مێژوو بترسن. موحەممەدی مەلا کەریم.

١. لە «هەتاوی کورد»دا جێگای ئەم نوختانە هەر بە نوختە پڕکراوەتەوە، لەبەر ئەوە تێ ناگەم بۆ کە جاری دووەم چەند بەیتێکی قەسیدەکە لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتدا بڵاو کراوەتەوە ئەم نیوە بەیتە وای لێ کراوە: «زاڵمێکی وەك حەمید فیرقەی حەمیدان دادەنێ» من لەو باوەڕەدام ئەم بەیتە هێرشە بۆ سەر ئەرمەنی نەك عوسمانی و مەبەست بە «حیز»ەکەش سەرۆکی سیاسی ئەرمەنەکانە و دوا وشەی لابراویش «ئەرمەنستان»ە و دوکتۆر ئیحسان خۆی زۆر باشی بۆ چووە کە لە وتارەکەیا لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتدا، ئەم قەسیدەیە لەگەڵ قەسیدەی «خاکی جەزیر و بۆتان»دا لە ڕزێکا هۆنیوەتەوە. (بۆ هەڵسنگاندن و ڕاست و دروستی ئەم جۆرە بۆ چوونەی حاجی، بڕوانە: موحەممەدی مەلا کەریم، حاجی قادری کۆیی، شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەیی کورد، ل:٦٢ ـ ٦٦، بەغدا، چاپخانەی نجاح، ١٩٦٠. هەروەها بڕوانە: «الدکتور کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ترجمة محمد الملا کریم، ص٢٦٦ـ٢٧١. م.م.ك».

بۆ کەیە نامووس و عـار و بـۆ چـییە ئـیمان و دیـن؟
خاچ و ئینجیلی لە جێی تەفسیر و قـورئان دادەنـێ[١]

هـەر کـە تـاجی نـایە تـەختی لە کـوردستان دادەنـێ
خەرج و پیتاکـی لەسـەر گـۆران و سـۆران دادەنـێ[٢]

مەدرەسە دەیکاتە جێی قیسسیس و ڕەهبان و کەشیش
بانگە ناقووسی، لە تەکـیەش پـیری مـەتڕان دادەنـێ

بۆ ئیهانەت کـامی سـاحێب عـیززەتە عـەزلی دەکـا
بـــۆ ڕەزیـــلی جـووتیاری خـۆی و گـاوان دادەنـێ[٣]

هەم لەجێی بەگزادەکـان و جـێی فـڵان ئـیبنی فـڵان
بۆ ڕیاسەت سەربەسەر ئـەلقابی ............... دادەنـێ[٤]

---

١. لە «هەتاوی کورد»دا «کییە» نووسراوە، بەڵام دیارە هەڵەی چاپە و ئەبوو شـێوە نـووسینی کۆن «کیە» بنووسرایە، چونکە ئەگەر «کەیە» نەبێ «کێیە» بێ، بەیتەکە لەنگ ئەبێ. لە «هەتاوی کورد»دا یەك دوو هەڵەی تریش لەم چەشنە هەیە و لە جیاتی یەك «ی» دوو «ی» نووسراوە. م.م.ك. هەر لە هەمان سەرچاوەدا، چ لەم شوێنە و چ لە وێنـە هـاوچەشنەکـانیا تـەنها «جـێ» نووسراوە. م.م.ك.

٢. لە «هەتاوی کورد»دا وا نووسراوە. من لام وایە «دادەنێ» کەشی هەڵەیە و وای بـۆ ئـەچم نیوە بەیتەکە بەمجۆرە بێ: «هەرکە تاجی نایە سەر، تەختی لەکوردستان دەبێ» چونکە وا نیوە بەیتەکەش ڕاست ئەبێتەوە و مەعناکەشی تەواو ئەبێ و جوانیش نییە «دادەنێ» کـە تـەنها لە یەکەم بەیتی قەسیدەکەدا لە داوێنی هەردوو نیوبەیتەکەدا دووبارە بووەتەوە و لە بەیتەکانی تردا تەنها بۆ ڕاگرتنی قافیە پێویستە، لە خۆیەوە لەو ناوەڕاستەدا ڕاست بێتەوە. م.م.ك.

٣. لە «هەتاوی کورد»دا بە هەڵەی چاپ «گاوا» نووسراوە. م.م.ك.

٤. جێی ئەم نوختانەش لە «هەتاوی کورد»دا هەر بە نوختە پڕ کـراوەتـەوە. لام وایـە دوکـتۆر ئیحسان باشی بۆ نەچووە کە بە وشەیەکـی «خـۆیـان» پـڕی کـردوەتەوە، چـونکە «خـۆیـان» وشەیەك نییە مەترسی لێ بکرێ و پێویست بێ لابرێ. وائەزانم لێرەدا لەقەبێکی ئەرمەنییانە هەبووە بۆیە لابراوە. م.م.ك.

هەر لە پاش چەند ساڵی تر تەسخیری بەغدادیش دەکا
شـــارەزووری قشـــڵەیـــە، دەبـــۆ لە بـابان دادەنـێ[١]

بـاغ و ڕاغـی بـولبولە دەیکـاتە جـێی زاغ و زەغـەن
گورگ و مامڕێوی لە بێشــە و لانـی شـێران دادەنـێ[٢]

خـانەتان وێران دەکـا قـەسر و قـوسووری لێ دەکـا
بۆ ئەمەی نـەچنە عـەجەم ئـێلـچی لە تـاران دادەنـێ

بۆ کوڕی چاك و کـچی شـیرینی ڕایکـێشـێ بـە زۆر
کوللی شار و دیهکەدە جـاسووسی پـەنهان دادەنـێ

تـا بـزانـێ کـێ نـوێژی کـرد و ڕۆژیـی گـرتووە
بـۆ سـیاسەت کـردنی پـەنجا نـیگەهبان دادەنـێ[٣]

تـا وەهـا بـێ ئـیتتیفاق و سـەرکەشی بـێ شـێوەتـان
تاجی کیبر و نیخوەت و غیرەت لە سـەرتان دادەنـێ

شـارەزای ئـەحواڵمـانە ..................... بـێگـانە نـین
داغی سەد سـاڵی هـەیە ئـەمڕۆ لە کـوردان دادەنـێ[٤]

خزمە بەسیە، تێبگـەن هـەر بـایە قـەولی ................
شـــاهی ئـــێران ڕادەکـا سـوڵتـانی تـووران دادەنـێ[٥]

---

١. [قشڵە: بنکەی چەکداران، سەربازخانە. دەبۆ: لەوانەیە مەبەستی لە دەببابە و تانگ بێ]. لە «هەتاوی کورد»دا بە هەڵەی چاپ «بابا» نووسراوە. م.م.ك.

٢. ڕاغ: مێرغوزار، داوێنی چیاکە سەوز بێ. زاغ: قەلەڕەش. زەغەن: چۆلەکە ڕەشە. م.م.ك.

٣. نیگەهبان: ئاگاداریکەر. م.م.ك.

٤. جێی ئەم نوختانەش لە «هەتاوی کورد»دا هەر بە نوختە پڕ کـراوەتـەوە. لاموابـێ حـاجی لێرەوە باسی عوسمانییەکان ئەکا. م.م.ك.

٥. جێی ئەم نوختانەش لە «هەتاوی کورد»دا هەر بـە نـوختە پڕ کـراوەتـەوە. لاموابـێ وشـە لابراوەکەی ئێرە «ڕۆمییان»بێ. م.م.ك.

ئـێسـتـه مـەعلووم بـوو ..................................
زاهـیرەن هـەرکامیان تـاعەت دەکـا، نـان دادەنـێ[1]

ڕێگـر و حـیز و دزە، ژن هـەڵگـر و مـاڵان بـڕە
فائیدەی چی نێو و کونیەی خۆی موسوڵمان دادەنـێ

وادەزانێ قەومی خۆی وەك دایە بـەر شیر و تـفەنگ
قـەسری دیـن ئـاوا دەکـا، بـونیادی ئـیمان دادەنـێ

عـەقڵەکـی خـوا داویـە گـەر پـیرەژن سـەرفی بکـا
دەسـتی ڕۆسـتەم بـادەدا، تـووران لە ئـێران دادەنـێ

ئیستەکـێ ئـەییامە کـە هـەر مـیللەتێ هـیممەت بکـا
مووری بێمـایە لەسـەر تـەختی سـولەیمان دادەنـێ

بەیتی «حاجی» چـونکە ئـەفسانەی تـورکبازی نـییە
زۆر وەریـنە، بـاوجوودی دوڕڕو مـەرجـان دادەنـێ

سـائیلێکـی مـەککـەیی دێت و بـە مـەکـتووبی درۆ
حـیشمەتێك پـەیدا دەکـا، مـاڵی فـراوان دادەنـێ[2]

گەورە دەیخوێنـێتـەوە، هـەم بـچکە دەیـنووسێتـەوە
بـەیتەکـانی مـن لە گـۆشـەی تـاقی نـیسیان دادەنـێ

بیست و سێ بەیتە قەسیدەم هەر کەسێ گوێی لێ بکا
پێ لە سەر تـاقی مـەه و ئـەیوانـی کـەیوان دادەنـێ[3]

---

١. جێی ئەم نوختانەش لە «هەتاوی کورد»دا هەر بە نوختە پڕ کراوەتەوە. م.م.ك.

٢. سائیل: سواڵکەر. م.م.ك.

٣. قسیدەکە لە «هەتاوی کورد»دا بیست و چوار بەیتە نەك بیستوسێ، جا یا بـەیتێکـی لێ زیاد کراوە، یا بە هەڵە «بیستوچوار» لە بەیتەکەدا کراوە بە بیست و سێ. م.م.ك.

## (٢٣)

## حەبیبی جان[1]

حەبیبی جان لەسەرچی ئەم ڕق و کینە، هەتا کەی بێ
بفەرموو دەنگی ساز و نەغمەیی موتریب، نەوای نەی بێ

بەری بوو دڵ لە عالەم تا لە نێو زوڵفت موقەییەد بێ
ئیتر فەرشی حەیات و خۆشی یەکبارە دەبا تەی بێ

بە بادم دا دڵ و دین عاقیبەت بۆ بادەیی چاوت
دەمێکە توشنەیی هیجرم، بڵێن بادە پەیاپەی بێ

لە نەزعی دەردی فیرقەت جانی زارم قەت خەلاس نابێ
مەگەر لەم کەوسەری لێوە، بڵێ بۆ خەستە با مەی بێ[2]

---

☞

بۆ پتر ئاگاداری لە بارەی ئەم قەسیدەیەوە، بڕوانە لێکۆڵینەوەکەی: د. ئیحسان فوئاد لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتی ژمارە ١٩ی ساڵی ١٩٧٦ و لاپەڕەکانی (٥٧-٧٠) بە تایبەتی پەراوێزی ژمارە ١ی ساڵی ٩ی کە نووسراوە: ئیحسان فوئاد، شیعرێکی بڵاونەکراوەی حاجی، گۆڤاری «میللەتانی ئاسیاو ئەفریقا» مۆسکۆ ١٩٦٧، ژمارە ٢ ل: ١٣٦-١٣٨ «بەزمانی ڕووسی».
هەروەها بڕوانە لێکۆڵینەوەیەکی عەبدوڕڕەززاق بیمار لە ژمارە ٨ی ساڵی ١٩٧٤ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ و لێکۆڵینەوەیەکی کەریم شارەزا لە گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٨٣.

١. ئەم پارچە شیعرە، لەگەڵ پارچە شیعرێکی فارسی «مەخفی» و پارچە شیعرێکی کوردی «وەحشی» و تاکە بەیتێکی «مەنفی»دا لە دوو دیوی قاقەزە کۆنێك نووسراونەتەوە کە کاك بەشیر حوسێن سەعدی لەناو کتێبە کۆن و دەستنووسەکانی باوکی خوالێخۆش بووی مامۆستا مەلا شێخ حوسەین سەعدیدا دۆزیویەتەوە و ناردوویە بۆ کاك کەریم شارەزا و ئەویش لەگەڵ سیایی ئەم کتێبە ناردیە لای من. هەرچەند کاك بەشیر تێکرا پارچە شیعرەکەی بە شێوە نووسینی نوێ نووسیبووەوە، لە هەندێ شوێنیا کەوتبوە هەڵەوە و من خۆم ساغم کردووەوە. موحەممەدی مەلا کەریم.

٢. [نەزع: گیاندەرچوون، کەوسەر: حەوزێکە لە بەهەشتدا].

لە بەر سێوی جەماڵت حەق نییە تەنها منم مەحرووم
یەکێ لەیموون و یەك نارنجە، بۆ «حاجی» مەگەر بەی بێ



## (ا)

## ئودەبا چاکە

ئـــودەبا چـــاکـــە لێم نـــەبن دەرهـــەم
لەم قســـەو لەم حـــیکایەتەی دەیکـــەم

ئـــیددعای هـــەر ســـەنایعێك نـــاکـــەن
تاکوو نەیخوێنـــن، ئـــیمتیحانی نـــەکـــەن

پـــێی دەڵێن حـــیلەباز و کـــەززابـــە
«شـــێخ نـــەبی» خـــاریجە لە ئـــەم بـــابە[1]

خانەقا و شێخ و تـــەکـــیەکـــان یـــەکســـەر
پـــێم بـــڵێن: نـــەفعیان چـــییە ئـــاخر

غـــەیری تـــەعلیمی تـــەنبەڵی کـــردن
جـــەمعی ئـــەملاك و خـــەزنە کـــۆکـــردن

دەفـــعەیەك ئـــیمتیحانیان نـــاکـــەن
تـــێبگـــەن زەهـــرە یـــا نـــە تـــریاکـــن

لە مەحەککی بدەن ئەگـــەر وەکـــوو زەڕ
تـــێدەگـــەن ڕێگـــرن وەیـــا ڕەهـــبەر[2]

---

١. شێخ نەبی: مەبەستی لە شێخ نەبی ماویلیی ناحەزی حاجییە، لە هەندێ لە شیعرەکانیدا بە «کەر نەبی» ناوی دەبا.
بەیتی دووەم و سێهەمی ئەم پارچەیە جێیان ئەم سەرەتایە نییە و نازانین چۆن وەها خراونەتە ئەم شوێنە، بەڵام وەك سەرنجماندا لە هەموو سەرچاوەیەکی چاپکراو و دەستنووسدا هەر لەم شوێنەدا هاتوون، بۆیە ئێمەش هێشتمانەوە.
٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «ڕەهبەر»، «ڕێبەر»ی ئەم سەردەمەمان هاتووە.

دەخیل شێخ و مێخ مەبن ئەبەدا
هیچ کەسێ ڕزقی هیچ کەسێ نادا

ئەی خەریکی ڕمووز و ناز و نیاز
ئەورووپا فەننی گەیوەتە ئیعجاز

قوللەیی «ئیفل»ی لە ئەفلاکە
عەکسی ئەو گەردشی لە ژێر خاکە[1]

کورەیی ئەم زەمینەیان پێوا
خاتری تۆ بێ چوونە جەووی سەما

قسەیێ ئەمڕۆ دەیگرن لە زوبان
ساڵێتر بۆت دەکەن بە بێ نوقسان

سەدو پەنجا لوغەت زیاد دەکەن
ساڵی بۆ ناوی سەنعەت و بۆ فەن[2]

چینی ئاتەش پەرستن ئێستاکەش
گەبری بێدین و هیندووی ڕووڕەش

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین:
«أُطلُبوا عِلمَكُمْ وَ لَوْ بالصين»[3]

---

١. ئیفل: قوللەیەکی بەرزە لە شاری پاریس لە ساڵی ١٨٨٧دا ئەندازیارێکی فەڕەنسایی «ئیفل» ناو لە سەر کیسەی خۆی، دەستی بە دروستکردنی کرد و ٧/٥ ملیۆن فرەنکی زێڕی تێچووە و بەرزایی ٩٨٤ پێیە و لە ساڵی ١٨٨٩دا تەواو بووە و لە ماوەی سێ مانگ و نیودا ئەم پارەیەی لەلایەن تەماشاکارانەوە چنگ کەوتەوە کە لە هەموو لایەکی جیهانەوە بۆی دەهاتن. بڕوانە عەلائەددین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی ج٢، بەغدا ١٩٧١، ل:٣٥٩.

٢. ئەم دوو بەیتە تەنها لە دەستنووسێکی لای مندا هەبوون، موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. [واتە: بە دووی زانیندا بڕۆن با لە چینیشدا بێ].

نـێرو مـێ لەم حـەدیسە فـەرقی نـییە
گەر مـەلا نـەهیی فـەرموو دیـنی نـییە[١]

تـۆ وەرە فـەننی فـێر بـە چـیتە لەوە
گـاورە، هـیندووە، وەیـاخۆ جـووە[٢]

لازمـە خـول بـخۆی وەکـوو بـەرداش
هەموو قەڕنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش[٣]

تـەنبەڵی کـاری حـیز و بـێ‌خـێرە
"دەسـتی مـاندی لە سـەر زگـی تـێرە"[٤]

ئـەهلی جـەننەت نـە شـوان و گـاوانـە
سـاحیبی فـەنن و عـیلم و عـیرفانە[٥]

---

١. [واتە: ئەگەر مەلا گوتی ئەم حەدیسە لەبەر ئەوەی جێناوەکانی (و، کُم) ڕوو لە نێرینە دەکا کەوابوو تایبەت بە پیاوانە و ژنان بێبەشن، درۆی کردووە؛ چۆن زۆرینەی ئایەت و حەدیسەکان ئاوەهان وەکوو: (أَقیموا الصلاة)، بەڵکوو ڕووی ئەم جێناوانە (ضمیر) لە مرۆڤ یا موسوڵمانە].

٢. لە هەندێ دەقدا ئەم دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە:
«تۆ وەرە فێری فەن بە چیتە لەوە
گاورە جووە، یاخۆ هیندووە»

٣. ئەم دێڕە لە دەقی «مستەفا صائیب»دا بەمجۆرە هاتووە: «کوللی» قەڕنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش. بڕوانە: موحەممەد عەلی قەرداغی، هەنگاوێك بۆ ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، گۆڤاری «بەیان»ی ژمارە ٦٦ی ساڵی ١٩٨٠.

٤. «دەستی ماندوو لەسەر زگی (سکی) تێرە» پەندێکی پێشینانی کوردییە حاجی لە پێناوی ئامۆژگاری نەتەوەکەی بۆ کارکردن و تێکۆشان بەکاری هێناوە. بڕوانە: شێخ موحەممەدی خاڵ، پەندی پێشینان چ٢، بەغدا ١٩٧١ ل:٢٣٧.

٥. [ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی‌تردا بەم شێوە هاتووە:

فـائیدەی گـەر بـدایـە زیکـر و دوعـا
دەبـووە قـاروون گـەدایـی سـەررێگـا[1]

هەرچی بـێبـەهرەیە لە کـەسبی کـەماڵ
دبـتە دەروێش و مـارگر و حـەممالْ

لە حـەدیسا هـەیە حـەبیبی خـودا
گـوتی: الکـاسبُ حـبیب اللّـه

مـوسحەفی خـوایـە عـالمی بـرسی
بـە دوو نـانی دەدات و نـاترسی[2]

سۆفی وەك تیشنە بوو لە زیکری هـەتاو
سـەد نـوێژی دەدا بـە کـاسەك ئـاو[3]

شیعی وەك تـیشنە بـوو لە سـینە زەدەن
بە دوو قەترە دەدا حوسەین و حەسەن[4]

---



«ئەهلی جەننەت شوان و گاوانە»
«جووتیار و سەپانی خەرمانە»

ـ هەنگاوێ‌تر: ٢٥٤.]

١. قاروون: ناوی عەرەبی «کریزوس»ی دوا شای لیدییەکانە و بە سامان زۆری و دەوڵمەندی بەناوبانگ بوو. هەندێ سەرچاوەی تریش دەڵێن وەزیرێکی فیرعەون بووە جوولەکەکانی زۆر ئازار داوە. «الموسوعة العربیة المیسرة».

٢. ئەم دوو بەیتەش لە دەستنووسێکی لای مندا هەبوون. موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. تیشنە: تینوو. [مەبەستی حاجی لە زیکری هەتاو، زیکرێکە کە لەبەر هەتاوا بکرێ، واتە: هەرئەوەندە سۆفی لەبەر هەتاوا زیکری کرد و گەرما لێی دا و تینووی بوو، ئیتر چ نوێژییە ئەدا بە کاسەیەك ئاو کە بیخواتەوە].

٤. سینە زەدەن: لە سنگ دان، سنگ کوتان. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «بە دوو قەترە دەدا» نووسراوە: «بە دە قەترە دەدا».

بە قسەی موخبیر و مـوئەڕڕیـخی کـۆن
مـیللەتی چـینە چـار سـەد مـلیۆن

سـەر بـەسەر دەوڵەتـی هـەموو ژاپـۆن
زۆر بە زەحـمەت دەگـاتە چـل ملیۆن

ئەهلی ژاپۆن بە فـەنن و سـنعەتی چـاك
سەیری چۆن چینی گرت وکردییە خاك[1]

ئـــیتتیحادی بـــە ئـــیتتفاقی ئـــەنام
ســـوپەرە بـــۆ حـــوادیســـی ئـــەییام[2]

کـــوردی ئـــێمـــە نـەزان و پـاشکەوتن
پـــێکـــەوە پـووش و ئـاگـر و نـەوتن[3]

بـــێ ئـەگـەر دەسـتی یەکـتری بگـرن
وەك سکەندەر جیهان هـەموو دەگـرن[4]

خواردن و سەتری عـەورەت و سـوکنا
بـــاعیسی ژیـــنە بـــۆ گـــەدا و پـــاشا

---

١. [ئەم سەرکەوتن و پێشکەوتنەی ژاپۆن لە سەردەمی میجیدا (واتە: ڕووناك) بـە پـاشایەتی «موتسۆهیتۆ» بووە کە وڵاتی ژاپۆن بۆ دابینکردنی نیازی سنعەتی خۆی دەستدرێژی کرد بۆ وڵاتی چین].

٢. [ئەنام: مرۆڤ]. سوپەر: مەتاڵی جەنگ، شەڕکەر لە کاتی شیربازی خۆی پێ دەپارێزێ.

٣. لە دەقی «م.ر.س»دا، «کوردی ئێوە» نووسراوە.

٤. ئەم دێڕە شیعرە لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرەی خوارەوە هاتووە:
«بێ و ئەگەر دەستی یەکتر بگرن
وەك سکەندەر جیهان هەموو دەگرن»

حــاڵەتــی وایــە چــی لەسـەر خـاکـە
غــەیری "عـــیسا" دەڵێن لە ئـەفلاکـە[1]

ئــەو هــەموو مـەدحی بـادە و دولبـەر
نــووسراوە لە ســەد هــەزار دەفــتەر[2]

وەکــوو خــەمسەی نــیزامـیی گـەنجە
کــە لە لای خــەڵقــی کـیمیا و گـەنجە[3]

یــا وەکــوو بـەیتی شـیرین و فـەرهاد
شیعری «حـاجی» لەبەر کـرایـە بـە یـاد[4]

---

۱. [موحەممەدی مەلا کەریم لای وایە وشەی «دەڵێن» هەڵەیە «کەوا» ڕاستە بۆ ئەم جێگایە، ئەڵێ: چونکە ناکرێ حاجی بە دوو دڵییەوە باسی مەسەلەیەك بکات کە خودا لە قورئاندا دانی لەسەر ناوە و ئـەفەرموێ: ﴿و ما قَتَلُوهُ یَقیناً بَلْ رَفَعَهُ اللّٰهُ إلَیه و کانَ اللّٰهُ عزیزاً حَکیماً﴾ نیساء: ۱۵۸. ـ هەنگاوێ‌تر: ۲۵۸].

۲. [موحەممەدی مەلا کەریم وشەی «ئـەم»ی لە «ئـەو» پـێ ڕاسـتترە]. لە دەقـی «گ.م»دا لە جیاتی «لە سەد هەزار دەفتەر» نووسراوە: «لە سەر هەزار دەفتەر».

۳. [نزامی گەنجەوی: شاعیرێکی بەرزی ئێرانییە (۵۳۰ـ٦۱٤ ك.م) بەرهەمە بە ناوبانگەکانی پێنج گەنج، یان خەمسەی نیزامین کە بریتین لە: خەسرەو و شیرین، مەخزەنو لئەسرار، لەیلێ و مەجنوون،].

٤. لە دەقی دەستنووسی «مستەفا سائیب» بەمجۆرە هاتووە:

«سەد یەکی باسی شیرین و فەرهاد
بگوتایە لە ڕێی مەعاش و مەعاد»

بڕوانە: موحەممەد عەلی قەرەداغی، گۆڤاری «بەیان» ژمارە ٦٦ی ساڵی ۱۹۸۰.

[موحەممەدی مەلا کەریم لای‌وایە نیوە بەیتی دووەم هەڵەیە و ڕاستەکەی ئاوایە: «بگـوتایە لەڕێی مەعاش و مەعاد»، ئەڵێ چونکە ئەمە لەگەڵ بەیتی پاشەوەی گونجاوترە. ـ هەنگاوێ‌تر: ۲٦۰].

ئێستە میللەت دەبوونە ساحێبی جاه
یانە هەمتایی «أولیاءَ اللّه»[١]

کێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن
بەسە ئەم نەقسە گوێ لە من ناکەن

لە قسەی ساغی من خەلەل دەگرن
واهیمەی شێخەکان لە دڵ دەگرن[٢]

ئەوی موحتاجی نان و پیوازە
یا هەتیوبازە یانە مێبازە

حەیفە بۆ مەردی ساحێب تەمیز
هێندە باسی مەکانی پیسی و میز

عیشقبازی و هەوایی دەروێشی
میللەتی خستە فەقر و بێئیشی[٣]

ئەو کەسەی دەوڵەمەندەکی چاکە
بەندەیی ڕۆمییانی ناپاکە

هەموو مردووی میان و سمتی خڕن
بەیتی مەدداحیان بە جان دەکڕن

بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غەریبی و بێکەسی دەمرێ

---

١. ئەم دەقەش وەك دەقی دەستنووسەکەی «مستەفا سائیب»ە. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢. [خەلەل: ڕەخنە، ئیراد. واهیمە: قسەی هیچ و پووچ].

٣. لە دەقی «گ.م»دا «فەقر و دەروێشی» هاتووە.

تـــا لە ژێر بـــاری ڕۆمـــیان نـــەمرن
زەحـــمەتە قـــەدری بـــەیتی مـن بگـرن

یا نە وەك ئەهلی مـەغریب ئـێستاکـی
چـــیە نـاوت؟ دەڵێ: خـــریستاکـــی

باوکم «ئەحمەد» بوو ناوی، فـیکرم دێ
خەڵقی لادێ بـوو دایکـی مـن «فـاتێ»

«حاجی» سا بەسیە سـەد هـەزار دەفـعە
پـێم گـــوتی: ئـــەم قســـانە بـێنـەفعە[1]

ڕۆژی ئـــەووەل لە بـــەندە و ئـــازاد
خـدمەتی خـەڵقـە قـیسمەتی ئـەکـراد[2]

لێی گـــەڕێ قـــەومی تـۆ هـەموو مـارن
دز و حـــیز و پـــیاوکوژ و هـــارن

مـــــڕی نـــاوداری ورچـــی نـــاو دارە
ڕاستیان خـوارە، خـواری خـونخوارە[3]

بـــاوکە! هـــەر چـۆنـێ تـۆ دەڵێی وایـە
زەن دەکـــەم ئـــەم قســـانە خـــۆڕایـە[4]

---

١. ئەمە بە گوێرەی دەقـی «ت.ر» و «ر.گ»ە. لە دەقـەکـانیتردا نـووسراوە: «بـەسیە حـاجی دوسەد هەزار دەفعە».

٢. ئەم دێڕە شیعرە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەهاتووە تەنها لە دەقی «م.ر.س» نەبێ.

٣. [مڕ: تێر و تەسەل]. ئەم دوو بەیتەش لە یـەکـێ لە دەسـتنووسەکـانی لای مـندا هـەبوون. موحەممەدی مەلاکەریم.

٤. [زەن = ظَن]. نیوە دێڕی یەکەمی ئەم بەیتە لە «ت.ر»دا بەمجۆرە هاتووە: «باوکە هەر چۆنێ تۆ دەڵێی وایە». لە هەندێ دەقیشدا لە جیاتی «زەن دەکەم» نووسراوە: «تێدەگەم».

قــوڕی کـام جـێ بکـەم بـەسەر خـۆدا
ئــەمە لێم بــوویتە عــیللەتی ســەودا[1]

بــە قســەی چــاکــە دەسـتیان دەگـرم
تــەرکی نــاکــەم بـە لۆمـە تـا دەمـرم



(٢)
## یا ئیلاهی

یـــا ئــیلاهی بــە ئــایەتی مــونزەل
بە چــوار یــاری ئـەحمەدی مـورسەل[2]

بــێ نــەوایــانی مــوڵکــی کـوردستان
هــەر لە گــاوانــی تـا دەگــاتە شـوان[3]

لە خەوی جەهل و مـەستی و غـەفڵەت
بە خەبەر بێن بـە نـەغمەیی ڕەحـمەت

پاکی دەرچـن لە کـاری نـا بـە مـەحەل
ڕۆمــی ڕافــڕێـنـن بـۆ دەری ئـەسفەل[4]

«حاجی»یـە شـیعرەکـانی وەك "کـاوە"
ڕۆژێ دەبـــــیێن درەفشـــی هـــەڵداوە[5]

---

١. لە دەقەکانی غەیری «م.ر.س»دا لە جیاتی «خۆدا» نووسراوە: «خۆما».

٢. [ئایەتی مونزەل: واتە: ئەو بـەڵگـەیەی وا دابـەزێنـراوە، مـەبەست قـورئانە]. مـەبەستی لە «چوار یاری ئەحمەدی مورسەل» چوار خەلیفەکانی ڕاشیدینە.

٣. بێنەوایان: کۆکراوەی بێنەوایە، بێکەس، بێهێز و پشت و پەنا.

٤. کاری نا بە مەحەل: کاری نابەجێ. دەری ئەسفەل: «الدرك الاسفل». ژێرەوەی جەهەننەم.

٥. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە «ڕۆژی دەی بێن». درەفشی هەڵداوە: ئاڵای هەڵداوە، درەفش: ئاڵاکەی کاوەی ئاسنگەر بوو لە دژی ئەژدەهاکی زۆردار.

## (٣)

## ئەو ڕۆژە[١]

ئـــەو ڕۆژە بـە ئـەمری حـەییی مـەننان
ئـــەم عــالەمە پــاکــی بــوو بــە تــۆفــان[٢]

دەیـــاریٚ نـــەما لە جــینسی زیڕووح
غـــەیری ئـــەمە هــاتە کـەشتیی نــووح[٣]

ئـــەو ڕۆژە گـــەیشتە وەقــتی مــەعهوود
وەستاوە لە سـەر چـیایەکـەی جـوود[٤]

هـــەر ســـیٚ کـوڕی کـردیانە مـەسکەن
ئەو جیٚ و مـەکـانە مـیسلی گـوڵشـەن[٥]

---

١. [ئەم پارچە شیعرەی حاجی لەسەر ئەو ڕیوایەتەی قـورئان دامـەزراوە کـە دەفـەرمویٚ: لە سەردەمی حەزرەتی نووحدا تەواوی دنیا ئاو دایپۆشی و هـەموو زیـندەوەران لەنـاو چـوون بێجگە ئەوانەی لە ناو گەمێیەکەی نووحدا بوون، کە دوای نیشتنەوەی تۆفان، لەسـەر کـێوی «جوودی» (چیایەکە لە نێوان کوردستانی عێراق و کوردستانی تورکیادا) لەنگەری گرت، جا بەم بۆنەیەوە کوردستان بە بێشکـەی دووەمـی مـرۆڤ و هـەووەڵیـن ژیـنگە لە پـاش تـۆفـان دەژمێردریٚ].

٢. حەیی مەننان: «حيّ منّان»، مەبەست لە خودایە.

٣. [دەییار: کەس، تاق، دانە. زیڕووح: گیانلەبەر]. لە هـەندیٚ دەقـدا لە جـیاتی «دەیـیاری»، «تاقێکی» نووسراوە. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵیٚ: کاتی خۆی لەبیرمان چوو وشەی «ئەمە» بکەین بە «ئەمن» کە ئەمن ڕاستترە. ـهەنگاویٚتر: ٢٦٧].

٤. لە دەقی «گ.م» لە جیاتی «ئەو ڕۆژە»، «ئەو وەختە» هاتووە. و لە دەقی «ع.س»دا «چیاکەیی جوود» هاتووە.

٥. [سیٚ کوڕی: کوڕانی حەزرەتی نووح؛ سام، حام، یافس].

ئـــێســـتاکـــە جـــزیرە بـــێ‌مـــوحابا
مـــــەعموورەیی ئـــــەوەڵە لە دونـــیا[1]

ئـــەولادی ســـەحیحیان بـــە بـــورهان
کوردن لە مـەکـانی جـەددی خـۆیـان[2]

سـوککانی بـیلادی ڕوبـعی مـەسکوون
«بالجملە» لە مـانە مـونشەعیب بـوون[3]

بێ تـەفرەقە بـوون مـوتیع و هـەم‌دەنگ
هەم مەشرەب و هەم لیباس و هەم‌ڕەنگ

ئـــــایین و مـــــەزاهـــیب و ڕەســـائیل
وا کـــــــــــردیە فـــــرقە و قـــــەبائیل

وەك خەڵقـی نـەچوونە مـوڵکـی ئـەدنا
جـێی بـــاوکی خـۆیـان کـردە مـەئوا[4]

ئـاریٚ بـە حـەدیس و نـەسسی قـورئان
حـــــوببی وەتـــــەنە دەلیـــلی ئـیمان

حـــادیس نـــییە، ئـــەسلە گـــفتوگۆیـان
مەورووسە لە دەوری جەددی خۆیـان[5]

---

١. [بێ‌موحابا: بێ‌ڕوودەرباسی].

٢. [جەددی خۆیان: مەبەست حەزرەتی نووح و کوڕەکانیەتی]. لە دەقی «گ.م» و «م.م»دا ئەم نیوە دێڕە بەم‌جۆرە هاتووە: «کوردن لە شوێنی جەددی خۆیان».

٣. ڕوبعی مەسکوون: ئەو خاکەیە کە خەڵکی لێ‌دادەنیشێ. مونشەعیب بوون: لق و تیرەیان لێ بووەوە.

٤. [ئەدنا: نزمایی، پەست، مەبەست شۆنەکانی دیکەی دنیایە. مەئوا: شوێن و جێگە].

٥. [واتە: زمانەکەیان زمانێکی تازە و نوێ نییە بەڵکوو هەر ئەوە ڕەسەنە و لەسەر بـنچینەی باپیریان دامەزراوە].

ئـێـسـتاکـە کـە وا جـەماعەتی «وان»
ئەسڵن بە نەسەب کـەریم و شـوجعان[١]

مـونقادی عـەجەم، مـوتیعی ڕۆمـن
مەحکوومی خـەڕات و حـیز و دۆمـن[٢]

تـەقسیری ئـەوان نـییە ئـەمانە
هـەرگیز بـە تـەعەججوبی مـەزانـە[٣]

ڕەسـمێکـی قـەدیمە دەوری گـەردوون
خـەسمی نـوجەبایە، هـەمدەمی دوون[٤]

«حـاجی» ئـەمنیش مـیسالی کـوردان
کەوتوومە کەمەندی نـەفس و شـەیتان[٥]

لەم حەبس و کەمەندە فیکری دەرچوون
مومکین نییە، من یـەکـم ئـەوان دوون[٦]

مـەوقووفە بـە ڕۆسـتەمی عـینایەت
مـوحتاجە بـە هـیممەت و هـیدایـەت

---

١. [وان: ئەوان، یان مەبەست شاری «وانە» کە کەوتۆتـە بـاکـووری کـوردستانەوە. شـوجعان: بوێران و نەترسان].
٢. مونقادی عەجەم: لە ژێر سەرکردایەتی عەجەمن. موتیعی ڕۆمن: بـە فـەرمان و بـە گـوێی ڕۆمەکان (تورکە عوسمانلییەکان) ئەکەن، ژێر دەستی ئەوانن.
٣. ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی لای مندا هەبوو لێرەدا نووسیمەوە. موحەممەدی مەلا کەریم.
٤. [خەسمی نوجەبا: دوژمنی لەگەڵ پیاوچاکاندا]. هەمدەمی دوون: هاودەم و دۆستی پیاو خراپانن.
٥. کەمەند: پەت، داو، گوریس.
٦. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرە بەمجۆرە هاتووە: «لەم جیسم و کەمەندە فیکری دەرچوون».

دەرچــم لە ئـەسیری مـیسلی «بـێژەن»
ڕاهـی بـوو بـە قـووەتی تـەهەمتەن[١]

ئـەی بـێبـەدەل و شـەریك و تـەنها
«مـا أعـظَمَ شَأنُكَ تَـعالیٰ»!؟[٢]

تـەعیین بکـە ڕۆسـتەمی دیـرایـەت
تـەوسەن بـدە خـوسرەوی عـینایەت[٣]

تـا کـورد و ئـەمن لە دەسـتی دوونـان
دەرچین، هەر ئەتۆی ڕەحیم و ڕەحمان[٤]

•••••••▬▬●▬▬•••••••

## (٤)

## تا ڕێك نەكەون

تـا ڕێك نـەكـەون قـەبیلی ئـەکـراد
هـەروا دەبـنە خـەرابـە ئـاباد[٥]

ئـەنواعـی مـیلەل لە گـەورە تـا چـووك
خـەملیـوە مـەمالیکی وەکـوو بـووك[٦]

---

١. [بێژەن: پاڵەوانێکی سەردەمی ڕۆستەم بووە]. تەهەمتەن: پیاوی زۆر ئازا، یان نازناوی ڕۆستەمی زاڵە لە ئازایەتیدا.

٢. [واتە: چەند زاتی تۆ بەرز و مەزنە!؟].

٣. تەوسەن: ئەسپی سەرکەش.

٤. دوونان: کۆکراوەی دوونە، واتا: پیاوی هیچ و پووچ.

٥. لە دەقی «ت.ر»دا نووسراوە: «تا یەك نەکەون قەبیلی ئەکراد».

٦. لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «ئەنواعی میلەل بە گەورە و چووك». لە دەقی «ت.ر»یشدا بەمجۆرە نووسراوە: «ئەنواعی میلەل لە گەورە و بچووك». ئێمە دەقی «ر.ك»مان پەسند کرد و لە هەڵبەستەکەدا نووسیمان.

یەك بەرگن و یەك زوبان و یەك ڕەنگ
بێ غەیبەت و عەیب و عار و بێدەنگ

دنیا بە تران دەخۆن و دەیدەن
هەرچۆنێ مەرامیانە دەیکەن

هەر کوردن ئەگەرچی پاکی مەردن
پامالی زەمانە، میسلی گەردن[1]

هەر مانەوە بێنەوا و مەزلووم
وەك بوومی خەرابەزار، مەشئووم[2]

گەر باعیسی ئەم دەپرسی کامە
شەرتێکە کە بۆ هەموو تەمامە

ئەو شەرتە بە کوللی ئیتتفاقە،
گەر "مەرعەش" و "وان"ە گەر عێراقە[3]

قەسرێکە یەساغی ئەو نیفاقە
گەر وا نەبێ بابی هەر بە تاقە[4]

سەد شێخ و مەلا و ئەمیر و خانی
بۆ لەززەتی عەیش و زیندەگانی

---

١. لە جیاتی «میسلی گەردن» لە گەلێ دەقەکانی تردا: «مەحوی کردن» یا «قەتلی کردن» نووسراوە.

٢. [بوومی خەرابەزار: بایەقوشی کەلاوە. مەشئووم: بێفەڕ، چارەڕەش.]

٣. مەرعەش و وان: دوو شارن لە کوردستانی تورکیا.

٤. یەساغ: بە تورکی یەعنی یاسا و قانوون. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «قەسرێکە بە ساخی ئەو تفاقە».

لەولاوە ئـــەوان بـــە حـــیلە ســـازی
لەملاوە ئـــەمان بـــە تـــەقلە بـــازی[١]

قـــورِیـــان بـــە هـــەموو ولاتـــەوە دا
تـــا مـــولْك و رِەعـــییە پـــاكـی فـــەوتا

یەكـیان ئـەمی تـۆ دەكـەی نـەیان كـرد
غەمیان نەبوو كورد ئەگەر هـەموو مـرد



## (٥)
## تاجی «بسم اللّه الرحمن الرحیم»

تـــاجی «بســم اللّــه الرحــمن الرحــیم»
نامە سەر بـۆ دەفـعی شـەیتانی رِەجـیم

مـــاجەرایـێـكـم هـەیە بـێ بـێش و كـەم
هیچ درۆی تـێدا نـییە بـا بـۆت بكـەم[٢]

بـــانیی نـــۆ تـاقی قـوبـبەی بـێستوون
كەعبەییێكی بـۆ مـە كـردە رِێ نـموون[٣]

قاسیدی پەیغامی فـەرمووی: «مَـنْ بَـنیٰ
مَسْـــجداً یُـــبْنیٰ لهُ بَـــیْتٌ كَـما»[٤]

---

١. لە دەقی «ر.ك» و «ع.س» و «گ.م»دا وەكوو ناو هەڵبەستەكە نووسراوە: «حیلەسازی» بەڵام تەنیا لە دەقی «ت.ر»دا نووسراوە: «بە حیلە بازی».
٢. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «بێش و» نووسراوە: «زیاد و».
٣. [موحەممەدی مەلاكەریم ئەڵێ لەبیرمان چوو «كەعبەییێكی» بكەین بە «كەعبەكی»، هۆی راستی ئەمەش جگە لە دەستنووسەكە، دیالێكتی ناوچەی كۆیەیە. ـهەنگاوێتر: ٢٧٢].
٤. [واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی: هەركەس مزگەوتێ بكاتەوە، خانوویەكی چەشنی ئـەوی لە بەهەشتدا بۆ دروست ئەكرێ].

باز فەرمووی: سەربەسەر ڕووی زەمین
مەسجیدە بۆ زیکری «ربّ العالمین»

یەعنی هەر ماڵێ کرابێ بۆ خودا
کەعبەیی عەلیایە بۆ زیکر و دوعا[1]

شکڵی تەکیە و خانەقاهی شێخەکان
واقیعەن ڕەنگینە ئەمما بۆ ڕیان

لەم هەموو شێخ و موریدانەی ڕیا
فەردەکی ناچێتە مزگەوتی خودا[2]

مەسجید و میحراب و مینبەر بێ کەسە
هەم مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەسە[3]

شەیخەنا گەر ئەم قسەت نایێتە گوێ
سەیری وا چۆڵە کەری تێدا بگێ[4]

ناکرێ بەم های و هوویە دەفعی ڕووس
هەروەکوو شێخی بوخارا و ئەندەلووس

میسلی ئێوە پاڵیان دا بە دوعا
ئاخری کافر بە ڕیشیاندا ڕیا

پشتیان دا هیممەت و شەیخووخەتی
تا فەرانسز پاکی کردە میللەتی[5]

---

١. [عەلیا: بەرز و مەزن].
٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «فەردەکی» نووسراوە: «تاکەکی».
٣. ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی لای مندا هەبوو. موحەممەدی مەلاکەریم.
٤. [شەیخەنا = «شیخنا»: شێخی ئێمە].
٥. لە دەقی «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە بەمجۆرە هاتووە: «تا فەرانسە پاکی کردە میللەتی».

مەرقەدی ئەقتاب و قوببەی ئەهلی ڕاز
بۆتە جێگەی گاگەل و مۆڵگەی بەراز

هیند و داغستان و قازان و قەزم
خێوە و هیند و بوخارا و خوارەزم

یەك بە یەك وەك ئێوە بوون و زێدەتر
سەر بە سەر بۆ باری کافر بوونە کەر[1]

موعجیزە و کەشف و کەرامات و دوعا
بۆچی نەیبوو فەخری عالەم مستەفا؟

جیسمی نوورین و ددانی گەوهەرین
ئەو شکا، ئەمیان بووە جێگای برین[2]

سەبحە و میسواك و خەرقە و تەیلەسان
بوونە پابەندی جیهادی غازییان[3]

ئەم هەموو شەهبازە بوونە کوندەبوو
خەڵوەکێشان و چلە سوودی چ بوو

---

۱. [ئەگەر هاوبێژی (تر) بکرێ بە فارسی (تەر) هەم لە لایەنی قافیەوە ڕێك دەبێ هەم لەگەڵ زمانی حاجیدا جۆرە].
۲. دیسان لە هەمان سەرچاوەدا نیوە دێڕی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «جیسمی نوورانی و ددانی گەوهەرین» ئێمە وشەی «نوورانی» یەکەمان لە سەر دەقی «م.ر.س» کرد بە «نوورین» چونکە کێشی سووکترە.
۳. [سەبحە: تەزبێح. خەرقە: جبەی کۆن و شڕ و شیتاڵی سۆفیان. تەیلەسان: عەبای پان و گەورە کە شێخ و قازییان لە سەر شانی ئەکەن. غازی: شەڕکەر].

سەیری ناکەی تائیفەی ئەو شێخەکان
وەك سەحابە و عادەتی پێشینیان[١]

ڕووت و پێخاوس بە زەرگێك و مەتاڵ
باوکی بۆ دوو پوول دەردێنێ لە چاڵ[٢]

قەسری دین، بنج و بناغەی مەحکەمی
شیر و تیرە، دیرەك و تاق و خەمی[٣]

موسبەتە فەرمووی حەبیبی کیبریا
من «نەبی»ی شیرم لە مەیدانی وەغا[٤]

گوڵشەنی پڕ میوەیی باغی مەعاد،
وا لە ژێری سایەیی تیغی جیهاد

کێ گوتی: میسواکە تیرم یا عەسا
نێزەمە گورزی گرانم مونتەشا[٥]

---

١. لە زۆربەی سەرچاوەکاندا لە جیاتی دوا وشەی دێڕی یەکەم چەند خاڵێ دانراوە.
[موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: ئێمە بە پێی دەستنووسی یەکەم لەباتی ئەو نوختە دانراوانە، «ئەو شێخەکان»مان دانا، بەڵام من دوو دڵم لام وایە وا نەبێ؛ چونکە «ئەو شێخەکان» تەعبیرێکی ڕاست نییە و مانای تەشبیهەکەی لەگەڵ «وەك سەحابە...»دا دەرناکەوێ. ـ هەنگاوێتر: ٢٧٥].
٢. [زەرگ: سیخ، نێزە. مەتاڵ: قەڵغان و سپەر. پوول: قۆشە، کەمترین ماڵ]. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێری یەکەم بەم جۆرە هاتووە «ڕووت و پێ‌خاوس بە هۆی زریە و مەتاڵ» و لە هەندێ دەقدا نیوە بەیتی دووەم بەمجۆرەیە: «باوك و باپیری دەرێناوە لە چاڵ».
٣. [دیرەك: تیرەک، کۆڵەکە. خەم: گومبەز].
٤. [موسەبەتە: سابت کراوە، ڕاستە]. مەیدانی وەغا: مەیدانی شەڕ، نەبەردی جەنگ.
٥. [مونتەشا: نێوی شارێکە کە مەکۆی سۆفیان بووە، گۆچانی مونتەشا: کە وا بەدەستی سۆفیانەوە بۆ لای ئەم شارە نیسبەت دراوە].

یـا کـەمەندم ڕوشتەیە، تیغم تەبەر
پۆست وکەشکۆڵ و دەفە و تاج وکەمەر[1]

کام حەدیس و ئایەتی موعجیز نوما
هاتووە بۆ ڕەغبەتی ڕەقس و سەما

ئەم ئیشاراتە بە جێگایە و بە ڕێ
نەك وەکوو چاو بەستە تەڕکی بن بەڕێ[2]

داری دنیا هەرکەسێکی تێی گەیی
میوەیی خامی هەیە و میوەی گەیی

پەندی من خامی دەزانن خامەکان
شیرن و پوختەی دەزانن پوختەکان

تاکی دونیا مایە پوختەی هەر هەیە
لەم کەر و خامەی کە هەن باکم نییە

با بڵێن: ئەم شێتە قەحپە مردووە
چەند وەڕیوە، چەند وڕێنەی کردووە!

---

١. [ڕوشتە: پەتێکە لە پەشم کە دەروێشان بەسەر یان ناوقەدیانەوە دەیبەستن. کەشکۆڵ: سندۆقچەیەکە لە داری نارگیل (گوێزی هیندی) دروست ئەکرێ کە جاران دەروێشان پەتێکیان پێوە دەبەست دەیانکردە ملیان و ئەو خۆراکەی کە سواڵیان ئەکرد، ئەیانکردە ناوی، ئەم کەشکۆڵەی نیشانەی زوهد و دنیا نەویستنە. تاج: تەقلەیەکی خێڕخێڕی جوچکەدارە].

٢. لە دەقی «ع.س»دا ئەم دێڕە شیعرە بەمجۆرە هاتووە:
ئەم ئیشاراتە بە جێگایە و بە ڕێ
نەك وەکوو چاو بەستە تورکی بن بەڕێ

حەق تەعالا واقیفی ئەحواڵمە
«خالصاً للّٰهِ»یە تەرقیمی ئەمە[١]

بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن
مەقسەدم لەم بەند و باوە دەربچن

وەر نیێ ئەم دونیایە نەفسییە
گەر لەبەر ئێوە نەبێ باکم چییە!

من لە تۆفانا بەڕی خۆم دەردەکەم
وا مەزانە دامەنی خۆم تەڕ دەکەم[٢]

ئێستە هەر چیم پێ بڵێن عەیبی نییە
چونکە ئینسان عیلمی غەیبی پێ نییە

ئاخری چی وەحشییەماڵی دەبێ
جاهلیش ئەو ڕۆژە دێ حاڵی دەبێ

ئەم قسە بالێرە بێ، ماندی بووم
بۆت بکەم باسێکی بۆیان کردووم

پێی گوتم ئەحبابەکی ساحێب حەشەم:
سەرگوزەشتێکم هەیە با بۆت بکەم[٣]

---

١. [واقیفی ئەحواڵمە: ئاگاداری حاڵ و وەزعمە. تەرقیم: نووسین]. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە دەقی «م.ر.س»دا بەمجۆرە هاتووە: «(خالصاً للّٰهِ)یە تەرقینم ئەمە»

٢. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بەجۆرەیە: «من لە تۆفانا ببم خۆم دەر دەکەم».

٣. لە دەقەکانی «ع.س» و «گ.م»دا ئەم دێڕە بەمجۆرە هاتووە:

«پێی گوتم: ئەحبابەکی خاوەند حەشەم»
سەرگوزەشتێکی هەیە با بۆت بکەم»

بەڵام ئێمە بە پێی دەقەکەی «م.م» ڕاستمان کردەوە. «بنوارە: مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب٢، بەغدا ١٩٧٤، ل:٣١٨».

بازی خەو ئیمشەو لەبەر بێهەمدەمی
بوو بە نەسری ئاسمانی حەوتەمی[١]

زاغەکەی شەو باوەشێنی شاپەڕی
شەمعەکەی کوژاندەوە، وەقتێ فڕی[٢]

بەیزەکی جێما لەگەڵ دەرکەوتنی
ئاسمان زەرد و سپی بوو دامەنی[٣]

ماهی بێمیهرم لە دەرگا هاتە ژوور
ماتەم و شین و غەمی کردم بە سوورا![٤]

کورت و کرمانجی کە گرتم بە ڕەزا
خستم و باقی وەکوو بەیتی "ڕەزا"[٥]

چونکە زانیم ئیش کە کەوتە گفتوگۆ
بێ سەر و پێیە وەکوو چەوگان و گۆ

ئاخری نایێ وەکوو ڕووبار و چۆم
یا شەڕە جوێنی لە نێو خەڕڕات و دۆم[٦]

چی پیاو بێ تێدەگا ڕۆمی چییە
باسی ڕمبازی و سواری بۆ نییە[٧]

---

١. [نەسر: سیسارگ، مەلێکی مردار خۆرە، لاش خۆر، کەرکەس،].

٢. [زاغ: قەلەڕەش، قاڵاو].

٣. [بەیزەکی = «بیضە»کی: هێلکەیەك].

٤. [سوور: جەژن و شادی].

٥. مەبەستی لە بەیتی ڕەزا شیعری شێخ ڕەزای تاڵەبانییە.

٦. لە دەقەکانی «ع.س» و «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بە ناتەواوی هاتووە. بەڵام لە دەقی «م.ر.س»دا لە جێگەی بۆشاییەکە «ڕووبار و چۆم» نووسراوە و ماناش بە جوانی دەدات.

٧. لە دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «باسی ڕمبازی و سوار بوونێ نییە».

ئیتتفاقی دولبەرێکی بێ کەدەر
حاجی ئەنواعی لیباسی کردەبەر

بێ جیاز و مارەیی دەیدا بە شوو
لەم هەموو کوردانە داخوازی نەبوو[١]

عاقیبەت دەیخوازن ئەمما ئەو دەمی
پیر بووە، نازێ کەل و کۆمە دەمی

ئەو زەمانی بوونە ئاردی نێو درِك
پارەیەك ناكا دوو سەد جار بێتە ڕك[٢]



## (٦)

### شێخ بزەینی[٣]

شێخ بزەینی قسەی وەکوو جافە
خۆ کەرامەت نییە ئەمیش لافە[٤]

---

١. لە دەقی (گ.م)دا لە جیاتی «دەیدا بە شوو» نووسراوە: «دەمدا بە شوو».

٢. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: مەلا جەمیل وتوویە: ڕك: پەتێکە چەندین حەڵقەی هاپێوە، کار و بەرخی ساوای پێ ئەپێچن، بەڵام من ئێستا ئەم بۆچوونەم لا هەڵەیە و ڕاستی مانا بەیتەکە ئاوەهایە: جاکە باوك و کچی بە شوودراو لە یەك جوێ بوونەوە و هەر یەك وەك ئاردی نێو درکیان لێ هات کە کۆکردنەوەیان بۆ کەس هەڵنەسوورێ، ئەو حەلە باوك سەد جاریش ڕقی هەستێ و لە کۆکردنەوەی خۆی و بە شوودانی کچەکەیدا پەشیمان بێ کەڵکی نییە. ـهەنگاوێ‌تر: ٢٧٩].
لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «بێ تەڕك». ئیدیۆمی «بوونە ئاردی ناو درِك، بوون بە ئاردی ناو درکان» حاجی لە ناو ئەم دێڕە شیعرەیدا بەکاری هێناوە. «نواڕە: جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٢، ل: ٩٣ مەبەستیشی لە یەكنەگرتن و بڵاوبوونەوەی میللەتە».

٣. شێخ بزەینی: عەشیرەتێکی ناوداری کوردە.

٤. لاف: دەعیە، هەوا، فیز.

ئەو وەکوو ئێمە نین بە ئیدراکن
ساحیبی نوسخەیی گەلێ چاکن

وەکوو بەهرام و خوسرەو و شیرین
لەیل و مەجنوون و چەندی وا ڕەنگین

هەموویان ڕەمز و کانی عیرفانن
فێری بن چونکە خزمی خۆمانن

مەم و زین و دیوانی شێخی جزیر
گەلێ چاکن بە سەهلی بێننە گیر[1]

ئەم دوانە ئەمێستە تەرجەمەیان
زۆرە حەتتا لە نێو فەرەنگستان

وای بخوێنن لە وەجهی موحتاجی
وا بزانن بە خۆیەتی «حاجی»

هەم ڕەواجی بدەن لە هەر لاوە
تێنەگەن مردووم، بڵێن: ماوە

قەت تەسەوور مەکەن تەرەفداری
غەیری غیرەتکەشی و غەمخواری

من کەسێکم زەمانەیی ناکەس
دایبڕیوم لە قەوم و قیلە و کەس

هەر منم ئێستا واریسی عیسا
بێ ژن و ماڵ و بێ کوڕ و مەئوا



١. شێخی جزیر: مەبەستی شێخ ئەحمەدی جزیریی ناودار بە «مەلای جزیری»یە.

## (٧)

## خۆ دەزانن سولالەیی ئەکراد

خـــۆ دەزانـــن ســـولالەیی ئـەکــراد
لێرەوە بگـــــرە تـــا دەگـــاتە قــوباد[١]

هــەموو عــالیم، هــەموو شـێخ و مـیرن
زیـــرەك و ژیــر و ئــەهلی تــەدبیرن[٢]

وەســـەتی پـــانی پـــازدە ڕۆژ ڕێیــە
پــــڕ لە ڕەشـــماڵ و خـــانە و دێیــە[٣]

بـــە درێژی لە "قـــاف"کــە ڕابـــوردن
تا بـە "شـیراز" و "ئـەسفەهان" کــوردن

شـــەهسەوارن، پـــیادەیان ئـــازان
بــەردی نــیشان و کــۆلکی مـەیدان[٤]

---

١. [سولالە: ڕەچەڵەك و بنەچە. قوباد: کەی قوباد، هەوەڵین پاشای کەیانی].

٢. ئەم دێڕە لە دەقی «م.ر.س» و «گ.م»دا بەم جۆرەیە:

هەموو زانا و هونەروەر و میرن
زیرەك و ژیر و ئەهلی تەگبیرن

[موحەممەدی مەلاکەریم لە بارەی ئەم بەیتەوە ئەڵێ: من لام وایە ئەم نیوە بەیتە لە ئەسڵدا بەم جۆرە بووبێ: «هەموو عالەم هەموو شەهـ و میرن» لەبەر دوو بەڵگە: یەکەم ئەوەیە کە حاجی قادر زۆر دانووی لەگەڵ شێخاندا نەکوڵاوە تا بە شانازییەوە بیانکات بە بڕبڕەی گەلی کورد، دووهەمیش ئەوەیەکە ئەگەر «شێخ»یش «ێ»کەی قووت نەدرێ نیوە بەیتەکە تۆزێ لەنگ ئەکا. ـهەنگاوێ‌تر: ٢٨١.].

٣. وەسەتی پانی: تێکڕای پانی، موعەددەلی پانی.

٤. [کۆلك: سووکە دارێکە لە یاری جریت‌دا یاری پێ ئەکرێ. موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: مانای ئەم نیوە بەیتەم بۆ ساغ نەبووەتەوە، بەڵام کاك فایز مەلا بەکر گوتوویە: «کۆڵکی مەیدان» لەبەر پێی سواران پێ‌شێل ئەکرێ و ئەهاڕدرێ. لەوانەیە لە جێی خۆیا «کۆڵەکـەی مـەیدان» بووبێ. ـهەنگاوێ‌تر: ٢٨٣].

دان و بــــــەخشینیان لەلا بــــاوە
خــوونی مــەیدانــیان لەکــن ئــاوە[1]

بە شەجاعەت هــەموو وەکــوو ڕۆســتەم
بــە ســەخاوەت هــەموو وەکــوو حــاتەم

لە وەفــــا ســــموەئیل و ئــیسماعیل
عــەهد و پــەیمانیان چــیای قــەندیل[2]

گـــوردی شــانامە پــاکــیان کــوردە
کــافی ئــەم ســافە کــافی ئــەو وردە[3]

لە شــــەڕا زۆر دەفــــعە قــــەوماوە
ڕۆمـــــییانیان چـــلۆن جــواب داوە

«حــــاجی» دەمــرێ لە داخ و هــاوارە
کـــوردی بــێچــارە دەبــنە ئــاوارە



## (٨)
## حاکم و میرانی کوردستان

حــــاکـــم و مــیرانــی کــوردستان
هـــەر لە بـــۆتــانەوە هــەتا بــابان

---

١. ئەم بەیتە لە یەکێ لە دەستنووسەکانی لای مندا هەبوو، موحەممەد مەلاکەریم.
٢. [سموەئیل: پێغەمبەرێکی عیبرییە کە لە دادپەروەری و ئاکار چاکیدا بەناوبانگە].
٣. [واتە: وشەی «گورد» کە لە شانامەدا بە مانا پاڵەوانی هاتووە ئەوە کوردە بە نەختێ جیاوازی لە کافەکاندا].

یەك بە یەك حافیزی شەریعەت بوون
سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون[١]

سەیید و شێخەکان لە ترسی ئەوان
مونزەوی بوون و زاکیری ڕەحمان[٢]

هەر کە فەوتان ڕیای ئەوان دەرکەوت
سەیری چۆن بوونە پووش و ئاگر و نەوت

یەکێ لەملاوە ڕوو دەکاتە عەجەم
دوو لەولاوە دەبنە دوژمنی هەم

دوو هەزار ژن فەساد کرا لەملا
بوونە قاتیل ئەوانی تر لەولا[٣]

یەك بە یەك بوونە نائیبی هەمەوەند
ساحیبی مارتین و ماری گەزەند[٤]

---

١. [نیوە بەیتی دووهەم ئاماژەیە بەو حەدیسە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: «سَیدُ القومِ خادِمُهم». هەروەها بە لەقەبێك کە لە ناو عەرەبدا باوە «شیخ الملة»].

٢. مونزەوی: گۆشەگیر.

٣. ئەم دوو بەیتە لەگەڵ وردە جیاوازییەك لە هەردوو دەستنووسەکەی لای مندا هەن. لە یەکێ لەو دەستنووسانەدا چەند پەراوێزێکیان لەسەر نووسراوە، نووسراوە ئەوەی «ڕوو دەکاتە عەجەم» شێخ عوبەیدیللای نەهرەوانییە و ئەو شوێنەی «ژنانی لێ فەساد کراوە» ئێرانە و ئەوانەی «بوون بە دوژمنی یەك» تاڵەبانی و بەرزنجەیین و ئەوانەی «بوون بە پیاوکوژ» لە شارەزوورن. موحەممەدی مەلا کەریم.

٤. هەمەوەند: عەشیرەتێکی ئازای کوردە. مارتین: جۆرە تفەنگێکی کۆنە، جاران لە کوردستان زۆر بەکار دەهێنرا. ماری گەزەند: ماری گازگر و زیانبەخش، مەبەست لە ماری ئەو شێخانەیە کە ئیجازەی مارگرتن دەدەن.

میللەتیش هێند کەرن وەکوو جاران
دەستیان ماچ دەکەن دەڵێن: قوربان!

گەر لە سەحرا مەلا نەمردایە
گورگە شین با کەری بخواردایە

شێری دڕندە وەك لە بێشە نەما
گورگ و ماملڕێوی دێنە ڕەقس و سەما[1]

من لە غەمخواری ئەم قسانە دەکەم
وەرنە پەشمە لەلام هەموو عالەم

ئەم قسە ئێستە عەیبی لێ دەگرن
ئەو دەمەش دێ کە ئێوە بۆی دەمرن

ئەم بە ئەو ئەو بە ئەم دەڵێ: کاکە
سەیری قانوونی «حاجی» چەند چاکە!

هەر چلۆنێ ئیشارەتی فەرموو
وەك کەرامەت هەمووی هەروا دەرچوو



## (٩)

## خوسرەو و کەیقوباد

"خوسرەو"و "کەیقوباد"و "ئەسکەندەر"
وەکوو "کیسرا" و "کاوس" و "قەیسەر"

---

١. حاجی بیری ئەم دێڕە شیعرەی لە ناوەرۆکی پەندێکی پێشینان وەرگرتووە کە دەڵێ: لە جێی شێران سەگان (ڕێوی) دەکەن گێران. بنواڕە: خاڵ، پەندی پێشینان. بەغدا ١٩٧١، ل: ٣٩٠.

هەموو تێکچوون و پاکی فەوتاوە
نە سیلاح و نە سککەیان ماوە[١]

واقیعەن وایە وەك بەیانم کرد
هەر کەسێ زا، بە ناعیلاجی مرد

مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە
ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە

چونکە هەرچی لە داری دونیایە
دێت و دەڕوا، هەمووی وەکوو بایە

سەد شەهەنشاه و پادشا مردن
سەیری کە کوردی ئێمە هەر کوردن

میللەتە باقی، مابەقا فانی
هەر لە جافی هەتا بە گۆرانی[٢]

حەسرەتم هەر ئەمە لە دنیادا
حاجی دەمرێ بە دەوریان ناگا

گەر بە دەورانیان بگەییایە
هەموو حاڵی دەبوون چ دەریایە

چ بە مەنسوور و گەوهەری کوردی
چ بە نەزم و کیتابەتی وردی

---

١. سککە: پارەی مەعدەن.
٢. جاف: خێڵێکی گەورەی کۆچەری کوردە. گۆران: بە کوردی نیشتەجێ و کشتوکاڵدار وتراوە. مەبەستی حاجی لە تێکڕای کوردی کۆچەری و نیشتەجێیە.

"سەعدی" ئەییامی خۆی نەبوو نانی
وەکوو من بوو گەڕۆك و بێخانی[1]

ئێستە خەڵقی لە حەسرەتی دەمرن
بەیتەکانی لە زێڕ و زیو دەگرن

ئاخیری ڕۆژەکیش دەیێ وەعدی
خەفەتم بۆ بخۆن وەکوو "سەعدی"

قازیی نەسر و موفتیی نازیم
تێدەگەن تا مودەڕڕیس و عالیم

بۆ تەسیحەی زوبانی کوردانە
شیعرەکانم دەلیل و بورهانە

یەعنی تا ماوە شاعیری غەڕڕا
عالیم و عامی داخی بۆ ناخوا

لاکین ئەو ساعەتەی بە ڕەحمەت چوو
قوڕ دەپێون دەڵێن: چ حیکمەت بوو!

پەشمە «حاجی» وەرە وەکوو جاران
بێرەوە سەر حیکایەتی کوردان



۱. سەعدی: مەبەستی لە [شێخ موسلیحەددین] «سەعدی شیرازی»یەکە ئەدیبێکی ئیسلامی ئاییپەروەری ئێرانی بووە، لە ساڵی ۱۲۹۱ی زایینی کۆچی دوایی کردووە و لە ناو خەڵکەکەدا ناوی بە شێخ سەعدی دەرکردووە.

## (١٠)

## شەهسواری بەلاغەتی کوردان

شـــەهسواری بـــەلاغەتی کـــوردان
یـــەککـــەتازی فـــەساحەتی "بـــابان"[١]

مســـــتەفایە تـــەخەللوسی "کـــوردی"
غـــەزەلی کـــردە بـــەربوتی کـــوردی[٢]

نـــاوی "ســاحێبقران"ی خـاسی ئـەوە
چونکە لەم عەرسە ئەسپی ئـەو بـەدەوە

ئـــەو کـــە نـــۆشی شـەرابـەکـی تـاڵی
"نـــالی" لەو عـــەرسەدا بـــووە تـــاڵی[٣]

"نـــالی" ئـــوستادەکـی گـەلێ چـا بـوو
خـــزری ئـابی حـەیاتی مـەعنا بـوو[٤]

یەکێتـر بـوو "مـوحەممەدی فـیکری"
مووی دەئەنگاوت بە تـیرەکـی فـیکری

یەکێ "ڕەنـجووری" ئـەهلی کـەرکووکە
فیکری بـیکری هـەموو وەکـوو بـووکە

---

١. شەهسوار: وشەیەکی لێکدراوی فارسییە بە مانای شاسوار دێ، حاجی لە سەدەی نۆزدەهەمدا زمانی ئەدەبی فارسی ئامێز بووە. هەندێ نووسەر وەکوو زمانی ئەدەبی ئەمڕۆ دەیکەن بە «شاسوار». [یەککە تاز: سوار چاك].
٢. بەربوت: ئامێرێکی مۆسیقای وەکوو عوودە.
٣. تال: بە پێی هەندێ سەرچاوەی زمانی عەرەبی بە ئەسپی چوارەمی مەیدانی غارغارێن دەڵێن. بڕوانە: المنجد في اللغة بیروت ١٩٦٦، ص٦٤.
٤. مەبەستی لە خزر هەم ناوی «نالی»ی شاعیری مەزنی کوردە و هەم حەزرەتی خزری ناودار بە «خدری زیندە»یە چونکە ئاوی ژیانی خواردۆتەوە هەر بە زیندووەتی ماوەتەوە.

یەکێتریان "ئەمین بەگی" دزەیی
دز نییە شاعیرێکە جەربەزەیی[١]

"کەیفی" حاجەت نییە بکەم باسی
ئەم کتێبەی بخوونی دەیناسی

"سالیم"و"مەشوی"،"شێخ ڕەزا"و"خەستە"
شاعیران هەر چواری بەرجەستە

وەك "وەفایی" کەمە لە شوعرایی
خەتی وەك بەیتی چاك و ئەسپایی[٢]

لە کون و قوژبنی کەلاوەی دەهر
چەندێتر هەن میسالی گەنجی گوهەر[٣]

سەبکی "جامی"ن و غیرەتی "سەلمان"
بەیتیان ون بووە وەکوو خۆیان

"مەلکەقۆڕ"و "حیماری"و "کیسەشکەل"
«قِسْ مِن أَسْمائِهِمْ و لا تَسْأَلْ»[٤]

---

١. جەربەزە: بزێو، ئازا و جەسوور. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: «دزەیی» و «جەربەزەیی» هەڵەن و «دزەیە» و «جربەزەیە» ڕاستن. ـهەنگاوێتر: ٢٩١].

٢. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: ئێستا وای بۆ دەچم ئەم بەیتە ئاوەهابێ:
«وەك وەفایی کەمە لە شاعیرا بێ
خەتی، وەك بەیتی، چاك و ئوستا بێ»].

٣. [پێویستە بۆ ئەوەی قافیەی «دەهر» لەگەڵ «گوهەر»دا ڕێك بێتەوە، وشەی «دەهر» بە «دەهەر» بخوێنرێتە].

٤. «مەلکەقۆڕ» و «حیماری» و «کیسەشکەل» نازناوی سێ شاعیری دۆست و هاوچەرخی حاجی قادر بوون، ئەمانە و چەند کەسێکی هاوتایان پێکەوە فەقێ بوون لە مزگەوتەکەی «شێخ

☞

شـــیعریان جـوانـه بـەس نـییه کـوردن
گـــەرچـــی بـــەد نـــاون و گـــەلێ وردن

بە فیدایان دەکـەم سـەد "ئـیبنو یـەمین"
چـونکه دەربـەستی غـیرەتی کـوردین[1]

لە جـزیرە یـەکـێکـە "شـێخ ئـەحمەد"
ســـاحیبی نـــاو و مـورشیدی ئـەرشەد

ئـــەوی "جـــامی" گـوتوویەتی ئـەمەیە
لەو قســـە و مـەدحە مـەقسەدی ئـەمەیە

«پـــــیرمردی بـــدیدەام ز جـــــزیر
نـــیك مـــردی بـدیدەام ز حـــریر»

"ئەحمەدی خانی" ساحیبی مەم و زین
شـــاهبازی فـــەزایـــی عـــیللیین[2]

خـــەلەفی ئـــەو دەبـن لە "گـۆدیـنگان"
لە جـزیر پـێی دەڵێن: "فـەقێ تـەیران"[3]

---

☞

وەتمان» لە باڵەکەتی، بۆ پتر ساغکردنەوەی بڕوانە: «مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب٢ بەغدا ١٩٧٤، ل: ٥٣ تا ٥٥». نیوە دێڕی دووەم بە ڕێنووسی کۆنی عەرەبی نووسرابوو خستمانە سەر ڕێنووسی نوێی عەرەبی. [واتە: بە ناوەکانیانا هەڵیان سەنگێنن و ئیتر لە بارەیانەوە پرسیار مەکەن، یانێ خۆتان تێدەگەن چەندە شۆخ و گاڵتەچی بوون].

١. [ئیبنو یەمین: شاعیرێکی ئێرانییە (٧٦٩ـ٨٥٠ هـ ق)].

٢. [عیللیین: جێگەیەکی بەرزە لە بەهەشتدا، «إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ». موتەففیفین: ١٨].

٣. ئەم دەقەی سەرەوەمان لە دەستنووسەکەی «م.ر.س» وەرگرت و وەك بینیمان دەقەکانی «ع.س» و «گ.م»دا بەمجۆرە بوو: «خەلەفی ئەو دەبن کوو زنکان!».

شـــاعیری ئـێره گـــەرچـی زۆر مـاون
ئەم دوو سێیەن کـە وا لە پـێش چـاون[١]

چەند ئەوەندەی کە عەرزی ئێوەم کـرد
شـــوعەرامـــان هـــەیە بـــە دەســـتوبرد

شـــــاعیر کـــۆن و تـــازەیی کـــوردان
کـــــە لە تـــەعدادی عـــاجیزە ئـێنسان

ئەوی خۆم دیـومە یـانە خـۆ ئـەسەری
ئـــەمەیە بـۆت دەڵێم بـە مـوختەسەری

مـــەعدەنی عـــیلم و عـــالیمی عـــامیل
قـــوتبی دەوران و مـــورشیدی کـــامیل

هـــەر لە ئـــەووەڵ جـــەنابی "مـــەولانا"
نـــــەقشبەندی ڕەواقـــــی ئـــــیللەڵڵا[٢]

---

١. ئەم شەش بەیتە، لە بەیتی «لە جزیرە یەکێکە شێخ ئەحمەد»ەوە، لە یەکێ لە دەستنووسەکانی لای مندا پارچەیەکی سەربەخۆن لە پاش پارچە شیعری «خوسرەو و کەیقوباد و ئەسکەندەر»ەوە. من لام وایە ئەوە ڕاست نییە و شوێنی ئەم بەیتانە لەم پارچەدایە جا لێرەدا یا لە شـوێنێکـی موناسیبی تردا. نیوەی یەکەمی بەیتی پێنجەمیشیان بەمجۆرەیە: «خلقی ناو دی گودنگان» کە ئەبێ بە «خەڵقی ناو دێی گۆدینگان»و دیارە لەنگە. ئەوەی لەم تێکستەدا بایەخی هەبێ ناوی «گۆدینگان»ەکەیە کە لەوانەیە ببێ بە هۆی ڕاستکردنەوەی ناوی ئـەو شـوێنە. ئـەگـەر ئـەو تێکستەش ڕاست بێ کە ئەڵێ «خەڵەفی ئەو دەبن»...تاد، ئەوە دیارە وائـەگـەیەنێ کـە فـەقێ تەیران کوڕی یا لە نەوەی ئەحمەدی خانییە و ئەوەش پێچەوانەی هەموو ئەو شتانەیە تا ئێستا لە بارەی مێژووی ژیانی فەقێ تەیرانەوە نووسراون. موحەممەدی مەلا کەریم.

٢. مەبەستی لە مەولانا خالیدی شارەزووری میکاییلی نەقشبەندییە.

غــەوسی ســانی و حــاتەمی مــەزهەب
"عەبدوڕڕەحمان"ی خالسی مەشرەب[١]

وەکوو "بەیتووشی" شــاعیری عــەرەبی
تا قیامەت نە کــەس بــووە و نــە دەبــی[٢]

شــاعیری جــاف و نــەزمی ئــەترافــی
"مەولەوی" و "خــانە" کــافییە و شــافی

ئــەوی ســەر خــێڵی عــێلی ئــەوزانــە
لە عـــــەشایر "مـــــەلا وەڵەدخـــان"ە[٣]

خـــۆ "مــەلا مســـتەفای بــێســـاران"
بـــێ نــەزیرە لە نــەزمی کــوردستان

"مــەلکە"مــان مــەلکەمووتی مــەعنایە
یــەعنی هــەر چــۆنــێ حــەز بکــا وایــە[٤]

وەك "مــەلا خــدری ڕوودبــاری" نــییە
شــیعری ئــابی حــەیاتە تــاریی نــییە

حیکمەت و نەزمی "مــیرزا یــەعقووب"
وەك فــلاتوونە لەفــزەکــان وەك کــووب

---

١. غەوسی سانی: مەبەستی لە عەبدوڕڕەحمانی باوکی شێخ‌ڕەزای تاڵەبانییە.
٢. بەیتووشی: مەلا عەبدوڵڵای بەیتووشی: شاعیرێکــی هــەرە گــەورەی کــورد بــووە، بــەڵام شیعرەکانی بە زمانی عەرەبی دادەنان.
٣. ئەم دوو بەیتە لە یەکێ لە دەستنووسەکانی لای مندا هەبوون، موحەممەدی مەلاکەریم.
٤. [واتە: مەلکە ـکە نازناوی شاعیرێکە ـ بە مانای فریشتەیە لەنــاو فــریشتەکــاندا بــە مــانای مەلکەمووت (ملك‌الموت) واتە: عیزرائیل دێت کە هەرچی بکات بە دەس خۆیە].

یــەعنی فــیکری لە ئــاسمان بـە دەرە
بــاعیسی عــەیشە، دافــیعی کــەدەرە

"حــەسەن"ی بــاوکی "فـەقێ ئـۆمـەر"
کوڕی "ئۆمەر"، "موحەممەد"ی سەروەر

مــەنجەڵی نــەزمی گــەورە و گــچکەن
بۆ خــەیاڵاتــی عــەینی سێ کــوچکەن[1]

شــاعیری "زەنگــەنە" نــییە حــەددی
وەکــوو شــوجعانی نــاکــرێ عــەددی

چونکە مەجمووعی تـەبعی مـەوزوونە
ســـینەیان مــیسلی ئــاینە ڕوونــە[2]

ئــینتخاب نــاکــرێ لەبــەر چــاکــی
وەك لە شـــەڕدا ســـوار و چــالاکــی

دوو وەحیدن "موحەممەد" و "ئەحمەد"
یــەکێ کــۆمـاسییە یـەکـێ دەربـەند[3]

"هـەمەوەند"یش کـە خـزمی خـۆمـانن
شـــاعیری زۆرە پــاکـــی دەیـــزانـــن

چــونکە تــیژی زوبــانیان یــەکسەر
کـــەوتە نـــووکی ڕم و دەمـی خـەنجەر

---

١. لە دەقی «گ.م» لە جیاتی «مەنجەڵ» وشەی «مەشخەڵ» هاتووە. [سێ کوچکە: سێبەردە، کوانوو].
٢. لە دەقی «گ.م»دا نیوە بەیتی یەکەم بەمجۆرە هاتووە: «چونکە تەبعی هەمووی مەوزوونە» و لە جیاتی «سینەیان»، «سینگیان» هاتووە.
٣. مەبەستی لە جەماغای دەربەندفەقەرە و ئەحمەد بەگی کۆماسییە.

بـــێ کـــتێبـــن، ئــەمە لەوان دووره
مـــەردی ئـــازا لە نـــاقیسان دووره

دەشـتی کـەرکووك و کـێوی هـەورامـان
شـــاعیری زۆره بـــێ حـــەدد و پـــایان

ســـاده هــەر نــاویان بکــەم ئــیملا
ئــەم کــتێبــە بــچووکە بــەش نـاکـا

هـــەر لە "شـــیراز"ەوه هـــەتا "بـــابان"
پاکی یـەك نـەزمە پـێی دەڵێن "گـۆران"

هـەر "مـوسڵ" هـەتا حـەددی "بـابان"
بـــەیتیان کـــردووه وەکـــوو جـــافان[1]

بـەسیە بـێعـاری ئـەی گـەلی خـزمان
لەم هـــەموو بـــەیتی مـیللەتی خـۆمـان

ئەگەر ئێمە و "سـنە" و "سـولەیمانی"ن
نـــاوی یـــەکیان بـە چـاکـی نـازانین

وەك "موحەممەد حەنیفە" بەیتی مـەتین
نـــییە ئـــیللا حـــەساری "قـوستەنتین"

"بـــەیتی دمـــدم" کـــە قـەدری نـازانـن
پـــاکـــی سـیحری حـەڵاڵی کـوردانـن

وەکـــوو شـــانامە گـــەر بـنووسرایـــە
لێت مـــوعەییەن دەبـــوو چ وەســـتایە

---

۱. لە دەقەکـانی «ع.س» و «گ.م»دا وەکـوو نـاو ئـەم قـەسیدەیە نـووسراوه، بـەڵام لە دەقـی «م.ر.س»دا لە جیاتی «بەیتیان کردووه» نووسراوه: «بەینیان کردووه».

ئەسپی ڕەش بەیتی تا بڵێی چاکە
نەزمی یەگجار سوار و چالاکە

ئەسپی شەش پێی قەهرەمانی عەجەم
مەحزی کیزبە بە ئیتتفاقی ئومەم

چونکە نووسراوە خەڵکی دەیخوونن
لەم هەموو بەیتی ئێمەدا کۆرن

وەرە ئەمجا لە حەسرەتان مەمرە
چوار پەلی ئەسپی سوننییان مەگرە[1]

وەکوو بەیتی حەتەم لە دەعوادا
نییە، "فردەوسی" سەد کلك بادا

ئەم فەسیحانە پاکی بێناون
باعیسی پێت بڵێم: نەنووسراون

دوو "عەلی"ن شاعیرن وەکوو حەسسان
"بەردەشان" و "حەریر"ە مەسکەنیان[2]

یەکێ هەمنامی خۆم بە خۆم دیبووم
شێخ وەسانی بوو مەردەکی مەعلووم[3]

---

١. لە دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا لە جیاتی «مەگرە»، «مەبڕە» هاتووە.
٢. [حەسسان: شاعیرێکی ئیسلامیەکە بە شاعیری پێغەمبەر بەناوبانگ بووە].
٣. حاجی لەم دێڕە شیعرەدا، لە حاجی قادرێکی شاعیری شێخ وەسانی دەدوێ کە هاوناوی خۆی بووە، بەم وشەی هاوناوەش سەرەڕای ناوهێنانێ شاعیری شێخ وەسانی، ناوی خۆیشی بەبێ دەربڕین خستۆتە پاڵ لیستەی شاعیرانی کوردەوە. بڕوانە: «مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب١ بەغدا ١٩٧٤، ل:٦٦».

وەکــوو مــن بــوو بــە زاهــیری جــاهیل
بـــاتینەن شـــاعیرێکـــی زۆر کـــامیل

"ئەحمەدی کـۆر" لە شـاری سـابڵاغـە
بـەیتەکـــی داغــە، بــەیتەکــی بــاغە

ئــەمە مــەجمووعی شــاعیری غــەڕڕان
هەروەکوو مـەسنەوین لە نـێو کـوردان[1]

هــەموویان بــێ‌نــەزیر و یــەك وەزنــن
قـــابیلی بـــەزم و لایـــقی ڕەزمـــن

غەیری "دمدم" لەمان بە نـەزمە جـودا
بــێ‌ســـەدا تــەپڵی نـەزمی دەنگ نـادا

بـــە ڕەوانـــی مـــیسالی ئـــابی ڕەوان
ئـــیرتیجالین هـــەموو بـــە بـــێ‌دامـان[2]

کـــوللی بـــەیتێکـــی دوو هـــەزار فـەردن
مـــانگەکـــی پـــێ دەوێ لەبـــەرکردن

ئــەمە هــەر کــوردە لایــقی تــەحسین
بــێ کــتێب و مــوعەللیم و نــووسین

کـــامە مـــنداڵ و شــێتـی لێ بگــری
هەر کە بـیستی بـە جـارێ دێتـە بـەری

---

١. مەسنەوی: مەبەستی لەو کتێبەیە کە «مولانا جەلالەددینی ڕۆمی» بـە شـیعر و بـە زمـانی فارسی دایناوە.

٢. بە ڕەوان، ڕەوان: «فصیح»، بـە ڕەوانـی: بـە فـەسیحی. ئـاوی ڕەوان: مـەبەستی لە ئـاوی حەیاتە، کە دەڵێن هەر کەسێکی چنگی بکەوێ و بیخواتەوە هەگیز نامرێ، یا ئاوی جاری.

[ئیرتیجالی: لە پڕ وێژراو و بەبێ بیرلێکردنەوە].

ئێسته مەعلوومی بوو هەموو میللەت
ئەی مەلای دەرس و موفتیی ئوممەت

ئێمە بێغیرەتین و بێعارین
ئەوی نەیخوێندووە لەمە عارین

قەید و تەزبیب و شەرح و حاشیەکان
بوونە سەددی مەعاریفی کوردان[1]

حاسڵی ئێمە وەك دەکەم تەخمین
کرمی ئاوریشمین و مێش هەنگوین

نییە ئارام و ڕاحەتی و خەوتن
شەو و ڕۆژێ هەتا دروستی دەکەن

کەچی ڕۆمی کە ئێمە دەیناسین
وادەزانێ کە ئێمە نەسناسین[2]

یانە ئێرانییەك کە مەعلوومە
دایکی موتعە، باوکی مەوهوومە

ئەمە دەیکاتە کاسە دەینۆشی
ئەو کەوای لێ دەکات و دەیپۆشی



١. [تەزبیب = «تضبیب»: مەبەست ئەو نیشانە و نیگارانەیە کە فەقێ و مەلای کۆن پێوەندی وشە و جێناو و... پێدەستنیشان دەکرد. چەشنی نقیساری ئێستە].

٢. نەسناس: جۆرە مەیموونێکە.

## (١١)

## سلام اللهِ منّي

«ســـلام اللّـــهِ مـــنّي کُـلَّ يَــوْمٍ»
له ئەسحابانی ساحێب غیرەت و دیـن[١]

له بــێ‌عــاری هــەموویان کـەوتە یـادم
رومـــووزی ئــیتتیفاق و ئــیتتیحادم[٢]

له بـەر دووری له ئـەقران و له ئـەمسال
له کوردانم دەپرسی «ضـرب الأمـثال»[٣]

له بۆ ئەم یەك دوو ئەشعاری ڕەش و ڕووت
هەتا پەیدا بوو ڕۆحم گەییە سـەر لووت

دەفەرمووی ئەم عەزابە بـۆچ دەکـێشـی
چ مەزلوومە ئـەگـەر چـاوت نـەیێشـی

قوڕی کوێ کەم بەسەر خۆما له غوربەت
خەوم نایێ له داخـی مـوڵك و مـیللەت

ئەگەر وەك من خەبەردار بن له دەوڵەت
له حەیفان خۆ دەخنکێنن بە بـێ پـەت[٤]

---

١. ئەم نیوە دێڕە عەرەبییە، له دەقی «ر.ك» و «ت.ر» و «ع.س»مان وەرگرتووە دەنا له دەقی «گ.م»دا بەمجۆرە هاتووە: «سلام اللّه عەلەیکوم کلّ یوم!».

٢. له دەستنووسەکەی «م.ر.س»دا نووسراوە: «بە ڕەمزی ئیتتیفاقی و ئیتتیحادم».

٣. [ئەقران و ئەمسال هاوەڵ و هاوتەمەنەکان].

٤. له هەندێ دەقدا له جیاتی «بن»، «بی» و له جیاتی «دەخنکێنن»، «دەخنکێنێ» نووسراوە.

چــوار مــلیۆنــه کــوردستان نـفووسی
بە قیسسەی ئەهلی تەخمینی کە نووسی[١]

هەموویان شێری بێشەن حاتەمی جوود
لە شەڕداکێوی "جوودیوبەحری مەمدوود"[٢]

وەلێکین فائیدەی چی هەرج و مەرجــن
لە دەعوادا لەگـەڵ یـەکـتر بـەمەرجــن[٣]

"لە گوێی گا نوستوون" هەر چەندە شێرن
وەکوو کەروێشکی چاو ڕاماو و کوێرن[٤]

ئــەوی ئـەعلایە سـەردەستەی شکـارە
ئـەوی ئـەدنایە بـەستەی زوڵفـی یـارە[٥]

ئــەوی ئــازایــە شـەهنامە دەخــوێنــێ
ئەوی میسکینە گـەنم و جــۆ دەچــێنــێ

---

١. لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا نووسراوە: «دوازدە ملیۆن». ئێمە دەقی «ر.ك» و «ت.ر»مان لا ڕاست بوو کە نووسیویە «چوار ملیۆنە»، چونکە دەقی کۆنترن و لەگەڵ کێشی شیعرەکـەش باشتر دەگونجێ و لە سەردەمی حاجیشدا کورد هەر چوار ملیۆنـێك بـووە و ئـێستا زیـادی کردووە. موحەممەدی مەلاکەریم.

٢. جوود: سەخاوەت بەخشندەیی. [بەحری مەمدوود: بەحری هەرە گەورە]. لە دەقی «ت.ر»دا نووسراوە: «بەحری مەخدود» و لە دەقی «م.ر.س»یشدا نووسراوە: «بەحری مەحموود».

٣. هەرج و مەرج: فیتنە و هەرا و هۆریا. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: «یەکدی» لە «یەکتر» نزیکترە بە زاراوەی کۆیەوە، ئەمەش سەرەڕای نوسخە خەتییەکان. ـهەنگاوێتر: ٣٠٦].

٤. لە دەقــی «ر.ك» و «ت.ر»دا نــووسراوە: «چـاو ئـازا و کـوێرن». [لە گـوێی گـادا نـوستن: ئیدیۆمیکی کوردییە بە مانای بێخەبەربوونە].

٥. [ئەعلا: بەرز. ئەدنا: نزم و خوار].

ئـــەمانە بـــێشـــعوور و گـــێژ و وێژن
موتیعی لۆتی خـوێڕی و هـەرزە بـێژن[١]

کوڕێکی وا نـەبوو هـەستێتـە سـەر پـێ
بزانێ خەڵقی چۆن کەوتوونە سـەر ڕێ[٢]

بکا سەیری جـەریدە و حـاڵی مـیللەت
کـــتێبـــی تـــازە و تـەئریخی دەوڵەت[٣]

بـــزانـــێ تـــا چ قـــەوماوە لە ئـەتراف
سـەراپـا ئـاگـرە ئـەتراف و ئـەکـناف[٤]

ئەگەر کارێك نـەکـەن لەم بـەینەدا زوو
مەمالیك کاتەکی زانیت لە دەستچوو[٥]

---

١. لە دەقی «ت.ر» و «ر.ك»دا بەمجۆرەیە: «لۆتی خۆر». ئێمە بە «لۆتی خوێڕی»مان خوێندەوە. [کاك عەبدوڕڕەزاق بیمار، وشەی «لۆتی خوێڕی» بە هەڵە ئـەزانـێ و «لۆتـەخۆر» بـە ڕاست ئەزانێ و لەسەر ئەمەش زۆر داکۆکی ئەکات کە «لۆتەخۆر» بە مانا (پیس خۆر و پاشماوە خۆر) دێ و لە کەرکوکدا کرداری «لەوتاندن» بە مانا پیس کردن بەکار دەبەن. موحەممەدی مـەلا کەریمش ئەڵێ من ئەم بۆچوونەم بەلاوە ڕاست نەبوو تا لە دەمی هاوڕێیەکی کەرکووکیم بیست و ئێستا پێموایە «لۆتەخۆر» دروستە.ـ هەنگاوێتر: ٣١٧. بەڵام سەیر ئەوەیە موحەممەدی مەلا کەریم چۆن ئەم وشەیەی لە دیوانی نالیدا نەبینیوە کە مامۆستا لەوێ بە (بخۆری پاروی زل) مانای لێداوەتە:

وا خوانی کەناری من بۆ نوقڵی دەم و ماچە
ئەی «لۆتەخۆر»ی تەکیە، ساتۆ لە کەنارت چی

هەروەها مامۆستا هەژاریش بە پاروو زل خۆری مانا لێداوەتەوە].

٢. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «وانەبوو»، «وانیە» هاتووە و نیوە دێڕی دووەم لە دەقی «ت.ر»دا بەمجۆرە هاتووە: «بزانێ چۆن هەموو کەس کەوتە سەرڕێ».

٣. [جەریدە: ڕۆژنامە].

٤. ئەکناف: کۆکراوەی «کنف»ی عەرەبییە بە مانای تەنیشت و ڕۆخ دێ.

٥. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «مەمالیك»، «وڵاتت» هاتووە.

گەمی سەحرا و دەریا دێتە جەولان
بە غەیری پێکوڕەی فەوجی سواران[١]

بە تڕخانی بەسەرناچێ، لەمەو پاش
لە هەرلاوە دەتان هاڕن وەکوو ئاش[٢]

لە ژێر پێدا دەچن حەیف و مخابن
گەدا بن ئێوە، دوشمنتان بە شا بن

بە غەیری ڕۆمی و ئینگلیز و ڕووسی
بێ حەددن دەوڵەتان ناویان بنووسی[٣]

لە جێی خۆیان هەڵستاون بە غیرەت
لە دنیا ناوی خۆیان ناوە دەوڵەت

سەراپا ساحێبی سککە و سوپاهن
وەکوو جەم ساحێبی تەخت و کولاهن[٤]

١. گەمی سەحرا حوشترە و گەمی دەریاش پاپۆڕە. پێکوڕە: بەو کوللە ساوایە دەڵێن کە هێشتا باڵی لێ نەڕوابێ و بە هەزاران هەزار پەلاماری شینایی دەدەن و تەڕ و ئیشك پێکەوە دەخۆن. [فەوج: پۆل، دەستە]. نیوە دێڕی دووەم تەنیا لە دەقی «ر.ك»دا ڕاست نووسراوە، دەنا لە دەقەکانی «ع.س» و «م.ر.س» و «گ.م»دا بەمجۆرەیە: «بە غیری پێکەوەی فەوجی سواران».

٢. [تڕخانی] ئەم وشەیەمان لە سەر تێکستی «ڕۆژی کورد» و «تێگەیشتنی ڕاستی» ڕاست کردەوە، ئەگینا لە هەموو چاپ و دەستنووسەکاندا «بەدرخانی»یە کە مەعنا نابەخشێ. موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. لە دەقی «گ.م» و «ع.س»دا ئەم دێڕە شیعرە بەمجۆرەیە:

بە غەیری ڕۆمی و ئینگلیز و ڕووسی
بێ حەددە دەوڵەتان ناویان بنووسی

٤. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «ساحێبی» نووسراوە: «خاوەنی». [جەم: کورتکراوەی جەمشیدە کە پاشایەکی کۆنی ئێرانییە].

لە تەدبیری ئومووری موڵکی خۆیان
شەریکن پینەدۆز و شاه و گاوان

لە هەر وەقتێ یەکێکی بێتە هاوار
لە جووتیار و شوان و ئەهلی بازاڕ[١]

لە جۆشین و لە نێشا مێشی هەنگن
بە من چی کافرن یانە فەڕەنگن[٢]

وەکوو بیستوومە بۆ دەفعی مەسائیب
ئەمە تەدبیری کورت و فیکری سائیب[٣]

لە دەشت و دێ و ویلایەت بینە ئەحباب
وەکوو شەخسێکی واحید بن لە هەر باب

لە "بۆتان" تا "بەبان" و سەرحەدی "ڕەی"
لە ئەولاتر وەها نۆش بێتە سەر دەی

ببینە یەك لە تەعلیم و لە نووسین
جل و بەرگ و زوبان و ڕەسم و ئایین[٤]



١. ئەم شیعرە لە دەقی «ت.ر»دا نەبێ لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا نەهاتووە.
٢. نیوە بەیتی یەکەممان لە سەر دەقی «ڕۆژی کورد» ڕاست کردەوە. موحەممەدی مەلا کەریم.
٣. [مەسائیب:کۆی موسیبەت، بەڵا وکۆست. سائیب: ڕاست و دروست و شیاو]. لە دەقەکانی «م.ر.س» و «گ.م» و «ع.س»دا لە جیاتی «سائیب» «ساحیب» هاتووە، ئێمە «سائیب»مان لا پەسەندتر بوو.
٤. لە دەقی «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە بەمجۆرە هاتووە: «هەموویان ببنە یەك تەعلیم و نووسین».

## (١٢)

## شاعیر و شێخ و خواجە دەربەدەرن

شاعیر و شـێخ و خـواجـە دەربـەدەرن
لە قســـەی بـــێ‌نــەتیجەدا دەمـــرن

بـــاسی زوڵفـی درێژ و چـاوی بـەخەو
نـــەبڕوا بـــووە تـــڕی خـــوسرەو

قـــەید و تـەزبیب و حـاشیە و ئـیعراب
هەموو با بردی بوونە مەوجی سـەراب[1]

"سەفەر ئەندەر وەتەن"چ کەڵك دەگرێ؟!
سەیری نـاکـەی شـەمەندەفەر دەفـڕێ[2]

بـە قسـەی سـادە بـرسی تـێر نـابێ
عــەمەلە عــیززی دیــن و دونــیا بـێ

"ئـــاسنی ســـارد بە فـوو نـەرم نـابێ"
"بـــە تـــڕانــیش حـەمام گـەرم نـابێ"[3]

تـــــەلغرافـــیش تـەلێکـە بـێ‌مـایە
مـــوخبیری ڕوویـــی کـــوللی دونــیایە

---

١. [قەید و تەزبیب و حاشیە و ئیعراب: چوار زاراوەی زانستە ئایینییەکانن].

٢. ئەندەر: لە ناو سەفەر ئەندەر وەتەن: زاراوەیەکی سۆفییانەیە بە واتای گەشتی ناو دەروون دێ.

٣. «ئاسنی سارد بە فوو نەرم نابێ» و «حـەمام بـە تـڕان گـەرم نـابێ» دوو پـەندی پـێشینانی کوردین حاجی کردوونی بە دێڕە شیعرێك. بڕوانە: «شێخ موحەممەدی خاڵ، پەندی پێشینان ج٢ بەغدا ١٩٧١، ل:١٤، ١٨٣».

جەوهەری فـەردی ئـەو مـوجەززا بـوو
یــا نــەبوو حــاسڵی چ پـەیدا بـوو؟[١]

گــــفتگۆ حـــاسیلی هــەمووی بــایە
عــــەمەلییاتە نــــانی تــــێدایـــە[٢]

عــولەمامان بــە قــەولی بــێسەروپا
پاکـی خـنکا لە بـەحری وشکـی هـەوا

سنعەتێك فێر نەبوون لە پاش تـەحسیل
سەیری چۆن بۆ مەناهی بـوونە دەلیـل[٣]

یــەك بـە یـەك بـوونە خـائینی دەوڵەت
خــائینی مــوڵك و دوشـمنی مـیللەت

تــا تــەعیناتی «کــوڕ» و «لاڵ» مـابوو
لە گــەڵێ دێیــەکـان مـەلای چـا بـوو[٤]

---

١. [جەوهەری فەرد: بە بچووکترین بەشی هەر جیسمێك ئەڵێن کـە لەوە زیـاتر دابـەشبوون هەڵناگرێ، زاراوەیەکی فەلسەفەی کۆنـە. مـوجەززا: دابـەشکراو. حـاجی مـەبەستی ئـەوەیە ڕۆیشتن لەسەر ئەم بیر و باوەڕە کۆنانە هیچ کەڵکێکی بۆ ئێستای ئێمە نییە]. ئەم بەیتە لە یەکێ لە دەستنووسەکانی لای مندا هەبوو. موحەممەدی مەلاکەریم.

٢. مەبەستی لە عەمەلییات کار و کردەوەیە و دەڵێ گفتوگۆ و قسە وەکوو با دێن و دەڕۆن، تەنها کردەوەیە دەمێنێ و نافەوتێ. ئەم دێڕە شیعرە و دێڕە شیعرەکەی پێشـووتری (تـەلغرافـیش تەلێکە...) تەنها لە دەقی «م.ر.س»دا هاتوون و وا بۆ یەکەمجار بڵاویان دەکەینەوە.

٣. مەناهی: مەبەستی لە مەناهی شەریعەت و ئایینە، واتە: ئەو کار و شتانەی کە دین نایەوێ مرۆڤ بیانکەن.

٤. ئـەم دەقـە لە سـەرچـاوەکـاندا لەگـەڵ دەقـەکـەی «م.م» جـیاوازیـیان زۆرە. بـەڵام دەق و لێکدانەوەکەی «م.م»مان زۆر لا گونجاوتر بوو لە دەقـەکـانیتر بـۆیـە پشـتمان پـێ بـەست و

ئەو دووانە بە ڕەحمەتی خوا چوون
شارەکان بێ مەلا و مودەڕڕیس بوون

بەڵێ وایە لە ئەلزەمی ئەشیا
ئەووەڵەن خواردنە، دووەم سوکنا[1]

سێیەم سەتری عەورەتە ئەنجا،
مەشغەلەی «لا الٰـهَ الّا اللّٰه»

پشتیوانی بینایی شەرعی مەتین
شیر و بەخشین و خامەیی ڕەنگین[2]

بەو شەشە دین موحافەزە دەکرێ
یەکێ مرد لەم شەشانە دین دەمرێ

عەجەبا! بۆچی ئەهلی موڵکی عیراق
ئیتتفاقی بەدەل دەکەن بە نیفاق[3]

بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر
نەك لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر[4]

---



تۆمارمان کرد. بنواڕە: مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب٢ بەغدا ١٩٧٤، ل:٩٤.
(لە دەستنووسێکی لای منداکە هەندێ جیاوازیی لەم تێکستەی ئێرە هەیە، نووسراوە مەبەس لە «کوێر» میری ڕەواندز و لە «لاڵ» سلێمان پاشای بابانە. موحەممەدی مەلاکەریم).

١. [ئەلزەمی ئەشیا: گرنگترین شت، پێداویستییە سەرەتاییەکان].

٢. [موحەممەدی مەلاکەریم ئەڵێ: ئەبێ بە گوێرەی ئەم بەیتە لەم شوێنەدا بەیتێك فەوتابێ، چونکە لە بەیتی پاشەوەدا ئەڵێ: «بەو شەشە دین موحافەزە دەکرێ» و سیانیشی وتووە، کەواتە ئەو سیانەکەی تر کوان؟ ـ هەنگاوێ تر: ٣١٩].

٣. بەدەل دەکەن: دەگۆڕنەوە، واتا: ئیتتفاق و ڕێکەوتن دەگۆڕنەوە بە نیفاق و ناتەبایی.

٤. گزیر: کاربەدەستێکی بچووکی میریی، فەرمانبەری گوندێك.

ئـێـسـتەکـەش فـرسـەتـە گـەلی یـاران
"کـەپەنەك بـۆچـییە لە پـاش بـاران"[١]



## (١٣)

## کوردەکی کۆیی

کـوردەکـی کـۆیـی ـکـەوتەوە یـادم ـ
پـێم گـوت: ئـایا چـلۆنـە ئـوستادم[٢]

وەکوو بیستی بە میسلی هـەوری بـەهار
هـاتە گـریان و پـێی گـوتم: ئـەی یـار

عـالیمی چـاکـمان هـەموو فـەوتان
ئـەهلی فـەتوا مـوسافیری مـەوتان[٣]

تـاکـی قـورئان بـخووندرێ بـە سـەدا
«رضـي اللّـهُ عَـنهم أبـداً»

ئـەوی مـاون لە لێوی کـەندالْن
جـاهیل و بـێ وقـووف و مـندالْن[٤]

---

١. [کەپەنەك: فەرەنجی، پەستەك]. «کەپەنەك بۆچییە لە پاش باران» یـا خـود «لە پـاش بـاران کەپەنەك» پەندێکی کوردییە حاجی کردوویەتی بە شیعر.

٢. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «کوردێکی کۆیی» بەڵام لە دەستنووسی «م.ر.س» و دەقـی «م.م»دا «کوردەکی کۆیی» هاتووە، لەبارەی کێشەوە دەقی دوایی سووکترە.

٣. [موسافیری مەوتان: کۆچەری مەرگ].

٤. [بێوقووف: ناشارەزا، نائاگا]. لێوی کەندالْن: مـەبەستی لە کـەندالْی گـۆڕ و مـردنە، واتـا: لەسەر ڕۆخی گۆڕن.

نییه «ابن‌الاثیر»ێ بێته کەمان
بەردی «ابن‌الحجر» بکاته نیشان[1]

پاك بە ئەنواری عالمین موحتاج
بێ دەلیلە ئەمێستەکێ مینهاج[2]

کەس نەماوە بە غەیری "کاك ئەحمەد"
شەیخی "مەعرووف"و عالیمی ئەرشەد[3]

چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کوردان
تەرجەمەی شەرع و ئایەتی قورئان

واقیعەن خزمەتی لە بۆ خوایە
چ دەبوو گەر بە کوردی نەبوایە

هەر کە وای گوت: وەها موکەددەر بووم!
وامدەزانی کە وا لە دین دەرچووم[4]

---

١. [«ابن‌الاثیر»: نازناوی سێ بران لە ناودارانی سەدەی شەشەم و حەوتەم، کە ئەم سێ برایە لە «جزیر» لەدایك بوون. ئەمانە بریتین لە «مەجدەددین موبارەك»، «عیزەددین عەلی» و «زیائەددین نەسروڵلا» باوکیشان «ئەسیرەددین عەبدولکەریم شەیبانی»یە. بڕوانە: «الموسوعة العالمیة العربیة» لەسەر ناوی «ابن‌الأثیر»]. «ابن‌الحجر، ابن‌حجر» دوو زانای ئیسلام بەم ناوە هەن، عەسقەلانی و هەیتەمی. مەبەستی حاجی لە هەیتەمییە کە زانایەکی شەریعەتە و لە کوردستانا زۆر ناسراوە. [مەبەستی حاجی ئەوەیە: تازە یەکێ وەك «ابن‌الأثیر» نەماوە کە بێت بە کەوان و تیری خۆی بەردی ڕەق و سەختی «توحفە»ی ئیبنوحەجەر بکاتە نیشان و بیکۆڵێ و شەرح و ڕاڤەی بکات].

٢. [ئەنوار و منهاج: نێوی دوو کتێبن لە عیلمی فیقهدا لە مەزهەبی ئیمامی شافعیدا. موحتاج: ئەکرێ مەبەست لێی موغنی موحتاج شەرحی مینهاج بێت].

٣. کاك ئەحمەد: مەبەستی لە کاك ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە.

٤. وەها موکەددەر بووم: ئەوەندە تێك چووم، پەست و تووڕە بووم.

گوتم: ئێستاش لە سەر کەری ماوی؟
چابوو مستم نەدا لە نێو چاوی

کوردی ئاخر بڵێ چییە عەیبی؟
هەر کەلامی حەقە نییە عەیبی

لەفزی کوردی بڵاو نەبوو گرد بوو
وا لە مابەینی ئێمەدا تێچوو

لە فەساحەت بڵا موعەڕڕا بێ
چ قیامەت! بە ئەرمەنیش نابێ[1]

بە زوبانی کەچ و خەتی خواری
بە جەریدە و کتێبی خەڵواری[2]

چوونە ڕیزی موعەززەماتی میلەل
وەقتە خۆیان حیساب بکەن بە دووەل[3]

یا لەگەڵ فارسی چ فەرقی هەیە؟
بۆچی ئەو ڕاستە، بۆچی ئەم کەچەیە؟[4]

با وجوودی ئەگەر بکەی دیققەت
تێدەگەی کام لە کامییە سیرقەت

---

١. [موعەڕڕا: ڕووت و بێتوێکڵ].
٢. لە دەقی «گ.م»دا «بە جەریدە و کتێب و خەلواری» نووسراوە.
٣. [موعەززەماتی میلەل: نەتەوە گەورەکان].
٤. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: بە پێی لێکدانەوەی کاك فایز مەلابەکر، وەها دروستە کە نیوەبەیتی دووهەم ئاوا بنووسرێ: «بۆچی ئەو ڕاستە، بۆچی ئەم گەمەیە». ـهەنگاوێتر: ٣٢٤.]

چــونکە ئــێمــە قــەدیمترین لە ئــەوان
بــە تــەواریــخی جــوملەیی ئــەدیان[١]

ئــاخر ئــەم عــەقڵەیــان هــەبوو بــۆیــێ
گــــەر ســـولەیمانییە وەیـــا کـــۆیـــێ

بـــوونە ئـــوستادی فـــارسی و تـــازی
تـا گـەیشتن بـە "فـەخرەکـەی ڕازی"[٢]

چـونکە سـەرمایە مـاڵی خـەڵقی بـوو
وەقتێ مردن هەموو بـە هـیچ دەرچـوو[٣]

ئـــەمە مـــەعلوومی عـــاقڵە و مـــنداڵ
نـــییە عـــەیبی مـــوناقەشەی ئـــەمساڵ

وەك مـــریشکێ کـــە عـــەقڵی نـــەیهێنـێ
بـــێت و هـــێلکـەی مـراوی هـەڵبـێنـێ[٤]

---

١. جوملەیی ئەدیان: تێکڕا ئایینەکان. کۆمەڵی ئایینەکان. هەموو دینەکان.

٢. تازی: فارسەکان بە زمانی عەرەبی دەڵێن «تازی». وشـەی «تـازی»یش لە قـەبیلەی تـەی «طائی» وەرگیراوە و بە «طائی» دەڵێن تازی. ڕازی: مەبەستی لە زانای ئـیسلام لە پـزشکی و ئایینداە ئیمام ئەبووبەکری کوڕی موحەممەدی ناودار بە ڕازییە، چونکە خەڵکی «رەی» بووە لە نێوانی ساڵانی (٨٦٥ ـ ٩٢٥ز)دا ژیاوە. پێی دەگوترا پزشکی ئیسلام و دەستێکی باڵاشی بووە لە کیمیاگەری و فەلسەفەی ئیسلامدا. بنوارە: «الموسوعة العربیة المیسرة، القاهرە ١٩٧٢ ط٢، ص٨٥٢».

٣. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە دەقی «م.ر.س»دا بەمجۆرە هاتووە: «وەختێ مـردن هـەمووی بـە هیچ دەرچووا!».

٤. لە دەقی «ع.س»دا ئەم نیوە دێڕە شیعرە بەمجۆرەیە: «وەك مریشکێ کە عەقڵی نەهێنێ». بەڵام ئێمە پشتمان بە دەقەکانی «گ.م» و «م.م» بەست.

وەك بگـــاتە کـــەناری جـــۆگـــەلەیەك
نایەتە شوێنـــی، بـــمرێ، جـــۆجـــەڵەیـــەك

جێی ئـــەمە وشکـــە، جـــێی ئـــەوی ئـــاوە
تـــێدەگـــا "قـــینگدڕانـــی پـــێ مـــاوە"



## (١٤)

## لە جوملەی ماجەرای

لە جوملەی ماجەرای دووری ویلایەت
ئەمەش باسێکە خۆشـە وەك حـیکایەت

شەوێ دانیشتبووم بێ شەمع و مـیسباح
ئەتۆی هێنـاوە یـادم "کـاکـە فـەتتاح"[١]

گـــوتی: بـــا کـــاغەزێکـی بـۆ بـنێریـن
مـــوحببی سـادیقە و هـەمڕازی دێریـن

منیش ئەم نامەیەم نووسی بـە تـەعجیل
شڕ و وڕ وەك خـەرار و کـۆنـە زەنـبیل[٢]

بە بێ تـەسوید و تـەسحیح و مـوبالات
وەکوو "بەیتی بلە" هەرچۆنێ بۆم هات[٣]

---

١. لە دەقی «م.ر.س»دا «شەوێ دانشتبووین» هاتووە.

٢. [تەعجیل: پەلە. خەرار: جواڵەی لە موو دروستکراو]. لە هەندێ دەقدا ئـەم نـیوە شـیعرە بەمجۆرە هاتووە: «شڕ و دڕ وەك خەرار و کۆنە زەمبیل» بەڵام ئێمە لە سـەر دەقـی «م.ر.س» وەکوو ناو قەسیدەکە ڕاستمان کردەوە. [موحەممەدی مەلا کەریم بە پێی دیـالێکتی کـۆیـە «کەونە»ی بەلاوە لە «کۆنە» پێ ڕاستترە].

٣. [تەسوید: ڕەشنووسین، پێش نووس. موبالات: سەرنجدان. بەیتی بلە: وەکوو مـوحەممەدی ☜

بەڵام ئەفکاری خۆمە نەزمی کوردی
لە خومخانەی خەیاڵی ساف و وردی[1]

عیباراتی «دەری» و «تازی»م نەهێنا
دەزانیێ ماڵی خۆمە، مەردی دانا[2]

لەبەر پیری ئەمەندە بێحەواسم
دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی ئیناسم[3]

سەر و ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکە
بە شەو هەمرازمە پشمین و کۆکە

غەریبی غوربەتی کردم بە ئەوتان
سەراپا ئەرزی لێ کردوومە زیندان

---



مەلاکەریمیش گوتوویە، لە قسەی نەستەقی کوردان کینایەیە لە قسەی بێسەر و بەر]. لە دەقی «ع.س»دا ئەم نیوە دێڕە بەمجۆرە هاتووە: «وەکوو نووسیومە هەرچۆنێ بۆم هات».

١. [خومخانە: مەیخانە، کینایەیە لە عالەمی عەشق و ئەوین].

٢. دەری: بەو زمانە فارسی پەتییە دەڵێن کە دوای پەهلەوی بوو بە زمانی دەرباری شایەکان و زمانی ئەدەبیات. تازی: وەك لەمەوبەر ڕوونمان کردەوە مەبەست لە زمانی عەرەبییە.

٣. [ئیناس: خەڵك. واتە: چەندە دینی خەڵکی کز بووە لەشی منیش ئەوەندە لاواز و بێهێز بووە]. لە دەقەکانی «ع.س» و «گ.م» و «م.ر.س»دا ئەم دێڕە شیعرە بەمجۆرەی خوارەوە هاتووە:

«لەبەر پیری ئەوەندە بێحەواسم
دەڵێی ئەرکانی ئیسلامی نەناسم»

بەڵام ئێمە لە سەر دەقی «م.م» تۆمارمان کرد و خستمانە ناو قەسیدەکە. بڕوانە: «مەسعوود موحەممەد، *حاجی قادری کۆیی ب ١، بەغدا ١٩٧٣، ل:١٠٦*».

وەلێکـــین تـۆ کـەریم ئـیبنولکەریمی
بـە ڕەحـمەت بـابی ئـەشعاری یـەتیمی[1]

ئـــەتۆ مـاوی لە نـوققادی ویـلایەت
ئـەوانـی تر هـەموو بـوونە حـیکایەت

ئـەگـەر "نـالی" بـوو لێرە نـاڵی ئـاوێت
دڵی "کوردی" بووە گـەردێ لە بـەرپێت[2]

مـنیش کـاتێ دەزانـی پـێم هـەڵەنگـووت
ئەجەل بای سەرسەرە ئێمەش پەرپووت[3]

کـە نـامە گـەییە ئـێرە مـۆرمـان کـرد
مـن و "فـەتتاحی" دانـا زەرفـمان کـرد

"جەلی"مـان نـووسی ئـەرقامی وسـوولی
بـە ئـوممێدی قـوبوولی بـێفزوولی[4]

ڕەفــێقـــانم لە کـۆیـە ئـاشنا نـین
وقـووفی حـاڵی ئـێمـەی بێنـەوا نـین[5]

---

١. [کەریم ئیبنولکەریم: چاکی کوڕی چاک، بریتیە لە بەر و پشت ئەتڵەس‌بوون، وەرگیراوە لە حەدیسی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: «یوسف بن یعقوب بن اسحاق بن ابراهیم، کریم ابن‌الکریم ابن‌الکریم». یەتیم: بێ‌باوك یان بێ‌وێنە وکوو «درّ یتیم»].

٢. لە دەقی «گ.م»دا بەم‌جۆرە هاتووە: «ئەگەر «نالی» بوو لێرە ناڵی ئاویژت» لە دەقی «م.ر.س»دا «...ئەو دەناڵێت».

٣. [سەرسەر: بای سەخت و توند کە هەموو شتێ لە بن بێنێ].

٤. [جەلی: ڕووناك و زەق، ئاماژەیشە بە هاوڕێی دێرینی حاجی، (مەلا عەبدوڵڵای جەلی‌زادە) کە پاشان ناوی لێ‌ئەبرێت. ئەرقامی وسووڵ: مەبەست (٢٤٦٨) کە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە (بدوح) کە گوایە ناوی فریشتەی گەیاندنی نامەیە. ـهەنگاوێ‌تر :٣٢٧].

٥. بێ‌نەوا: هەژار و دەربەدەر.

سـەلامێکـە دیـاریمان، دیـاره
لە دار و بـەردی ئـەو دار و دیـاره[1]

خـوسووسەن ئـاستانەی ئـەرجـومەندی
جـەلی‌زادێکـە «عـبداللّـە» ئـەفەندی[2]

چ "عەبدوڵڵا" "عوبەیدوڵڵاهـی ئـەحرار"
مـوسەغغەر بـەندەیێکـە زەڕ خـڕیـدار[3]

[بە نـیسبەت تـۆ عـوبەیدیللاهی نـەهرێ]
[وەکوو بزنی گەڕە، مەهجووری دەیـرێ][4]

زەکـاوەت کـانییێکـە تـۆی دەراوی
خـەتی ئـیقراری نـووسیوە زەهـاوی[5]

---

١. دیار: وڵات.
٢. ئاستانە: دەرگە، دەرگانەی شا. ئەرجومەند: پیاوی بە قەدر و قیمەت، پیاوی زانا.
٣. [عـەبدوڵڵاهـی ئـەحرار: یـەکێکـە لە شێخـە هـەرەمەزنەکـانی ڕێبـازی نـەقشەبەندی (ف٨٩٦هق). واتە: عوبەیدیللا، سووکەڵە ناوی عەبدوڵڵایە، لە چـاوی مـەعەبدوڵڵا وەکـوو کۆیلە وایە]. لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا «بەندەیێکی» هاتووە.
٤. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ ئەم بەیتە لە دەسنووسێك لای مندا هەبوو، لەبیرم چووبوو بیخەمە نێو بڕبڕەی دیوانەکەوە. لە پەراوێزدا نووسیویە: شایانی وتنە حاجی قـادر لە پـارچـە شیعرێکی تریشا پلارێکی تری گرتووەتە «شێخ عوبەیدیللای نەهری» کە لە دژی عوسمانییەکان ڕاپەڕیوە و لەگەڵ ئێرانییەکان هاوکاری کردووە، بە بۆچوونی من ئەمە بە هۆی تەعەسسوبی ئیسلامەتی و سوننییەتی حاجی قادر بووە کـە لەم مـەسەلەیەدا هـەرگیز نـەیویستووە پشـتی عوسمانییەکان بدا لە زەوی. ـهەنگاوێ‌تر: ٣٣٤].
٥. [لەوانەیە ئەم شیعرە ئاماژە بێ بەوە کە مامۆستا عەبدوڵڵاه لە خزمەت مـوفتی زەهـاویدا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبێ].

مــــەلاییکــــــی "فــەقێیــــانە" ویـــقارت
بــــــەیانت "ئـــاوە گـــردە" ئـــیقتیدارت[١]

علوومت «کـافیە» و «شـافی» بـە واجـیب
لەکۆی تۆ دەبتە حاجیب" ئیبنوحاجیب"[٢]

لە داغـــی تـــۆ دەســـووتی "نـەفتەوەیهی"
وەکوو"بێ"زەرد بووە ڕووی"سیبەوەیهی"[٣]

لە مــەیدانــی فـەساحەت تـۆ مـوجەللی
"حەریری"تـالییە و"سەعدی"مـوسەللی[٤]

١. فەقێیان: بە دوو مەنا دێ، یان کۆکراوەی فەقێیە و دەڵێ: ویقارت وەکوو مەلایەکی فەقێیانە لە هێمنی و ئارامیدا، لە لایەکی تریش مەبەستی لە فەقێیان: گوندێکە لە سەرووی شاری کۆیە بە چیای باواجییەوە. مەبەستی لەم نیوە دێڕەی دووەمەش ئـەمەیە بـڵێ: ئـەی حـاجی مـەلا عەبدوڵڵا، بەیان و ڕەوانبێژی تۆ وەکوو ئاو لووس‌ولێکە و توانای زانستیشت وەکوو گردێکی گەورە وایە. لە لایەکی تریشەوە مەبەستی ناوهێنانی چیای «ئاوەگردی» سەرووی شاری کۆیەیە.
٢. مەبەستی لە «کافیە» و «شافیە» دوو کتێبە بە نرخەکەی «ئیبنوحاجیب»ە کـە یـەکـەمیان لە زانستی «نحو»ە دووەمیشیان لە «صـرف»دا. ئـیبنوحاجیب نـاوی تـەواوی عـوسمانی کـوڕی عومەری کوردییە و ناوداره بە ئیبنوحاجیب (١١٧٥-١٢٤٩ز). بـڕوانـە: «المـوسوعة العـربیة المیسرة. القـاهرة ١٩٧٢ ط٢». [حـاجیب: دەرگـاوانـی شـا، واتـە: ئـیبوحاجیب بـەو هـەموو زانستەوە لە چاو زانستی تۆدا وەك دەرگاوانە و تۆ شای].
٣. نـەفتەوەیهی: «نـفطویە» (٨٥٩ - ٩٣٧ز) زانـایەکـی نـاوداری نـەحوی عـەرەبی بـووە. سیبەوەیهی: «سیبویە» لە (٧٧٠ز)دا مردووە و گەورەترین زانا بووە لە نەحوی عـەرەبیدا، بـە سەرۆکی قوتابخانەی «بەسری»یەکان دادەنرێ لە نەحودا. [حاجی بە وشـەی "سـووتاندن" لەگەڵ «نەفت» و "بێ" و "زەرد" لەگەڵ «سیب»دا تەناسوبێکی جوانی ڕێك خستووە].
٤. موجەللی: «المجلّی» بەو ئەسپە دەگوترێ کە یەکەم بێ لە مـەیدانـی غـارغارێـندا. تـالی: «التالی» لە هەندێ سەرچاوە بە ئەسپی چوارەم و لە هەندێکیشا بە ئەسپی دووەم دەگوترێ. موسەللی «المصلّی» ئەو ئەسپەیە کە دووەم دەربچێ لە غاردان‌دا.

بــە غــەیری جــەددی ئـێوە کـێهـە دانـا
لە کــوردستان ئــەساسی عــیلمی دانـا[١]

وەرە بــا بــێیــنە ســەر بــاسی نــیهانی
بــە یــادی عــەیش و ئــەییامی جــەوانــی

بە فـیکرت دێ زەمـانێ چـووینە «بـاڵەك»
بە پێ خاوسی نە کـەوشم بـوو نـە کـاڵەك[٢]

لە بــەر پــێم دڕك و دار و شـاخ و بـاری
وەکوو مەخمەر بوو نەرمی یـا نـە قـاڵی[٣]

کە چووینە "سینگوڕە" سینەم گڕی بـەست
وەکوو "قەندیل"ی سەرگەردان، وەکوو مەست

---

١. لە دەقی «م.م»دا نیوە دێڕی دووەم بەمجۆرە هاتووە: «لە کوردستان بناغەی عـیلمی دانـا» بەڵام لە دەقەکانی «م.ر.س» و «گ.م» و «ع.م.ن»دا لە جیاتی «بناغەی»، «ئەساسی» هاتووە و ئێمەش لە ناو ئەم قەسیدەمان تۆمـار کـرد، چـونکە بـاشتر لەگـەڵ زمـانی ئـەدەبی سـەدەی ڕابوردوودا ڕێك دەکەوێ.

٢. [کاڵەك: کڵاش، گیوە]. لە دەقی «گ.م»، «وە بیرت دێ» هاتووە و لە دەقی «م.م»، «بەبیرت دێ» نووسراوە، کەچی لە دەقەکانی «ع.س» و «م.ر.س»، «بە فیکرت دێ» هـاتووە ئـێمـەش پشتمان بەم دەقانەوە بەست.

٣. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «قاڵی» وشەی «خاڵی» نووسراوە. ئەم «قاڵی»یە بۆ هاوسەنگی، بە شێوەی کۆیە «قاری» دەخوێنرێتەوە. [لەم بەیتەدا حاجی بە بۆنەی بیرهێنانەوەی سەردەمی لاویەتی، بە تەواوی بە شێوەزاری ناوچەی کۆیە هۆنیوەتەوە، واتە: زۆربەی لامە قەڵەوەکـان دەکەن بە ڕێی سووك، وەك دڕك و داڵ = دڕك و دار، شاخ و یاڵ = شاخ و یار، مەخمەڵ = مەخمەر، قاڵی = قاری. بەپێی لێکدانەوەی حەمەی مامۆستا و کـاك فـایزی مـەلابەکـر، لەم بەیتەدا وشەکانی «باری» و «قاڵی» هەڵەن و «یاری» و «قاری» ڕاستن. بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە: ـهەنگاوێتر: ٣٣٣ و ٣٣٤].

دەڵێن ئێستا هەواری گورگ و شێران
وەکوو قەلبی حەسوودی تۆیە وێران

چکاوە ئاوی پڕژ و گۆلە شینی
نەماوە هەر لە کۆتر تا شەهینی

گەرووی شێخی لە لوقمەی کۆچ و باران
موعەڕڕایە میسالی ڕۆزەداران[1]

ئەمە دنیایە نامێنێ هەتا سەر
لە بۆ ئازا و دانا، حیز و ماکەر

مەڵێ ئەم قیسسەیە بێ ڕێ و جێیە
لە ترسی تۆ نەبێ هێشتا لە کوێیە

لە دەردی دووری و جەوری زەمانە
گەلێ نەزدیکە زۆر دووری مەزانە

لە خۆم ئاگر هەڵێنم وەك «چنارۆك»
لە چاوم گریە دەربێ وەك «حەمامۆك»[2]

بە سەد قەید و حەواشی دەردی دووری
بەیانی ناکرێ غەیرەز سەبووری[3]

---

١. ڕۆزەداران: بە ڕۆژوو بووەکان، ڕۆژیدارەکان. [موعەڕڕا: ڕووتکراو].
٢. چنارۆك: هاوینەهەوارێکە ٧ کیلومەتر لە ڕۆژهەڵاتی شاری کۆیەوە دوورە. جاران بنەماڵەی جەلیزادە هاوینان دەچوونە سەرباغ و ڕەزی خۆیان لەوێ و مەدرەسەی خوێندنی فەقێیانیشیان دەبرد بۆ ئەوێ. حەمامۆك: کانیاوێکە کەوتووەتە سەرووی شاری کۆیەوە بە بن چیای باواجییەوە.
٣. لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا لە جیاتی «قەید» وشەی «کەڕڕە» هاتووە.

لەمەو پێش شەممەیەك عەرزی ئەتۆم کرد
بڵاوە فیکر و عەقڵم، وەسوەسەی کرد

کەوابوو چاکە جامەی خۆم قەبا کەم
بەری دەست هەڵبڕم ڕووی خۆم لە خوا کەم

بڵێم ئەی ڕازیقی مێشوولە و فیل
بە حەققی "جوبرەئیل" و هەم "سرافیل"

هەڵیکەی بەیرەقی کوردی لە دەوران
لە مابەینی «کەکۆن» و «هەیبەسوڵتان»[1]

لە شەرق و غەربەوە تا قیتعەیی کۆ
لەبەر گۆچانی ئەمرت بێ وەکوو گۆ

دەزانی زەحمەتە تەعدادی یاران
بە سەد هاوین و زستان و بەهاران

دیارە دۆستدارانی ئەمن کێن
لە "خۆشناو" و لە "ئاکۆ" و دەشتی "بیتوێن"

لە ئێمە هەرکەسێ پرسێ تەمامی
وەکیلی موتلەقی سەرفی سەلامی

وەکوو من تۆش بنووسە بێتەئەممول
جەوابی نامەکەم مانەندی بولبول[2]

---

۱. [بەیرەق: بەیداخ، ئاڵا]. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «بەیرەقی»، وشەی «بەیدەغی» هاتووە.
کەکۆن: گردێکە لە ڕۆژئاوای ڕاستەکۆیەی جاران، گۆڕستانێك و قشڵەی بەسەرەوەیە.
هەیبەسوڵتان: ڕیزە چیایەکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری کۆیە.

۲. لە هەندێ دەقدا لە جیاتی «تۆش»، «تۆ» وە لە جیاتی «بێ تەئەممول»، «حەرفی کامیل»

غەرەز دەست خەتتی تۆیە، نـاعیلاجی
بڵا مەعنای نەبێ وەك بەیتی «حـاجی»[١]

••••••

## (١٥)

## لە مەیدانی بەهارا

لە مـەیدانـی بـەهارا شـارەکـەی "کـۆ"
قوبەی کیشمیری دا بەر شەق وەکوو گۆ[٢]

لە مابەینی "کەکۆن" و "هـەیبەسوڵتـان"
"نسێ"ی ئێوارە و "سـایە"ی سـبەینان[٣]

لەلام زیللی "هوما"یە چەتری "سەنبەر"
چ جایێ سێبـەری سـەرو و سـنەوبەر[٤]

---

☞

نووسراوە. وە لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێری دووەم بەمجۆرە هاتووە: «جوانی نامەکەم مانەندی بولبول» کەچی لە سەرچاوەکانی‌تر وەکوو ناو ئەم قەسیدەیە «جەوابی نامەکەم» هاتووە، کـە مانای گەلێ گونجاو و ڕاستە. وشەی «مانەند»یش بە مانای «وەکوو چەشنی»دێ.

١. بڵا: با، بام، لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «بەڵا مەعنای نەبێ وەك بەیتی حاجی». بەڵام بە پێی مانای وشەکە دەبێ «بڵا» بێ. بەڵا لەگەڵ دەربڕینەکانی دیکە ڕێك ناکەوێ.

٢. کیشمیر: وڵاتێکی خۆشەکەوتۆتە سەرووی ڕۆژئاوای هیندستان.

٣. نسێ: سێبەری سەر لە ئێوارانە. لە دەقی «گ.م»دا «شـنە» هـاتووە، بـەڵام شـنە بـۆ بـایە و لێرەش باسی سێبەری ئێواران و سێبەری بەیانیانە. ئەم دەقەی نـاو قـەسیدەکـەمان لە دەقـی «ع.م.ن» وەرگرت. سایە: سێبەری سبەینانە.

٤. [زیللی = «ظلّ»: سێبەر. هوما: باڵندەیەکی خەیاڵییە کە دەڵێن سێبەری باڵی بکەوێتە سەر هەرکەس بەختەوەر ئەبێ].

بــەهاری بــۆ گــوڵ و بـۆ میوە پـاییز
نــەزیری گــەر بــڵێم نـابێ بـە جـاییز

بــە ڕەنگــی ئــاسمان تــامی نــەباتە
بــە ســافی کـەوسەر و ئـاوی حـەیاتە

نــموونەی جـەننەتە شـیوی "ڕەزانـی"
بــەهاری شــامە ئــەییامی خـەزانـی[1]

گوڵی حاجیلەکانی دەشـتی "هـاموون"
نەکەی بیدەی بە "نەرگسجاڕی" گەردوون[2]

لەسەر کـێوان گـڵۆوك و لالەیـی سـوور
یەدی بەیزایی مووسایە لەسەر "تـوور"[3]

لە غونچەی نەو دەمیدەی بـاغ و ڕاغـی
دەڵێی گەردوونە هـەڵگـیرسا چـراغـی[4]

---

١. شیوی ڕەزانی: دۆڵی ڕەزانی. مەبەستی دۆڵی ڕەزانی کۆیەیە.

٢. [کاك عەبدوڕڕەزاق نیوەبەیتی یەکەمی ئاوەها خوێندووەتەوە: «گوڵی حاجیلەکانی دەشت و هاموون»، ئەڵێ: چونکە هاموون بە مانا دەشت و سەحرا هاتووە بەڵام ئەگەر ئیزافە بکرێ «دەشتی هاموون» من نەمبیستووە «هاموون» نێوی شوێنێ بێت لای کـۆیـە. ـهـەنگاوێ‌تـر: ٣٤١].

٣. توور «طور»: مەبەستی لە چیای تووری سینایە کە حەزرەتی مـووسا لە سـەر ئـەو چـیایە چاوەڕوانی دیدەنی خودای کردووە.

٤. [نەودەمیدە: تازە پشکووتوو]. لە دەقی «گ.م»دا نیوە دێڕی یەکەم بـەمجۆرە هـاتووە: «لە خونچەی نەودەمی لا باخ و شاخی». ئێمە لە سەر دەقی دەستنووسەکانی «م.ر.س» و «ع.م.ن» وەکوو ناو قەسیدەکەمان نووسی چونکە گونجاوترمان هاتە بەرچاو. مەبەستی لەو نیوەدێڕەدا ئەوەیە: غونچە گوڵەکان وەکوو ئەستێرە گەشەکانی ئـاسمانن و وەکـوو چـرای ڕووناکـن لە جەرگەی شەودا.

"دەماوەند"یش بە نیسبەت شاخی ئێمە
بــەهاری چــەشمەساری وشکــە دێمــە

لە ڕێگای ئەورووپایی گەرچی وەســتان
لە تەسویری وەکوو کەر پاکی وەستان[1]

لە کن "بیتوێنی" ئێمە دەشــتی "لاجـان"
وەکوو ڕێی بانەیە، هــەورازی بــێجـان[2]

ئــەهالی ڕۆســتەمن وەقــتی شــەجاعەت
لە حـــاتەم زێتـــرن وەقـتی ســەخاوەت

کوڕی غیلمانە کچیان عەینی حــووری
نـــەزەربازن وەلێکــین دوور بــە دووری

بە نیسبەت عیسمەتی مێردی لەگەڵ ژن
ئــــەقالیمی تــرن ســەر سۆری بــێ بــن

مـــوسافیر پـــەروەر و یـــاری غــەریبن
ئـــەوانــن وا لە هــەر عــەیبێ بــەری بــن

لە دیـــنداری «فــەقێیـــان» وەك چــیایە
مەلای بۆ گەنجی دین "حاجی قەڵایە"[3]

---

١. ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی لای مندا هەبوو لەوێ نیو بەیتی یەکەم بەمجۆرە نووسرابوو: «لە ریگای اوروپایە کرچی وستان» من لام وابوو ئەبێ بەوجۆرە بخوێنرێتەوە کـە لەسـەرەوە نووسیومە. موحەممەدی مەلاکەریم.

٢. بیتوێن: دەشتێکی بەپیتە بۆ کشتوکاڵ، کەوتۆتە نێوانی کۆیە و ڕانیە. لاجـان: دەشـتێکـە لە کوردستانی ئێران.

٣. مەبەستی لەم دێڕە شیعرەی کە بۆ یەکەمجار لە دەستنووسی «م.ر.س»ەوە بڵاو دەکرێتەوە،

مەکـەن مـەنعم هـەموو ڕاسـتە مـەقالەم
بە بورهان و حـەدیسی فـەخری عـالەم

وەتەن مـەحبووبەییکـە حـوجرە ئـارای
نـیشانەی دیـن و ئـیمانە تـەمەننای[1]

لە «ئـادەم» بگـرە تـا دەورانـی ئـێستا
یەکێکە «حاجی» لەو خـاکـە هـەڵستا[2]

کە غەمخواری بکا بـۆ مـیللەتی خـۆی
لە بەینی گەورەکان و شێخـی بـێ پـۆی

زەمانە تـووشی دەرد و غـوربەتی کـرد
غەمی کۆیێ پەرێشـانی هـەمووی کـرد

بە قەددی "ئـاوەگـردە" دەردی دووری
نەزیری "ئێچقەڵایـە" بـێ حـوزووری[3]

دوو ئاغای ماوە وەك بیستوومە ئـەخبار
"ئەمین ئاغا" و "حەماغای" ساحیبی کار

---



ئەوەیە بڵێ: «لە دینداری فەقێیەکانی کۆیە وەکوو چیا بـەرز و گـەورەن و مـەلاکـانیشیان بـۆ خەزینەی دین ئەی حاجی قادر وەکوو قەڵانە». لە لایەکی تریشەوە مەبەستی ئەوەیە بـاسی گوندی «حاجی قەڵا» بکات کە کەوتووەتە قەڵشتێکی ڕیزە چیای هەیبەسوڵتان.

١. لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا ئەم نیوە دێڕە بـەمجۆرە هـاتووە: «وەتـەن مـەحبووبێکـە زۆر جیلوە ئارای».

٢. ئەم نیوە دێڕەمان لە سەر دەقی «م.ر.س» ڕاستکردەوە.

٣. ئاوەگرد: وەك لەمەوبەر گوتمان ناوی چیایێکە لە سەرووی کۆیە. ئێچقەڵا: ناوی قەڵاتێکی ناوەوەی شوورەی کۆیە بووە، هەشە دەڵێ بە کۆنە قشلەی کۆیە گوتراوە.

ئـەمین و پشـتیوانـی قـەسری مـیللەت
نیگەهبانی خـەزینەی دیـن و دەوڵەت[١]

لە دنــــیادا ئــــیلاهی هــەر بــمێنــن
بــنەی بــێ ئـیتتفاقی هــەڵقــەنێنــن[٢]

لە "قۆچ" پـاشاوە تـا ئـێستا ئـەمیرێك
لە کۆی پەیدا نـەبوو یـاخود وەزیـرێك

لە بــەر بـێ ئـیتتیحادی بـوونە مسكێن
لە ئــاخردا وەكــوو زانــیومە هـەڵدێن

لە مــابەینی كــڵاوسـوور و كـڵاوڕەش
پەرێشـان و دیارن مـیسلی گـای بـەش[٣]

لە بــەر ئــەم نــاتەبایی و كـینەجۆیـی
لەلای ڕۆمـی زەلیـلن مـەردی كـۆیـی[٤]

وەكوو بیستوومە ئەی یاری نـیكۆپـەی
لە تەئریخی جەم و ئەسكەندەر و كەی[٥]

بــە شــیر و خــامە دەوڵەت پــایەدارە
ئــەمن خــامەم هــەیە، شــیر نـادیارە

---

١. نیگەهبان: پاسەوان.

٢. لە دەقی «گ.م»دا لە جیاتی «ئیلاهی»، «خودایا» هاتووە.

٣. كڵاوسوور: مەبەستی لە توركە عوسمانلییەكان بووە، چونكە فێسی سووریان لەسەر دەنا. كڵاوڕەش: مەبەستی لە ئێرانییە قاجارییەكان بووە چوونكە ئەوان جۆرە فێسێكی كورتی ڕەشیان لەسەر دەنا.

٤. كینەجۆیی: دوژمنایەتی.

٥. نیكۆپەی: بەختەوەری

نە بەیداغی هەیە نە تەپڵ و کووسی
ئەمەندەی پێ کرا بێچارەنووسی[١]

وەزیفەی خۆم بەجێ هێنا تەمامی
بە شیر و دەوڵەتە میللەت نیزامی

ئەوا خۆی کردە مەهدی «حاجی قادر»
نە نادر شای هەیە و نە شاهی نادر



## وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی

وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی
مەهە دانیشتووە یا سەروە ڕۆیی

هەیاسە و پەستەکی لای نێوەشانی
کەوای شیرداغ و فێس و جامەدانی[٢]

بە یەغمای داوە خەرقەی شێخی هیندی
ڕیدا و تەیلەسانی نەقشبەندی[٣]

کە بیستی سەیدی دڵ لەم دەورە باوە
لە پەنجا جێوە شەستی زوڵفی ناوە

---

١. کووسی، کووس: دەهۆڵی گەورەیە.

٢. [هەیاسە: کەمەربەندی زیو یان زێڕ. فێس: کڵاو]. لە دەقی «گ.م»دا نووسراوە: «هەیاسەو پێستەکەی».

٣. [خەرقە: لیباسی سۆفیان. ڕیدا: عەبا. تەیلەسان: پارچەیەکە کە قازی و شێخان لە سەر شانی دەخەن]. یەغما: تاڵانکردن، سەلب و ڕووتکردنەوە.

دڵی ویستم دوو چاوی، دانی خۆشە
دڵم نایە دڵی بشکێ، نەخۆشە[١]

گرینم وەك شەوی پاییز بەتاوە
گوڵێکم بوو لە باغاندا نەماوە

مەڵێ غەم گەورەیە یا گریە وردە
ئەمە گەرداوە، ئەویان ئاوەگردە[٢]

بەسە ئەی خامە با ئەم باسە پەی بێ
وەرە سەر باسەکی وا فائیدەی بێ[٣]

ئەمانە قیسسەیێکە زۆر کراوە
وەکوو ئاوی شەوێ تامی نەماوە

گەلێ ساڵە ئەهالی شارەکەی کۆ
شەو و ڕۆژێ لەگەڵ شێخانی بێ‌پۆ

میسالی ئاگر و ئاگرپەرستن
دەسووتێن و هەمیسان دەیپەرستن

لەعەهدی «کەر نەبی» تادەوری «گاکوێر»
لەگوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر[٤]

---

١. لە دەقی «م.ر.س»دا نیوە شیعری یەکەم بەمجۆرەیە «دڵی ویستم دوو چاوی، وا نەخۆشە». لە سەرچاوەکانی دیکەدا وەکوو دەقەکانی «ع.س.م» و «گ.م» بەمجۆرە هاتووە: «دەڵێ ویستم دەوێ چایوانی خۆشە».

٢. [واتە: هیچ فەرقیان نییە: چ گەرداو و چ ئاوەگرد هەردووکی گێژاوە، ئەشکرێ «گەرداو» مەبەست «ئەگەرداو» بێت]. لە دەقی «ع.س» و «گ.م»دا لە جیاتی «مەڵێ» وشەی «بڵێ» هاتووە.

٣. لە هەمان سەرچاوەدا لە جیاتی «بەسە»، وشەی «دەسا» هاتووە. پەی بێ: ببڕێ، ببڕێتەوە.

٤. مەبەستی لە «کەر نەبی»: «شێخ نەبی»ی ماویلییە و مەبەستی لە «گاکوێر»: شێخ غەفووری

☞

له کـــن خـــۆتـان فـڵان ئیبنی فـڵانـن
له دنـــــیا ئـــاین و ئـــۆیـــن دەزانـــن[١]

کەچی کـەچ مـەشرەبێکـی بـێ‌دیـانەت
بـــە حـیله مـل دەنـێتـە بـەر عـیبادەت

شـــەریعەت گـــەر بـــزانـی یـا نـەزانـی
وەکوو کـەر دەچـنە بـن بـاری گـرانـی

له مەش تەنها نـییە سـووچ و خـەتاتان
له کـــەسبیش غـــافڵن مـیسلی مـەلاتان

له بەغدا بۆچی خورما بێت و لەیـموون
له بۆ دەرمان له شار بێ ڕۆنی زەیـتوون

له دەوری کوللی بـاغی شـاری کـۆیـێ
دووسەد بن داری زەیتوونی بە جۆیـێ[٢]



مامی شێخ ڕەزای تاڵەبانییە کە شێخی ڕێبازی قادری بووە لە کۆیە. «لە گوێی گا نوستووە»، یا خود «لەگوێی گادا نوستووە»: ئیدیۆمێکی کوردییە بە یەکێك دەگوترێ کە لە شتێك زۆر بێ ئاگا بێت. حاجی ئەم ئیدیۆمەی لە شیعرەکەیدا بە جۆرێکی گونجاو بەکار هێناوە. «جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوریدا، بەغدا ١٩٨٢ ل:٤٣٣».

١. ئاین و ئۆین: فڕوفێڵ، حیلە و حەواڵە.

٢. لە دەقەکانی «م.م»و «گ.م»دا لە جیاتی «بن» وشەی «مەن» واتا: باتمان هاتووە. کەچی ئێمە لەسەر دەقی «ع.س» و «م.ر.س» ڕاستمان کردەوە و کردمان بە «بن» چونکە بۆ بنە درەختە نەك دارەکە، لە کوردستانیش هەرگیز داری سووتاندن بە کێشان نەفرۆشراوە بەڵکوو هەر بە بار فرۆشراوە، داری زەیتوونیش لە بەر خۆشەویستی فرۆشتنی لەسەر نەبووە.

له ئێوه کامتان بوو ئێك دوو بارێك
بکاته کیسه‌یه‌ك یا خوود خه‌رارێك[١]

دوو پێی لێدا له کۆلا میسلی دۆشاو
وه‌کوو ڕۆن ڕۆنی زه‌یتوون بێته سه‌رئاو[٢]

وه‌یا که‌ی نێژراوه چه‌ند نه‌مامه‌ك
له نارنج و توورونج و هه‌ر مه‌قامه‌ك[٣]

بزانن شین ده‌بێ، نابێ به به‌ر دێ
له جێگای گه‌رم و ساردی چی به‌سه‌ر دێ

به‌راو و ئه‌رزی ئێوه کیمیایه
دوڕ و گه‌وهه‌ر گه‌زۆ و مازووی چیایه[٤]

مه‌عادین خاتری تۆ بێ له‌گه‌ڵ کان
گه‌نمتان زێڕه حه‌تتا زیوه زیوان[٥]

ڕه‌ژووی واپۆڕ و خوێ و نه‌وت و گۆگرد
له کێوی ئێوه‌دا کۆیه وه‌کوو گرد[٦]

---

١. [خه‌رار: جواڵی له موو چنراو]. له ده‌قی «ع.س» و «م.م»دا له جیاتی «بکاته» وشه‌ی «بیکاته» هاتووه.

٢. کۆل: کارگه‌یه‌کی بچووکه له به‌رد و گه‌چ دروست ده‌کرێ بۆ گوشینی ترێ و هه‌موو جۆره میوه‌یه‌ك ده‌ست ده‌دات، به تایبه‌تی بۆ ترێ و هه‌نار و زه‌یتوون گوشین و ده‌رهێنانی دۆشاو و سرکه و ڕۆنی زه‌یتوون.

٣. هه‌رمه‌قامه‌ك: لێره‌دا به مانای «هه‌ر جۆرێك» یان «هه‌ر چه‌شنێك» دێ.

٤. له ده‌قی «گ.م»دا له جیاتی «به‌راو و ئه‌رزی ئێوه»، «به‌راو و خاکی ئێوه» هاتووه.

٥. [زیوان، زیڤان: کۆرگ، ده‌نکێکی ڕه‌ش و تاڵه له نێو گه‌نم و جۆدا].

٦. گۆگرد: کبریت.

لە بـەینی مـیللەتی خـۆتـان بـە یـاری
بکـەن تـەقسیمی شـاخ و دار و بـاری

دەوەن ئـاخر دەبـێتـە داری گـەورە
مەڕی لەڕ خدمەتی بۆ گۆشتی چـەورە[1]

لە دنـیادا ئـەوی بـاقی بـمێنـێ
لە عـوقبادا گـوناهی پـێ نـەمێنـێ

عەتایە و حـوسنی خـوڵق و ئـیتتحادی
ئـیتاعەی عـالمانە و شـێخـی هـادی

خـەریکی کـاسبی و کـاری حـەڵاڵە
بـە غـەیری ئـەم، ئـەوانـی‌تر بـەتاڵە[2]

ئەوانەی موڵکی خۆیـان کـردە دەوڵەت
وەکوو بت دەیپەرستن جەمعی مـیللەت

میسالی ئێوە بوون یـاخود وەکـوو مـن
ئـەوان بـۆچـی پـیاون، ئـێمـە وەك ژن

---

١. دەوەن: بنچکەداری بچووکی داری چیایە، ئەگەر لێی بەگەڕێن و نەی‌بڕنەوە، لە ئەنجامدا دەبێتە دارێکی گەورە. واتا: هەر شتێکی بچووکە و گەورە دەبێ، ئەمەش پەندێکی پێشـینانی کوردییە حاجی کردووەیە بە شیعر. پەندەکە دەڵێ: هەر دەوەنە و ئەبێتە دار لە بنیا دائەنیشین فەقیر و هەژار. بڕوانە: «شێخ موحەممەدی خاڵ، پەندی پێشینان چ٢ بەغدا ١٩٧١، ل:٤٨٢».

٢. ئەم دێڕە شیعرە لە هیچ سەرچاوەیەکی چاپ کراودا نەهاتووە، تەنیا لە دەقـی «م.ر.س»دا هەیە و لە دەقی «م.م»یشدا دەستی بۆ درێژ کراوە و نـووسراوە (سـەرجـەمی دێڕەکـانی ئـەم قەسیدەیە بووە بە ٣٥ دێڕ). واتا: لەگەڵ ئەم دێڕە تازەیەیدا. بڕوانە «مـەسعوود مـوحەممەد، حاجی قادری کۆیی ب٢، بەغدا ١٩٧٤، ل:١٦١».

سکەندەر بۆچی چار چاو و دوو سەر بوو
فەرەیدوون فیل و کاوە شێری نەڕ بـوو؟

لە دونیا هەر کەسێ هەستا بە هـیممەت
فـەرەیدوونێکـە ئـەسکەندەر مـرووەت

لە سایەی شیعرەکانی وەك فـەرەیدوون
دەمێنێ «حاجی» تا دەورانی گەردوون[1]



## (١٦)

## هەرکوردە

هـەر کـوردە لە بـەینی کـوللی مـیللەت
بـێبـەهرە لە خـوێنـدن و کـیتابەت

بـێگـانە بـە تـەرجـەمەی زوبـانی
ئـەسراری کـتێبـی خـەڵقـی زانـی

یـەکسـەر عـولەما درشت و وردی
نـاخوێنـنەوە دوو حـەرفی کـوردی

ئـوستادی خـەتن لە ئـەم سـیانە
وەك دی لە زوبـانی خـۆی نـەزانـە[2]

---

١. دەقی ئەم نیوە شیعرەمان لە سەرچاوەکەی «گ.م» وەرگرت، دەنا لە دەقی «م.ر.س»دا بەمجۆرەیە: «ئەبەد ما حاجی تا دەورانی گەردوون». لە دەقی «ع.س»یشدا «باقی ما حاجی تا دەورانی گەردوون» نووسراوە.

٢. مەبەستی لەم «سیانە» زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکییە.

مــومکین نــییه دەربــچێ لە چــەنگی
حــەتتا ڕەقــەم و خــەتی فــەڕەنگـی

ســاحیب کـوتوب و پـەیامە هـەرکەس
ئێمە نـەبێ بـووینە قـەومی چـەرکەس[١]

کـاکـە ئـێمـە مـوئمینین، نـە ڕووسـین
بـــۆچ کــفرە زوبــانمان بــنووسین؟[٢]

مــیللەتی بــێ کــتێب و بــێ نـووسین
غەیری کـوردان نـییە لە ڕووی زەمـین[٣]

ســـێ قــەبیلە حــەقیر و «بــی‌رومتن»
کــورد و ڕۆم و یـەهوودی گـومڕاهـن[٤]

---

١. چەرکەس: نەتەوەیەکی قەفقاس [(قەفقاز)] نشینە، بەڵام لە دواییدا زۆربەیان بە ناو تورکیا و سووریە و ئوردن بڵاوبوونەوە و کەوتنە ژیانێکی دەربەدەری.

٢. ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە هـەر سـەرچـاوەیەکـدا بـەجۆرێك هـاتووە: لە دەقـی «م.ر.س»دا بەمجۆرە هاتووە: «ئێمە کە موئمینین، نە ڕووسین». وە لە دەقی «ع.س»یشدا نووسراوە: «ئێمە موئمینین، نە ڕووسین». (ئێمە بە پێی دەقی «ت.ر» نووسیمانەوە. موحەممەدی مەلا کەریم).

٣. مامۆسـتا مـەسعوود مـوحەممەد وای بـۆ دەچـێ کـە لەم دێڕەوە بـەحری هـەڵبـەستەکـە دەگۆڕدرێ و دەبێ بە هەڵبەستێکـی نـوێ، بـەڵام وەك سـەرنجمان دا لەهـەموو سـەرچـاوە چاپکراو و دەستنووسەکاندا هەر بەمجۆرەیە و لەگەڵ ئەم هەڵبەستە هـاتووە بـۆیـە وەکـوو خۆیمان هێشتەوە.

٤. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: وشەی «بی‌رومتن»مان بۆ ڕاست نەبووەتەوە. ئەوەندەی هەیە بڵێین لە ئەسڵدا «بێ‌جاهن» بووە، جا لەبەر گۆڕانکاری ناشیانەوە بووە بە «بێ‌وەجهن» و ئەویش بە «بی‌رومتن». ـهەنگاوێ‌تر: ٣٥٠]. ئەم بەیتە لە تێکستەکەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد = روژ کرد) ژمارە «٢»دا هەیە، نووسیمانەوە. بەڵام ڕسـتەی نـاو دوو کـەوانـەکـەمان بـۆ سـاغ نەکرایەوە، وەك خۆی نووسیمانەوە. وشەی «دۆم»ی بەیتی پاشەوەشمان لەم تێکستە وەرگرت.

☞

ڕۆم و جـوو چـاکـە ئیتتیفاقی هـەیە
کـوردە بـێغـیرەتی و نـیفاقی هـەیە

جـینگەنەی ئێرە بـا وجـوودی کـەرن
هەروەکـوو دۆمـی ئـێمـە دەربـەردەرن

لێوە عـاقڵتـرن بـە سـەد مـەنسەب
کـوڕی خـۆیـان دەنێرنـە مـەکـتەب

ئـێستـەکـێ ئـامیرانـی کـوردستان
هـەر لە بـۆتـانەوە هـەتا بـابان[1]

لەم هـەتیوانـی مـەکـتەبەن یـەکسـەر
کوردەکان بار دەکـەن وەکـوو مـاکـەر

وا دیـارە هـەتاکـوو دنـیا بـێ
کـوردەکـان حـاڵیـان دەبـێ وابـێ

جـوو چ قـەدری هـەیە لە نـێو کـوردان
غـەیری لێدان و جـوێن و تـێهـەڵدان

حـاڵەتـی زێردەسـتی هـەر وایـە
نـۆکـەری کـاری چـاکـی بـۆ نـایە

---



لە دەستنووسە ئەسلەکەدا «قەومی» بوو. لام وایە وشەی «ڕۆم» لەم بەیتە و لە بەیتی پاشەوەشدا لە ڕاستیدا «دۆم» بێ چونکە هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ بەراورد کردنی «ڕۆم» کە واتە «عوسمانی» بە کورد و بە جووی ئەو سەردەمە. پەندێکی پێشینانی کوردیش هەیە «دۆم» و «جووی» لەگەڵ «فەقێ» پێکەوە تیا کۆکراوەتەوە ئەڵێ: «جوو لە ترسا، فەقێ لە برسا، دۆم بۆ پەڕۆ، ئەم سیانە خۆش ئەڕۆ». واتە: بە پەلە ڕێ ئەکەن. موحەممەدی مەلاکەریم.

١. لە دەقی «ت.ر»دا «ئێستەکی کوردەکانی کوردستان» هاتووە.

## (١٧)

### هەروەکوو مەردوم[1]

هەروەکوو مەردوم لەبەرچاوم دەگـریێ نـم نـمی
پیرەگودروونیش لە داغی دەوری حوکماتی گومی

تـەن لە سـایەی دووکـەڵی ئـاهی دڵی پـڕ ئـاتەشە
وا لە بەحری گریەدا چالاکـە وەك ئـائەش گـەمی

زوڵفی تـاتا کـردووە بـادی سـەبا، هـەر تـایەکـی
سەد هەزار چینی هەیە، هەر چینی بارێکی خەمی

«صـــاد عـــيني بـــالبكا للـنأي، ضـنت بـالكرىٰ»
«ليس للإنســـــان إلا مـــــا ســـعى فـــيما هـــمي»

یـــا هـــەڵێ، یـــا تـــاقەتی بـــاری ڕەقـیبانت هـەبێ
ڕۆحەکەم «حاجی»، مەبە ناموستەقیمو دەم دەمی[2]



١. [ئەم پارچە شیعرەمان لە کتێبی ـهەنگاوێ‌تر: ٣٧٦. وەرگرت کە پـارچـە شـیعرێکـی تـازە دۆزراوەی حاجییە، موحەممەدی مەلا کـەریم ئـەڵێ: بـە هـاوکاری بـاوکم و کـاکـم (فـاتحی مەلاکەریم) ڕاستمان کردەوە].

٢. [موحەممەدی مەلا کـەریم ئـەفەرموێ: ئـەم پـارچـە شـیعرە نـایابە بـەشێوەی داڕشـتن و تێکڕای بابەتەکەیا لە شیعری سەردەمی کوردستانی حاجی ئەچێ، بـەڵام بـەیتی یـەکـەمی هەستێکی ئاشکرای نەتەوەیی پێوەیە و دوا بەیتیشی نیشانەی ئەوکێشە بیرییەیە لە نێوان ئەو و ناحەزەکانیا، بە تایبەتی لە شێخانی تەریقەت ڕووی داوە. ئەگەر بۆچوونەکەمان لە جێی خۆیا بێت و حاجی ئەم پارچە شیعرەی لە کوردستان وتبێ، یـەکـەمین پـارچـە شـیعرێکـی ئـەبێ مۆرکێکی نەتەوەیی پێوە بێ و تا ئێستا دۆزرابێتەوە. ـهەنگاوێ‌تر: ٣٧٤].

یارەب بەقەدەر حەرفی سیووتی یەك یەك
ڕەحمەت لە موسەننیف و لە قاری بێ گەلەك
ئەمما عەجەم و ئەو کەسەی چاپی دانا
بیباتە جەهەننەم بە عەزاب و بە کوتەك[1]

❊ ❊ ❊

ئەی ڕەفیێقانی وەتەن زۆر غەزەلم ماوە لەوێ
لە کەنارێکەوە تەقدیرە وەکوو هەڵ بکەوێ
وەك سەفینە بگەڕێ بیخەنە بەر بەحری قسەم
حەیفە وەك من لە غەریبی بمرێت و نەتەوێ

❊ ❊ ❊

لە سەردەشتی میحنەت پەڕەی کردەوە
کەوانی بەڵا لۆکەیی پەیکەرم
بەلاڵووکە دەرمانی دەردم دەڵێن
بە پارە وەگیر ناکەوێ بیکڕم[2]

❊ ❊ ❊

ئەی عوتارید لە دەرت خادیمی سەججادە بە شان
وەی لە کۆیی فوسەحادا قەڵەمت سنجقەشان
«حاجی» قادر نییە بەیتێکی وەکوو ئێوە بڵێ،
ئەسپی کۆن زەحمەتە دەرچێ لەگەڵ ئاهوو ڕەوشان[3]

❊ ❊ ❊

---

١. [سیووتی = سیوطی]. حاجی ئەم چوارینەی لە سابڵاغ داناوە کاتێ خەریکی خوێندنی کتێبی سیووتی بووە.

٢. ئەم چوارینەشی هەر لە کوردستانی ئێران لە «سەردەشت» داناوە.

٣. ئەم چوارینەی لە ستایشی «حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە» داناوە.

نـــەقدی عـــومرم بـــە غـــەزەل دا و دووكـــانم دانـــا
هیچ كەسێ نـەیكڕی تـرسام لە ڕزیـن و لە خـوران
بێبەها دامـە ئـەم و ئـەو وەكـوو كـوردێك كـە ڕژا
ڕۆنی، ئەو وەقـتە دەڵێ: كـردمە خـێری كـوڕەكـان

*** 

ســـەقەرێكـــە ســـەفەری ڕاهـــڕەوی بـــێتـــووشە
خاسەتەن ئەم سـەفەری بـەد ئـەسەری بـێتـووشە
بەدرەقەی ڕێگە ئەگەر «خـزری نـەبی»بـێ تـووشە
"كـــافیە"كـــوا مـــەنزلی مـن بـێتـووشە؟[1]

*** 

یـــــاڕەبـــبی تـــۆ خـــەللاقی عـــەزیمو ششـــانی
هـــەرچـــی كـــە بـــووە و دەبـــێ و دەیـــێ دەیـزانـی
مـــن بـــێخـــەبەرم لە ئـــەووەڵ و ئـــاخیری خـــۆم
حـــــاڵیـــم بكـــە لەم بـــەینە چـــییە ئـــینسانی!؟[2]

*** 

بەیتی «نالی» و بەیتی من گەر تێكەڵی یەكتر دەكەن
ئەحمەقی سوورەتپەرست و جاهیلی مـەعنانەزان
حاجی‌لەكلەك لەك بە لەك فەرقی لەگەڵ تووتی هەیە
وەك هەزاری نەوبەهار و بـولبولی فـەسڵی خـەزان[3]

*** 

---

١. بڕوانە: مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری كۆیی. ب٣ بەغدا ١٩٧٦ ل:١٤٠.

٢. [عەزیمو ششان = عظیم الشأن].

٣. [هەزار: بولبول]. لە دەقی ڕۆشنبیری نوێدا لە جیاتی «دەكەن» وشەی «دەكەی» هاتووە و لە جیاتی «سوورەت پەرست و»، «سوورەت پەرستی» هاتووە. بنواڕە: ژمارە (٣٥)ی بڵاوكراوەی ناوبراو. وە لە جیاتی «حاجی لەكلەك لەك بە لەك»، «حاجی لەكلەكە لەك بە لەك» هاتووە. وە لە جیاتی «وەك»، «وەكوو» هاتووە.

شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە، مانەندی کەمە
تەرکەشی تیری تەژا و شیری دەستی ڕۆستەمە
ڕووی لە تەختی ڕوومەتت هێناوە بۆ شانت دەڵێی
ماری سەرشانی زوحاك و دوژمنی تەختی جەمە[1]

* * *

سمتی دەلەرێتەوە دەڵێی دووگی مەڕە
گرد و سپی و لووسە وەکوو تووری تەڕە
ماڵێکە ئەگەر بدا بە نەقدی دڵ و جان
خۆشت لە سەر نەبێ، جەهەننەم بکڕە[2]

* * *

چوومە جەرگەی ئەهلی دڵ جەرگێکی بێداغم نەدی
ناڵەیی بولبول لە باغا بێ قڕەی زاغم نەدی
عالەمێکم دی نەخۆش و یەك کەسی ساغم نەدی
دوور لە مەیدانی خودا غەیری قوڕومساغم نەدی[3]

* * *

١. حاجی ئەم چوارینەی بە پیاوێکی تەقتەقیدا هەڵگوتوە. بنوارە «مەسعوود موحەممەد. حاجی قادری کۆیی. ب٢ بەغدا ١٩٧٤ ل١٥٧».

٢. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: بە هەڵە «خۆشت لەسەر بنێ»مان بە «خۆشت لەسەر نەبێ» چاپکردووە. ماناکەی واتە: گوێ مەدە و خۆت بنێ بە سەریدا و چش کە لە هەرچی شتە. ـهەنگاوێتر: ٣٥٧]. ئەم چوارینە لە کەشکۆڵی مەلا ڕەسووڵی توربەییدا هەبوو کە وێنەیەکی لای شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغییە. هەروا لە یەکێ لە دوو دەستنووسەکەی لای خۆشمدا هەیە. موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. ئەم چوارینەمان بە هۆی کاك موحەممەد عەلی قەرەداغییەوە دەسگیر بوو کە لە ڕووی کەشکۆڵی مەلا عەزیزی ڕێشاوی نووسیبوویەوە. موحەممەدی مەلاکەریم.

شـــێخ غــەفوور بــیستوومە چــاچیم پــێ دەڵێی،
چـــاکـــە مـــن نــابم بــە نــوقتەی لا بــە لا![1]

* * *

جورمی من داوێنی عەفوی گەر نەپۆشی ڕۆژی حەشر
عەبرەتی من کافیە بۆ ئـەهلی مـەحشەر سـەربەسەر[2]

* * *

دەرسی مەعنای بـێ‌عـیبارەت مـەرکەزی مـەیخانەیە
حـــەڵقــەیی جــەنگ و جـیداله خـانەقا و مـەدرەسە

* * *

سوخرەیی جیننی تەبیعەت سوخرەیی عـالەم هـەڵێ
وا ســـولەیمان دێتــەوە کــۆتـر فـڕێنت پـێ دەکـا[3]

* * *

باسی زاری تۆ خـەیاڵێ بـوو کـرابـوو هـات و چـوو
بۆچی لێم عاجز دەبی قوربان لە سـەر هـیچێ نـەبوو

* * *

پەردەیی سیدق و سەفا و ڕاسـتیی ئـادەم نـەدڕابـوو
کـــەرباسی غـــەمێ بـوو بـە قـەدی بـەندە بـڕابـوو[4]

* * *

١. مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب٢ بەغدا ١٩٧٤، ل: ٢٠٠.
٢. [عەبرەت: درس وەرگرتن، یان فرمێسك و ئەسرین]. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا، دیـوانـی حاجی قادری کۆیی، دەستنووس، ل: ٢٣١.
٣. [ئاماژەیە بەو چیرۆکەی کە دەڵێن: سولەیمان کە بۆ ماوەی چـل ڕۆژ پـاشایەتییەکـەی لێ زەوت کرا و کەوتە دەستی جنۆکەیەك، کە لە پاش ئەو ماوە دیسانەوە خوا پاشایەتییەکەی پێ خەڵات کردەوە و جنییەکانی زنجیر کرد].
٤. کرباس، کەرباس: داوی ڕستراو، ڕیس.

مەنزڵی مەئمەن نەماوە ئێستە کە ئەییامەکە
ڕاحەتی مومکین نییە نەچیە مەدینە یا مەکە

❋ ❋ ❋

سینەم دەگرێ لێم دەمرێ کەلبی ڕەقیب
ئەمکارە وەکوو داری لە دوو لاوە گلاوە[١]

❋ ❋ ❋

تۆ خۆش دەبەزی ئەسپی بەزینت پێیە
من ناگەمە تۆ ئەسپی بەزینم پێیە[٢]

❋ ❋ ❋

چاوەکەم تۆش پیر دەبی، ڕیشت دەبێتە گۆرەوی
وەك بفەرمووی من فڵانم پێت دەڵێن توخوا هەوی؟

❋ ❋ ❋

خانەقاکەی کەنەفی ئەمنە، ئەدەبخانەیی عام
جێ قەزای حاجەتە خەڵقی بە زەرووری دەچنێ

❋ ❋ ❋

موددەعی دوێنێ ئەگەر جوونی دەدا عەیبی نەبوو
شکڵی خۆی دیبوو لە ئاوێنە بە عەکسی دەوەڕی[٣]

❋ ❋ ❋

---

١. [موحەممەدی مەلا کەریم ئەڵێ: نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لەنگی تیایە و بڕگەیەکی لە نیوەی دووهەم کەمترە، لەبەر ئەوە لام وایە وشەی «ڕەقیب» ڕاستەکەی «ڕەقیبم» بووبێ. ـ هەنگاوێتر: ٣٦٠].

٢. مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب١ بەغدا ١٩٧٤، ل: ١٢٣.

٣. [بە بۆچوونی موحەممەدی مەلاکەریم «دوونی» ڕاستە نەك «دوێنێ» چونکە وا بە دیالێکتی کۆیەوە نزیکترە. ـ هەنگاوێتر: ٣٦٢].

شێخ دەڵێ: باری ڕیا شانم جدەو ناكا ئەگەر
كێوی كاروخ بێ، گوتم: سەد «بارك اللّه» كەر "نەبی"[١]

❊ ❊ ❊

مەسئەلەی كوحلی لە بەحسی مەبنیا تەقریر ئەكرد
پێی ئەڵێت (.....) ئەحمەقی كەر وا ئەڵێ «ابن الحجر»[٢]

❊ ❊ ❊

(.....) دەخیلت بم سەما نەیبرد، زەوی قووتی نەدا
هەر لە بەینی ئێمەدا بوو ئەم دڵ ئاخر كێوە چوو[٣]

❊ ❊ ❊

گەر نەچم لێم زویر دەبێ وەقتێ دەچم مەنعم دەكا
سەیری كە بێمروەتە چیم لێ دەكا و چیم پێ دەكا

❊ ❊ ❊

زۆر سەگم دیوە فەقەت نەمدی ڕەقیبی هەندەسە
وەزعی نامەوزوون دەبێ وەك خانویی بێهەندەسە[٤]

❊ ❊ ❊

١. مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری كۆیی، ب ١ بەغدا ١٩٧٤، ل: ١٢٣.

٢. ئەم بەیتە لە یەكێ لە دەستنووسەكانی لای مندا هەبوو. نیوەی دووهەمی لەنگییەكی تیایە لاموایە لەو شوێنەدا كە بە چەند نوختە پڕم كردووەتەوە وشەیەكی لێ پەڕیوە، لەوانەیە «ئەی» بێت، هەروا لاشموایە «پێی ئەڵێت»ەكەی لە ڕاستیدا «پێ دەگوت» بووبێ چونكە نیوەی یەكەمی بەیتەكە وا پێویست دەكا. موحەممەدی مەلاكەریم.

٣. ئەم بەیتەش هەروا لە یەكێ لە دەستنووسەكانی لای مندا هەبوو. ئەمیش وشەیەكی لە سەرەتاوە پەڕیوە، شوێنەكەیم بە نوختە پڕ كردووەتەوە. موحەممەدی مەلاكەریم.

٤. [بە بۆچوونی موحەممەدی مەلاكەریم «خانووی» لە «خانوویی» چاكترە. ـهەنگاوێ تر: ٣٥٦].

## (١)

# ای مرا از عشق رویت

ای مرا از عشق رویت دل چو مجنون دربه‌در
عالم از شوق جمالت خون فتاد اندر جگر

روز و شب از کوی جانان یك نگاهم آرزوست
تا نثار او کنم جان از بهای یك نظر

سینه چاکم کرد چون گل غمزه‌ی چشم از نگاه
ای نگه چون سمّ قاتل تیغ بُرّان در اثر

تا فرود آمد به رویش حلقه‌ی زنجیر زلف
دل فتاد اندر کمندش چند کرد از وی حذر

هرکه در بستان حسنت آمد از بهر نگاه
غنچه‌سان خون در دل آمد هوش افتادش ز سر

آهوی چشمت به زیر ابروی هم‌چون هلال
سینه‌ها را تیر باران کرده سانِ رهگذر

گلشن عیش من اندر آتش هجران تو
شد بهارش چون خزان، بی‌برگ مانْد و بی‌ثمر

ناله از دل، آتش از تن، دودم از جان می‌رود
روز و شب حالم چنان است زین میانم درنگر

ناله‌ی «حاجی» جهان افگند یک سر در خروش
در توِ کافردل، نسازد ناله‌ی زارم اثر[1]

---

١. پارچە شیعر و چوارینە فارسییەکانی ئەم دیوانە، بە یارمەتی مامۆستا مەسعوود موحەممەد و دوکتۆر موحەممەد نووری عارف خستوومانەتە سەر ڕێنووسی فارسی، چونکە لە دەقەکانی «م.ر.س» و «گ.م»دا بە ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی نووسرابوونەوە.

(٢)

## ای بت سنگ دل

ای بت سنگ دل چرا وعده به‌جا نمی‌کنی
مژده‌ی وصل می‌دهی باز وفا نمی‌کنی؟

سوختم اندر آرزو وز غمت ای عبیر بو
باعث چیست ـباز گو ـ رحمی به ما نمی‌کنی؟

دیده پر آب حسرتم خم شده سرو قامتم
در دل اندر آفتم، از چه دوا نمی‌کنی؟

دادی پیام دیدنی زان رخ خوب گلشنی
تا دل از آتش افگنی ور نه چرا نمی‌کنی؟[1]

سوخته دل در آتشم نعره به چرخ می‌کَشم
باری ز روی مهوشم کام روا نمی‌کنی؟

تا کی بسوزم از درون، جان نشود ز غم برون
زان رخ خوب لاله‌گون، دیده ضیا نمی‌کنی؟

حلقه‌ی زلف خم به خم، دل چو گرفت در ستم
بهر چه میلی از کرم سوی گدا نمی‌کنی؟

سینه کباب از غمت، وعده شد و ندیدمت
گوشه‌ی چشم مرحمت بهر چه وا نمی‌کنی؟

«حاجی» بسوخت از درون سینه نمود بحر خون
رحم چرا به این زبون بهر خدا نمی‌کنی؟



١. [له‌وانه‌یه (از آتش) هه‌ڵه‌ی ڕوونووسکه‌ر بێت و ڕاسته‌که‌ی (در آتش) بێت].

## (٣)

## مژده ای دل

مژده ای دل که مرا درد بـه درمـان آمـد
قاصد خوش خبرم از سوی جانان آمـد

داد پیغام که اندر چَهِ محنت بـه در آی
شاهد از روی کرم بـر سـر پـیمان آمـد

گرچه دریای غمش کشتیِ دل کرد هلاك
ساحل وصل چو دیدم همه پـایان آمـد

شد یقین بخت بد و طالع بر گشتەی من
از پــریشانی غـم بـاز بـه سـامان آمـد

دیدەی کور من از اشك چنان شـد بـینا
گــوئیا پـیرهن از یـوسف کـنعان آمـد

کشـتزارِ دلم از آبِ حـیاتِ لبِ دوست
چون ریاض "ارم" از شوق درخشان آمد

دل که تاریك‌تر از زلف پریشان تو بـود
آتش عارض گـل‌فامِ تـو رخشـان آمـد[1]

زخم‌های دل مشتاق من از ناوك دوست
مرهمش بهر نشاطش سوی لقمان آمـد

غنچەی سینەام از خون جگر پاك نمود
باد صبح از سر کویت چو به بستان آمد

---

١. ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی لای خۆم و لە دەستنووسێکی مەلا رەسووڵی توربەییدا هەبوو کە وێنەیم لە موحەممەد عەلی قەرەداغی وەرگرت. تێکراگەلێ هەڵەی ئەم پارچە و دوو پارچەی پێشووم لەسەر ئەو دوو دەستنووسە ڕاست کردوەتوە. موحەممەدی مەلا کەریم.

سبزوار از چمن عیش دلم نشئه نماست
ز ابر لطف توم ای دوست که باران آمد[1]

«حاجی» از لعل تو گر بود امید شکرش
راهش از لطف تو سوی شکرستان آمد



## (٤)

## تاریخ وفات حاجی بکر آغا[2]

شنیدم دیشب افغان از زن و مرد
صدا افگند بر طاق زبرجد

بگفتم چیست این افغان؟ مردی
کشید آهی ز سوز سینەی سرد

بگفتا مر ندانی کز جهان رفت
"ابوبکر" انیس غار "احمد"

بگفتم: چیست تاریخ وفاتش؟
بگفت: «وا ثانی ثنین محمد»[3]

---

١. ئەم دەربڕینەی «ز ابر» بە «زَبرِ» دەخوێنرێتەوە، لەبەر کێشی شیعرەکە.
٢. بنوارە: مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب١، بەغدا ١٩٧٣، ل:٣٩». مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، دەستنووس، ل: ٢١١.
٣. ئەم دێرە بە یتە «وا ثانی ثنین محمد» بە حسێبی «جومەل» ساڵ ١٢٧٠ی کۆچی [هەتاوی] دەگرێتەوە کە ساڵی کۆچی دوایی حاجی بەکراغایە.

| و | ا | ث | ا | ن | ی | ث | ن | ی | ن | م | ح | م | د | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| +٦ | +١ | +٥٠٠ | +١ | +٥٠ | +١٠ | +٥٠٠ | +٥٠ | +١٠ | +٥٠ | +٤٠ | +٨ | +٤٠ | +٤ | = ١٢٧٠هـ |

## (٥)

## ای دوست[1]

ای دوست دل از بند غم و جور رها کن
در دل بیچاره‌ام از رحم روا کن
مشتاق نگاه است ز کرم کام روا کن
«ای خسرو خوبان نظری سوی گدا کن»
«رحمی به من سوخته‌ی بی‌سر و پا کن»

* * *

---



له ده‌قی ده‌ستنووسه‌که‌ی «م.ر.س»دا نووسراوه: «واثانی اثنین محمد» و به‌م حیسێبه‌ش ساڵی ۱۲۷۱ی کۆچی ده‌گرێته‌وه و هه‌روه‌کوو ساغیش بۆته‌وه و هیچ گومانی تێدا نییه «حاجی به‌کراغا» له ساڵی «۱۲۷۰»ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووه. که‌واته ده‌بێ هه‌مزه‌که‌ی «اثنین» بپه‌ڕێنین و بیکه‌ین به «ثنین» تاکوو ساڵه‌که ڕاست ده‌ربچێ.

۱. ئه‌م پارچه شیعره و پارچه شیعره‌کانی پاشه‌وه‌یم له ڕووی که‌شکۆڵه ده‌ستنووسه‌که‌ی مه‌لا ڕه‌سووڵی توربه‌یی نووسیوه‌ته‌وه که وێنه‌ی لای شێخ موحه‌ممه‌د عه‌لی قه‌ره‌داغییه. ئه‌م پارچه‌یه پێنج خشته‌کییه له سه‌ر غه‌زه‌لێکی خواجه حافزی شیرازی که گه‌لێ له چاپه لێکۆڵراوه‌کانی دیوانی شاعیری ناوبراو دان به‌وه‌دا نانێن هی ئه‌و بێ. من به‌راوردی غه‌زه‌له‌که‌ی حافزم له‌گه‌ڵ نوسخه‌ی چاپی «مطبع محمدی بمبیء» کردووه که له ساڵی ۱۳۲۲ی هیجری «۱۹۰٤-۱۹۰٥»دا له چاپ دراوه. به پێی ئه‌و چاپه له ده‌ستنووسه‌که‌ی توربه‌ییدا هه‌ندێ به‌ر و دوا پێکردن له نێوان چه‌ند نیوه دێڕێکدا و چه‌ند ورده هه‌ڵه‌یه‌ك هه‌بوو هه‌مووم به گوێره‌ی چاپه‌که ڕاست کردنه‌وه. له‌و چاپه‌دا به‌یتێکی تریش هه‌بوو که یا حاجی قادر نه‌یدیوه، یا نه‌یکردووه به پێنج خشته‌کی، یا له ده‌ستنووسه‌که‌دا نه‌نووسراوه‌ته‌وه. ئه‌و به‌یته پێنجه‌مین به‌یته و ئه‌مه‌یه:

شمع و گل و پروانه و بلبل همه جمعند
ای دوست بیا رحم به تنهائی ما کن

ای بــزم مــرا عــارض گــل‌فام تـو مـاهی
مــژگان تــوم خـنجر و ابـروی تـو شـاهی
تــا کــی بــزند بــر دل بـیچاره سـیاهی
«دارد دل درویش تــــمنای نگــــاهی»
«زان چشم سیه مست به یك غمزه دوا کن»

❊ ❊ ❊

جــان بــاد فــدای خــم ابــروی هـلالت
گـل گشت پـریشان ورق از شـرم جـمالت
خورشید شد از حسن تو در عین خـجالت
«گر لاف زنـد مـاه کـه مـاند بـه جـمالت»
«بنمای رخ خویش و مه انگشت نـما کـن»

❊ ❊ ❊

ای ســینه‌ام از پــیك تــرا لحــظه نشـانی
بــدحال و پــریشان شـدم از زخـم امـانی
رحمی کــن و از کــوی خــودم ده تـومکانی
«ای سرو چــمن از چــمن و بـاغ و زمـانی»
«بخرام درین بزم و دو صد جـامه قبا کـن»

❊ ❊ ❊

چشمان مـن از بـاده‌ی اشکـم شـده سـاغر
مــژگان تــوم خــون جگـر ریـخته ظـاهر
ســرخـاك ره کـوی تـوم ای شـه «فـاخر»[1]
«با دل شدگان جور و جفا تا به کـی آخـر»
«آهــنگ وفــا، تـرك جـفا بـهر خـدا کـن»

❊ ❊ ❊

---

١. به تەواوی لەم وشەیە دڵنیا نیم، بەڵام لەمەش کە نووسیومە باشتری بۆ نەچووم.

گــر رفت رقــیب از بـرت ای شـمع دلارا

........................................................................[1]

در عهد تو «نابد» قدمی نـیست چـو مـارا[2]

«مشـــنو ســـخن دشـمن بـدگوی، خــدارا»

«با "حافظ" مسکین خود ای دوست وفا کن»

❊ ❊ ❊



## (٦)

## بازم هوای مهر بتان در درون فتاد

بـــازم هــوای مـهر بـتان در درون فُـتاد[3]
دل غونچەوار در غمش از بحر خون فُتاد

غــم تــازە کــرد داغ کــهن بـاز در تـنم
از غمزەهای چشم چـنان دل زبـون فُـتاد

شمشیرهای ابروی قـوس و قـزح صـفت
بر دل چــنان کشـید ز روی سکـون فُـتاد

هـوشم پـرید از سـر و صـبرم گـریز کـرد
دل در کمند عشق «پسی» از جـنون فُـتاد

راه نــجات چـند طـلب کـردم از غــمش
دل از نگاه چشم و رخش سـرنگون فُـتاد

---

۱. لێرەدا ئەبێ نیو بەیتی‌تر هەبێ کە لە دەستنووسەکەدا نییە.

۲. لەم وشەیەش بە تەواوی دڵنیا نیم، هەروا لەمەش کە لێرەدا نووسیومە باشتری بۆ نەچووم، موحەممەدی مەلا کەریم.

۳. لە دەستنووسەکەدا لە جیاتی «بازم»، «باز» نووسرا بوو دیارە هەڵەیە. مـوحەممەدی مـەلا کەریم.

زین پیشم ار امید نجاتی ز غم بُدی[1]
این نوبتم امید ز دل در بیرون فُتاد

راه نجات ار طلبی دل مده به کس
بنگر به حالم از نگهی دل که چون فُتاد

«حاجی» خروش و نوحه و زاریت شرم باد
بس دل ز داغ عشق چو تو لاله‌گون فُتاد[2]



## (٧)
## به مژگانم مزن

به‌مژگانم مزن بس دردمندم
نهال عیش از بنیاد کندم
چه حاجت دل سوی زندان کشندم
«چنان در قید مهرت پای‌بندم»
«که گویی آهوی سر در کمندم»



دلم چون حلقه‌ی زلف تو درهم
قدم چون ابروان دوست در خم
چنانم دائم از دست تو در غم
«گهی بر درد بی‌درمان بگریم»
«گهی بر حال بی‌سامان بخندم»



١. له ده‌ستنووسه‌كه‌دا له جیاتی «ار»، «از» نووسرا بوو دیاره هه‌ڵه‌یه. موحه‌ممه‌دی مه‌لاكه‌ریم.
٢. له ده‌ستنووسه‌كه‌دا له جیاتی «ز»، «از» نووسرا بوو دیاره هه‌ڵه‌یه. موحه‌ممه‌دی مه‌لاكه‌ریم.

چــنان در آتش حســن تــو جــوشی
مــپندار از دلم ـای خــواجــه ـ هـوشی
فــتاد انـدر سـینه گـر سـازد خـروشی
«مـرا هـوشی نـماند از عشـق کـوشی»
«کـــه قــول هــوشمندان کــاربندم»

*** 

چو غنچه تا بـه کـی بـاشیم خـونخوار
چـو بـلبل چـند بـاشم دل پـر از خـار
چنان است سینەی چـاکـم پـر از مـار
«مــجال صــبر تـنگ آمـد بـه یکـبار»
«حــدیث عشــق در صــحرا فگـندم»

***

مــرا گــویند اگـر یـار تـو مـه روست
لبش چون چشمەی حیوان دلجـوست
جــفاهایش مکش، بسـیار بـدخوست
«نه مجنونم کـه دل بـردارم از دوست»
«مــده گـر عـاقلی ای خـواجـه پـندم»

***

فــروغ حســنت ای دلبـند شـد فـاش
رقـــیب از پــیش رویت بــا خــفاش
«تعالی اللّٰه» ز حسنت گر فـزون بـاش[1]

---

۱. له دەستنووسەکەدا تەنیا یەك وشە هەبوو لەویش دڵنیا نەبووم چییە، بەڵام زیاتر بە «تعالیٰ» ئەچوو بەبێ وشەی دووهەمیش نیو بەیتەکە لەنگ بوو، بۆیە لای خۆمەوە وام دانا «تعالی اللّٰه» بێ کە لەگەڵ مەعنای ڕستەکەش ئەگونجێ. لەگەڵ هەموو ئەوەش ڕستەی «گر فزون باشی» مەعنایەکی تەواو نادا بە دەستەوە. موحەممەدی مەلاکەریم.

«چـــنین صـورت نـبندد هـیچ نـقاش»
«مـــعاذ اللّـه مـن ایـن صـورت نـبندم»

❋ ❋ ❋

ز مـــژگان تــو زد بــر ســینه غــم‌ها
دلم شـــــد در خـــم زلف تـــو شـــیدا
نگـــه کـــن در غـــمت بـین ای مـه‌آسا
«چه جان‌ها در غمت جز سـود تـنها»[1]
«نـــه تـــنها مـــن اســیر و دردمـــندم»

❋ ❋ ❋

فــــتاد از چـــین زلفت بـــخت در دام
دلم انـــــدر پـــیش گـــردید بـــر.....م[2]
چــــو نـــــتوان آرمش گــفتم دل‌آرام
«تــو هــم بـاز آمـدی نـاچار و نـاکـام»
«اگـــــر بـــاز آمـــدی بـــخت بـلندم»

❋ ❋ ❋

نـــیاسودم دمـــی از مـهرت ای دوست
روانـــم بـیرون آمـد از غـمت دوست[3]

---

١. ئەوەندەی من بۆم ساغ‌کرابێتەوە ئەم دوو وشەیە لە دەستنووسەکەدا «جـز سـود»ە بـەڵام هیچ مەعنایەکی لێوە حاڵی نەبووم، بۆیە لام دوور نییە «فرسود» بێ لەگەڵ «و»یك و «تنها»یش جمعی «تن»بێ بـەرابـەر بـە «جـانها». مـوحەممەدی مـەلا کـەریم. [لە کـوللیاتی سـەعدی ساغکراوەی «محمد علی فروغی»دا ئەم نیو دێڕە بەم‌جۆرە هاتووە: «چـه جـان‌ها در غـمت فرسود و تن‌ها» کە دیارە بووچونەکەی مامۆستا موحەممەدی مەلاکەریم ڕاستە].

٢. ئەم وشەیەشم بە تەواوی بۆ ساغ نەکرایەوە. موحەممەدی مەلاکەریم.

٣. وادیارە لە پاش ئەم نیوە بەیتەوە پێنج نیوە بەیت پەڕیوە، سیانیان لەگەڵ ئەم دوو نیوە بەیتەو دوانیان لەگەڵ سیانەکەی پاشەوەیان و پێنج خشتەکییەکە دو پێنج خشتەکی بووە. موحەممەدی ☜

ولی بــــعد از وفــاتم ای رخ از نــور
«گر آوازم دهـی «دل» خـفته در گـور»[1]
«بــــراســــاید درون دردمــــندم»

❊ ❊ ❊

روان پــــر دردم از بـــهر فـــدایت
نـــنالم هـــرگز از دست جـــفایت
تـــن بـــیمارم ار نـــبود سـزایت
«ســـری دارم فــدای خــاك پــایت»
«گـــرم راحت رســانی یــا گــزندم»

❊ ❊ ❊

بــه بــیداد آتشــم افگــند در پـوست
روان در تن، در اندر سینه‌ام سـوخت
ولی «حاجی» بگویش از من ای دوست
«اگر در رنج «سعدی» راحت از اوست»
«مـن ایـن بـیداد بـر خـود مـی‌پسندم»

---

☞

مه‌لاکه‌ریم. [به‌ڵام له ته‌واوی ده‌قه‌کانی کوللیاتی سه‌عدیدا یازده شیعره که حاجی قادریش هه‌ر یازده‌که‌ی هێناوه‌!].

١. له‌م «دل»ه‌یش دڵنیا نیم، به‌ڵام به جۆرێکی که‌ش بۆم نه‌خوێنرایه‌وه. موحه‌ممه‌دی مه‌لا که‌ریم. [له ته‌واوی ده‌قه‌کانی کوللیاتی سه‌عدیدا وشه‌ی «من» هاتووه].

## (٨)

### [فدایت جان من،][1]

[فدایت جـان مـن، صـد جـان عـاشق
تـویی هـم جـان و هـم جـانان عـاشق

نـــماند بـــی‌تو صـــبری در وجـــودم
نـــباشد صـــبر در امکـــان عـــاشق

هـــمه شب تـــا ســـحرگه نـــاله‌ی مـــن
بـــلند آوازه کـــرد افـــغان عـــاشق

به بیماری تو خودکن چاره چون نیست
عـــلاج هـــجر نـــه درمـــان عـــاشق

بـیا «حـاجی» در ایـن ره سـر فـداکـن
نـخواهـد سـر، دلِ حـیران عـاشق]



## (٩)

### [بدیدم طاق ابرویت]

[بـــدیدم طـــاق ابـــرویت دلم شـــد مـــبتلای تـــو
به شـوخی بـرده‌ای دل را تـو دانـی و خـدای تـو

بسـی خـوبان بـدیدم (...)[2] نگشـتم نـایل ایشـان
نمی‌دانم چه سر است این که من مـردم بـرای تـو

---

١. [ئەم پارچە شیعرە و پارچە شیعری پاشەوەیمان لە کتێبی «هـەنگاوێ‌تـر بـەرێگـادا بـەرەو ساغکردنەوەی دیـوانـی حـاجی قـادر» وەرگـرت، کـە مـوحەممەدی مـەلا کـەریم ئـەڵێ: لە دەسنووسەکەی کاك هۆشەنگ (حەمەبۆر) بوو و بە خەتی «بێخود» نووسرابووەوە.]

٢. [لێرەدا وشەیەك ناتەواوە].

تُـــرا مـــطلب اگـــر ایـن است مـن در حـیر مـیرم
[مرا صد جان اگـر بـاشد هـمه سـازم فـدای تـو]

اگـــر خـــوبان عـالم را سـراسـر جـمع گـردانـی
دل مسکـــین «حـاجی» را نـدارد جـز هـوای تـو]



# رباعی

یارب بـه کـرم بـه‌جای طـاعت از مـن
این کوشش و این سـعی دمـادم بپذیر
وین گـرسنگی و غـربت و بـی‌خوابـی
فـــرسودن پـــهلوان بـه بـالای حسـیر[١]

❊ ❊ ❊

ای دریغا بـود آن روز کـه یـاران قـدیم
ز سر لطف به این خط پـریشان نگـرند
هم بگویند دریغا پی «حاجی» که فـلك
کشت او را و بر او عالم و جاهل نگرند[٢]

❊ ❊ ❊

---

١. بڕوانه: مه‌سعوود موحه‌ممه‌د، حاجی قادری کـۆیـی، ب١ بـه‌غدا ١٩٧٤، ل: ٢٦٨؛ مـه‌لا ڕه‌ئووفی سه‌لیم ئاغا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، ده‌ستنووس، ل: ٢٢٢.
٢. مه‌لا ڕه‌ئووفی سه‌لیم ئاغا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، ده‌ستنووس، ل: ٢٢٣

# فرد

شب سه شنبه بیست از ماه آخر
هزار و دو صد و هفتاد و شش در[1]

* * *

گدازانیدی بیم از او همه تیغ
نیامش گر نبستی می‌چکیدی[2]

* * *

مستی و دایره‌ی حکمت (...) هیهات
برندارند به یك دست دو تا خربزه را[3]

---

۱. مه‌سعوود موحه‌ممه‌د، حاجی قادری کۆیی، ب۲ به‌غدا ۱۹۷٤، ل: ۱۸۲؛ هه‌مان سه‌رچاوه: ب۲ به‌غدا ۱۹۷٤، ل:۱۷٥.

۲. مه‌سعوود موحه‌ممه‌د: ئه‌مه وه‌رگێڕداوی تاکه شیعرێکی «ابوالعلاء المعری»یه که ده‌ڵێ:

يذيب الرعب منه كلّ عضب
و لولا الغمد يمسكه لسالا

۳. ئه‌م به‌یته له یه‌کێ له ده‌ستنووسه‌کانی لای مندا هه‌بوو. موحه‌ممه‌دی مه‌لاکه‌ریم.

## دوا وشەی منیش

لەسەر داوای خۆم، سەرپەرشتی کردنی چاپ و ڕاستکردنەوەی پرۆڤەکانی ئەم کتێبەم پێ سپێررا. مەبەستم لەم داوایە ئەوە بوو دەمێ بوو لە دڵما بوو بۆم ڕێبکەوێ هەوڵ بدەم دیوانێکی پوختی حاجی قادری پێشەنگی چەرخی ڕاپەڕینی کۆمەڵەی کوردەواری بە چاپ بگەیەنم. کە برایان کاك کەریم شارەزا و کاك سەردار میران ئەم ئەرکە پیرۆزەیان بەجێ هێنا، وتم با جارێ لەم قۆناغەدا هەوڵی خۆم بخەمە پاڵ هەوڵی ئەوان و چاو بە تێکستەکەیانا بگێڕمەوە و لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی لامن بەراودی بکەم بەڵکوو بەمەکارەکەیان زیاتر بەرەو پوختی بەرم.

ئەو سەرچاوانەی ئێستا لە بەردەستی مندان ئەمانەن:

١. دەستنووسێکی خوالێخۆشبوو مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا.

٢. دەستنووسێکی -بە قسەی برای عەزیزم شێخ عەلی قەرەداغی- خوالێخۆشبوو مستەفا سائیب.

٣. فۆتۆی دەستنووسی «مەلا ڕەسووڵی توربەیی» و «حەمە ڕەش»ناوێك کە هەندێ شیعری حاجییشیان تیایە و شێخ عەلی قەرەداغی دایە لام.

٤. دوو سێ وردە بەیازی‌تر کە چەند پارچەیەك شیعری حاجییشیان تیایە.

٥. گۆڤاری «دیاری کوردستان»ی خوالێخۆشبوو ساڵح زەکی ساحێبقران کە چەند پارچە شیعری «حاجی»یشی تیا بڵاو کراوەتەوە.

٦. تێکستی ئەو وتارە ئەدەبییانەی لە ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا بڵاو کراونەتەوە و چەند پارچە شیعرێکی «حاجی»یشیان تیایە و خۆم لە ڕووی ڕۆژنامەکە نووسیومنەتەوە.

٧. سێ ژمارەی یەکەمی گۆڤاری «ڕۆژی کورد» کە کاك جەمال خەزنەدار بە ئۆفیست لە چاپی داونەتەوە و چەند پارچە شیعری «حاجی»یشیان تیایە.

٨. فۆتۆیەکی شەش لاپەڕەیی ژمارەی یەکەمی گۆڤاری «هەتاوی کورد» کە لە دوکتۆر ئیحسان فوئادم وەرگرت و پارچەیەکی نایابی شیعری حاجی تیایە.

ئەمە سەرەڕای ئەو سەرچاوە چاپانەی لای کاك کەریمیش هەن. لە بەراوردکردنی تێکستەکەی برایان کەریم شارەزا و سەردار میرانەوە لەگەڵ ئەم سەرچاوانە، گەیشتمە ئەوە کە پێویستە هەندێ وشەی تێکستەکەی ئەوان بە گوێرەی یەکێ یا زیاتر لە تێکستەکانی لای خۆم بگۆڕم و گەلێ بەیت و پارچە هەڵبەستیشم دیەوە کە لە تێکستەکەی ئەواندا نەبوون و خستمنە سەر دیوانەکە. لە هەلێکی لەمەو پاشیشدا بە درێژی ڕوونی ئەکەمەوە کە بۆچی وامکردو چۆن ئەو وشە بە پێی تێکستەکانی لای خۆم گۆڕراوانەم، لا ڕاستتر بوو[١]. ئێستە ئەوەی پێویست بێ بوترێ ئەوەیە: کاك کەریم شارەزایش ڕای لەگەڵمە و لای وایە ئەو گۆڕینانەی کردوومن ڕاست و پێویستن.

هەرچەند خۆم هێشتا زۆر شوێنی ئەم دیوانەم لا ئاڵۆزە و لاموایە بۆ مەبەستی ساغکردنەوەیەکی وردتری شیعرەکانی حاجی و لێکدانەوەیەکی تێر و تەسەلیان پێویستە بگەڕێین بە دوای تێکستی تردا، نەخوازەلا چاپەمەنییەکانی چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەی ئەستەمووڵ و ئەو دەستنووسانەی لە کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکانی ئەوێ و کوردستاندا دەسگیر ئەبن، لەگەڵ ئەوەشا ئەتوانم بڵێم بەم چاپە تازەیە بەشێکی زۆری شیعری بەردەست کەوتووی حاجی، بەڕاستی کەوتووەتە بەردەستی خوێندەواران و هیوادارم لە هەنگاوێکی تریشا، لەسەر دەستی هەر کەسێکیدا بێ، بەو ئاواتە پیرۆزەیش بگەین کە دیوانی حاجی بە تەواوی و بێ هیچ جۆرە هەڵەیەك بکەوێتە کتێبخانەی کوردییەوە.

**موحەممەدی مەلا کەریم**

---

١. [لەم چاپە تازەی بەردەستاندا هەموو گۆڕانکاری و بۆچوونەکانی موحەممەدی مەلا کەریممان هێناوە ئاماژەمان بە بۆچوونەکانی کردووە و لە نێوان دوو قولاپدا ([]) بە نێوی خۆیەوە دیاریمان کردوون].

# سەرچاوەکانی ئەم دیوانە

## سەرچاوە سەرەکییەکان:


١. مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغای حەوێزی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ٢٣٧ لاپەڕە.

٢. گیوی موکریانی «دیوانی حاجی قادری کۆیی»، چ٢ هەولێر ١٩٥٣، چ٣، هەولێر ١٩٦٩، ١٥٦ لاپەڕەیە.

٣. عەبدوڕڕەحمان سەعید «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی» بەغدا ١٩٢٥، ٥٩ لاپەڕەی ناوەنجییە.

٤. مەسعوود موحەممەد «حاجی قادری کۆیی»، ب١ بەغدا ١٩٧٣، و ب٢ بەغدا ١٩٧٤ و ب٣ بەغدا ١٩٧٦.


## سەرچاوەکانی دیکە


١. دوکتۆر کەمال فوئاد «کوردستان»، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (١٨٩٨ ـ ١٩٠٢) کۆکردنەوە و پێشەکی و چاپ کردنەوە.

٢. جەمال خەزنەدار «ڕۆژی کورد»، ١٩١٣ـ بڵاوکردنەوە و پێشەکی و لەسەر نووسین، بەغدا ١٩٨١.

٣. دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد «تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا»، بەغدا ١٩٧٨.

٤. ڕەفیق حیلمی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی» ب١ بەغدا ١٩٤١.

٥. عەلائەددین سەجادی «مێژووی ئەدەبی کوردی»، چ ١ بەغدا ١٩٥٢، چ٢ بەغدا ١٩٧١.
٦. موحەممەدی مەلا کەریم، «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد»، بەغدا ١٩٦٠.
٧. عەبدولمەجید نورەدین جەلیزادە «هەندێ لە شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی»، دەستنووس، ٤٥ لاپەڕەیە.
٨. کەریم شارەزا «کۆیە و شاعیرانی»، ب ١، بەغدا ١٩٦١.
٩. دوکتۆر ئیحسان فوئاد «بەرهەمی حاجی کۆیی و جێگەی لە ئەدەبی کوردیدا»، پوختەی نامەکەی دوکتۆرای بە زمانی ڕووسی، مۆسکۆ.
١٠. دوکتۆر کەمال فوئاد «دەستنووسی کوردی»، پێشەکی، باسی حاجی قادری کۆیی بە زمانی ئەڵمانی، فیزبادن ١٩٧٠.
١١. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، «دیوانی نالی» بەغدا ١٩٧٦ کۆڕی زانیاری کورد.
١٢. دوکتۆر مارف خەزنەدار «دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی»، بەغدا ١٩٧٧.
١٣. مەلا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە، نامیلکەیەکی لە بارەی ژیان و شیعری حاجی قادرەوە. بنواڕە پاشکۆی ژمارە «ج»ی (مەسعوود موحەممەد، حاجی قادری کۆیی، ب٢ بەغدا ١٩٧٤، لاپەڕەکانی ٣٢٩ تا ٣٣٤).
١٤. شێخ موحەممەدی خاڵ «پەندی پێشینان» چ٢ بەغدا ١٩٧١.
١٥. م.ب. ڕودنکۆ، «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی، مۆسکۆ ١٩٦٢.

## سەرچاوە عەرەبییەکان

١. الدكتور عزالدين مصطفى رسول «الواقعية في الأدب الكردي»، بيروت ١٩٦٦.
٢. يوسف ابگاروڤيچ اوربلى «جداول لتحويل السنوات الهجرية الى السنوات الميلادية» ترجمة، د. حسين قاسم العزيز ـ مجلة المورد ـ المجلد ٣، العدد ٤، بغداد ١٩٧٤.
٣. اشراف محمد شفيق غربال «الموسوعة العربية الميسرة» ط٢، القاهرة ١٩٧٢.
٤. قاموس «المنجد في اللغة و الاعلام»، ط ١٩ بيروت: ١٩٦٦.

## سەرچاوە فارسییەکان

١. «فرهنگ طلائی» الدکتور محمد التونجی، بیروت ١٩٦٩.

[٢. «کلّیات سعدی»، بەکوشش محمد علی فروغی].

## هەندێ سەرچاوەی تر

١. گۆڤاری هاوار ژمارە ٤ ساڵی ١ شام ١٩٣٢.

٢. گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ١و ٢و ٣ی ساڵی ٤ بەغدا.

٣. بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری‌نوێ ژمارە ١٢و ١٣ی بەغدا ١٩٧٤.

٤. گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە ٦ی ساڵی ١٩٨١ و ژمارە ٩ی ساڵی ١٩٨٢.

٥. گۆڤاری بەیان، ژمارەکانی ٥٣، و ٥٥ی ساڵی ١٩٧٩ و ژمارە ٦٦ی ساڵی ١٩٨٠ و ژمارە ٨٠ی ساڵی ١٩٨٢.

٦. گۆڤاری ڕۆژی کوردستانی ژمارە ١ی ساڵی ٢ بەغدا ١٩٧٢.

٧. گۆڤاری «کاروان»ی ژمارە ٧ی ساڵی ١٩٨٣ و ژمارە ١٠ی ساڵی ١٩٨٣.

٨. عەبدوڵڵا شاڵی و دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ و هاوکارەکانیان. زمانی ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی چ٨ بەغدا ١٩٨٢.

٩. جەلال مەحموود عەلی، «ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا». بەغدا ١٩٨٢.

